## لەم ژمارەیەدا




الاشراف الفني ص . ع

ڕۆشنبیری نوێ

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی مانگانەیە

دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

سەر نووسەر

مصلح مصطفى جەلالي

لایەن رژێمی گومڕای تارانەوە . . ئەوا ئەو ڕۆژە لە لای عیراقیەکاندا ڕۆژێك نەبوو وەك ڕۆژانی تر ، چ وەك مێژوو و چ وەك ناوەڕۆك . . بەڵکو ئەو ڕۆژە لە لای گەلی عیراقدا ، لەو ڕوداوانە بوو ، کە بووەو ئەبێتە مایەی نیشانەیەکی مەزن لە مێژووی جوولأنەوەی نیشتمانیدا . . ئەو ڕۆژە ، ڕۆژی ١٩٨٠/٩/٤ قۆناغێکی نوێ بوو ، لە پێناوی گۆڕینی هەموو موعادەلە وردەکانی واقیع ، بەرەو واقیعێکی ترو بۆ بەرژەوەندی گەلی عیراقو بگرە سەرجەمی گەلانی ئێرانیش ئەو ڕۆژانەش بەندبوو بە ڕۆژی کەڵە پیاوی مێژوو سەرۆك صدامو بەو سوپا دلێرەی کە (٦١) ساڵە درێژەی بە خەباتی ئەسرەوتی خۆی داوە ، لە دژی ئیمپریالیزم و دەستەو دەبەرەکانیو هەمیشە لە ریزی پێشەوەی گەلدا بووە شۆڕشەکانی ١٩٤١ - ١٩٥٨ - ١٩٦٨ و هەر وا بەشداربوونی شەرەفمەندانەی لە شەرەکانی فەلەستینو لە ساڵانی ١٩٤٨ - ١٩٦٧ - ١٩٧٣ لە دژی ڕژێمی دوژمن باشترین بەڵگەو نیشانەیەکن .

دەس بە جەنگ کرا . . سوپای دلێری صدام حسین و گەلی نەبەزی عیراق بەو پەڕی زاتەوە ، بەرەو رووی بانگی نیشتمانیو پەرستنی خاكو سەربەخۆییو سەربەرزی‌ی بوونەوەو لە نێوان شەش ڕۆژی یەکەمی جەنگدا ، نێروە شالأو بەرەکەی خومەینی تێکشکاندو شەش شاری ئێرانیشی خستە ژێر رکێفو بە درێژایی نزیکەی هەزار کیلۆمەتریش ، ڕووی‌کردە نێوقولأیی خاکی ئێرانەوەو کەوتە . دوای ئەو سوپا تێکشکاوەی کە بە پێنجەم هێزی سوپایی لە جیهانا دەنگی ئەبوو . . گەلی داستانی وەك داستانی موحەممەرەو خەفاجیەو سەربیل‌زەهاو بێستانەو گێلانی غەربو سۆماری . لە سەر لاپەڕە گەشەکانی قارەمانێتی شۆڕەسوارانی عیراق نەخشاند . . بەمەش ئەم سوپا دلێرە ، گەلێ ڕاستی تازەی خستە سەر زانستی عەسکەری‌یەوە . . لەوانەش : توانای مەعنەوی لە باری‌دا هەیە ، ئەرازوی هێزەکانی مەیدانی جەنگو دوور لە گشت جۆرە حیسابێکی چەكو ژمارە ، یەکلابکاتو بیگۆرێت .

لە هەمان کاتیشا عەقڵی داهێنەرانە گەلی نەبەزی عیراق . لە چەپەرەکانی تری جەنگا ، لە بواری ئابوریو سیاسیو ڕاگەیاندنو کۆمەلأیەتیشا کەوتە خۆو بوو بە پشتی قایمی بەرە هەلأیساوەکانی شەڕی ڕزگاری خوازی لە پێناوی پاراستنی سەرفرازیو گیانی سەرکەوتن . . لەو لاشەوە ، ڕۆژ دوای ڕۆژ کۆنە ماشینە سوپاییەکەی خومەینی . کە بە میرات لە حەمە رەزا شاوە بۆی مابوو . تێکشکاو بە تەواوی پەکی کەوت . .

لە پالێشیا ، ئەم جەنگە نارەوایەی ڕژێمی تاران لە دژی عیراق پێشکەوتوو ، بوو بە هۆی ئەوەی بە تەواوی گشت ناکۆکی‌یە متبوەکانی نێو ڕژێمی ئێرانی بتەقێنەوەو بە شێوەیەکی خوێناوی خۆی بنوێنێتو لە



هەمان کاتیشا هێزەکانی بەرهەڵستی نیشتمانپەروەرانەی ئێران بکەونە خۆو بە زمانی چەكو ئاگرو بە شێوەیەکی بەربلأو . بەرەنگاری ڕژێمی کۆنەخوازی قومو تاران ببنەوەو خەباتی چەکدارانەش هەموو گوندو شارێکی ئێران بتەنێتەوە . نەخوازەڵلا دوای ئەوەی سەرکردایەتی بزوتنەوەی چەکداری کورد لە کوردستانی ئێرانا . کە خاکێکی فراوانی ڕزگارکراوی لە بەردەستە . بوو بە هاوسوێندی ئەنجومەنی نیشتمانی‌ی هێزە بەرهەڵستەکانی ئێرانو دڵو ئامێزی بۆ کردەوە . . لە پاڵ ئەم بارودۆخە سوپاییو سیاسی‌یەوە باری ئابوریش لە ئێرانو لە ئەنجامی ئەو جەنگە نارەوایەوە . بە تەواوی ڕۆچوو و کەوتە پەلەفرتێی پاشەکشەیی . هەر لە سەرەتای جەنگەوە ناردنی نەوت بۆ دەرەوە پەکی کەوت . لە پالْیا گەلێ پیشەسازی گرنگ لە کارکەوتنو خاپووركران . . بە جۆرێ سەرجەمی ئەو زیانەی کە بەر ئابووری ئێرانی کەوتووە ، گەیشتۆتە (٣٠٠) ملیار دۆلار . . بەر لە چەند مانگێك بالیۆزی تاران لە کوێتا (علی ئەردەگانی) بە ڕۆژنامەنووسانی ڕاگەیاند : کە تەنیاو لە ئەنجامی خاپورکردنی دەزگاکانی نەوتی عەبادان . زیانەکەی گەیشتۆتە (١٨) ملیار دۆلار . . !

بەم شێوەیە . ئەو ڕژێمە گومان لێکراوە . ئێرانی گەیاندە ئەم ڕۆژە رەشو قۆناغە تالأنەو هەموو ئاواتو ئامانجی نیشتمانیو نەتەوایەتی گەلانی سەربەرزی ئێرانی خستە مەترسی‌یەوە . . تاوای لێهات خەڵك هەزار خۆزیا بە ڕۆژگاری حەمەرەزاشای نوکەر بخوازێت .

لە عیراقی ئێمەشدا . نە کاروانی ژیانو نە بنیادنانو نە داهێنان وەستاوەو نە جەنگیش لە باری‌دا هەیە تۆزقاڵێ چیە . کار لە مەعنەویاتی گەلی نەبەزو سوپای دلێرمان بکات .

• سلأو لە گشت ئەفسەرو سەربازە ئازاکانی سوپای سەرۆکی فەرماندە صدام حسین . لە بەرەکانی جەنگدا .

• نەمری‌ی بۆ جاویدانی پاکی شەهیدانی ڕێگەی ڕزگاری .

• مردنو ریسوا بوونیش . بۆ دوژمنانی مێژوو جولأنەوەی ئازادی بەخشی گەلانی ڕاچەنیو .

# عیراق ئەمڕۆمانو
# یادی دووساڵەی
# قادسیەی صدام

**فؤاد حسين أحمد**

پاش هاتنی پارتی شۆڕشگێڕ بۆ سەرحوکم لە عێراق خۆشەویستماندا گۆڕانو پێشکەوتنێکی شارستانیەتی بێ‌هاوتا روویدا . . گۆڕان لە وولاتێکی لاوازو دواکەوتوو سەر بە ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستان بۆ ولاتێکی بەهێزو پێشکەوتوو و سەربەخۆو ناودارو خاوەن شکۆ .

پێش شۆڕش وولات خەونی بە هێمنیو سەربەستیو سەربەخۆییەوە دەبینی ، دووبەرەکی نێوان نەتەوەکان ، دووبەرەکیی ئایینیو چینایەتی . . هەژاریو نەزانینو نەخوێندەواری . . ئەمانە تێکرا ببوون بە چەكو ئامرازی دوژمنان دژی گەلەکەمان . . بۆ ئەوەی هەتا هەتایە ئەم میللەتە لەژێردەستەییو لە نەخۆشیدا بمێنێتەوە . . خۆ ئەگەر باسی لایەنەکانی ئابوریو سامانی وولات بکەین ئەوا هەرگیز ناتوانین بەهیچ کلۆجێك بەراووردی لەگەڵ ئێستاماندا بکەین . . ئێستا زیاتر لە ٥٩ جار میزانیەی دەولەت زیاد بووە . .

وولاتێك ئەمە حالی بێت . . ئایا پایەی لەنێو دەولەتاندا چۆن دەبێت ! ! ئایا دەتوانێت دەنگی راستەقینەی خۆی بە میللەتانی تری جیهانی بگەیەنێت . . ! ! جا دوا رۆژی چۆن دەبێت ! !

کە شۆڕش هات . . بارودۆخی عێراق . . گۆڕا . . گۆڕانێکی بنچینەییو بەتایبەتی باری کۆمەلایەتیو ئابووریو رۆشنبیری ، هاتەکایەوە . . بەمە سەرکەوتنی گەورەو مەزنی وەدی هێنا . .

عێراق جێگایەکی دیاریکراوو خاوەن شکۆو پایەداریی بۆ رەخسێنرا . . تا لەم سالانەی دواییەیدا گەهیشتە لوتکەی بڵند . . زۆربەی هەرە زۆری میللەتانی جیهانی بەچاوێکی رێزو خۆشەویستیەوە سەیری دەکات . . دەتوانین ئەم قسەیەمان بەچەند خاڵێك بچەسپێنین ، واتە بەڵگەو نموونە زۆرن بۆ راستیی قسەکەمان :

١ – دەوری کاریگەری عیراق لە بزووتنەوەی دەولەتانی بێ‌لایەندا بەتایبەتی دەوری پیرۆزی سەرەك کۆمار صدام حسین لە کۆنگرەی شەشەمدا لە هاڤانا . . سەرەك کۆمار زیاتر لە ٦٠ جار کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرەك کۆماری ئەم وولاتانەدا کردووەو چاوی بە هەموو ئەو وەفدانە کەوت . . ئاشکراو روونی سیاسەتی گشتیی عێراق . . یارمەتی دانی عێراق بە ئەم دەولەتانە لە کاتو زرووفی تەنگانەیاندا . .



عێراق هەمیشە لایەنگری هەموو ئەو شۆڕشو بزوتنەوە سیاسیە نیشتمانیانە بووەو یاریدەی داونو دەنگی لە گەڵیاندا بووە . .

جا دەبینین چۆن دیسان لە شەرەکەماندا لەگەڵ رژێمی خومەینیدا دەبینین چۆن نارەزایی خۆیان دەربڕنو ئێران تاوانبار دەکەنو یارمەتیان ئەدەن .

٢ – هەڵبژاردنی عێراق بۆ سەرکردایەتیی دەورەی سیو شەشی کۆمەڵەی گشتیی وولاتانی یەکگرتوو . . هەندێ لە وولاتان وەکو رژێمی ئێرانو قەوارەی زایۆنیزم هەوڵیاندا ئەمە نەیەتە دی . . بەلام . . هەروەك بینیمان لە هەڵبژاردندا عێراق سەرکەوتو ئەم دوژمنانەش روویان رەش بوو . . ئەمە هەر ئەوە ئەگەیەنی تا چ رادەیەك عێراقی شۆڕشگێڕ ناوی دەرکردووەو چۆن رێزی لێ ئەگیرێ ، ئەگینا بە سەدەها لەدەولەتان هەولی ئەوە ئەدەن خۆیان سەرکردەی ئەم کۆمەڵەیە بکەنو بەمە وولاتەکانیان ناو دەربکەنو دیبلۆماسیەتیان بەهێز بێت و پەیوەندییشیان لەگەڵ دەولەتاندا زیاترو چاکتر دەبێت .

٣ – گشت وولاتانی جیهانی نارەزایی خۆیان بەرانبەر بە هێرشە دوژمنکاریەکەی زایۆنیزم بۆ سەر مەفاعیلی ئەتۆمی عیراقیدا دەربری . . هەر بەم بۆنەوە بروسکەی خۆشەویستیو دڵنەوایان بۆ عێراقو سەرەك کۆمار صدام حسین نارد . . دیسان ئایا ئەمە پایەی بەرزی عێراق دەرناخات .

٤ – پشتگیریی گشتیی لە لایەن دەولەتانی عەرەبو دەولەتانی تری جیهانی بۆ بانگەوازی نەتەوایەتی کە سەرەك کۆمار صدام حسین لە هەشتی شوباتی ١٩٨٠ دا بلاوی کردەوە .

٥ – بەشدار بوونی زیاتر لە نیوەی دەولەتانی جیهانی لەپیشانگای نێو دەولەتان لە بەغدا .

ئەمەش تێکرا پەیوەندیی بەتینو بەهێزی عێراق بەتایبەتی لەلایەنەکانی ئابووریو پیشەسازیدا دەردەخات ئەم خالانە بەشێوەیەکی گشتیو بەکورتی بوون . . کە بارودۆخی عێراق ئێستامان پیشان



ئەدات ، بە تایبەتی لەلایەن دەرەوەو وولآتانی تری جیهانیدا . . عەمامە بەسەرەکانی تاران و دروزنەکانی قوم و ئەو فێڵبازانەی کە لەرێگای ئاینەوە خەڵکی دەخەڵەتێنن بە تایبەتی خومەینی ی تەڵەکەباز . . باش ئەم راستیە دەزانن . . بەڵام نایانەوێ دان بەراستیدا بنێن . . چونکە هەر لەسەرەتادا خۆیان بەدوژمنی میللەتی عێراق دەزانن و بە چاوێکی تەماعەوە سەیری خاک و زەویەکەی دەکەن .

عێراق لەماوەی چوارده ساڵەی شۆڕشە مەزنەکەیدا توانی پەیوەندێکی بەهێز لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتاندا ببەستێت و دەنگیان بۆ لای خۆی رابکێشێت و هەمیشە دەستیان لە نێو دەستی عێراقدا بێت . . و لە رۆژی تەنگانەشدا لایەنگری عێراق بن . . و دروّ و دەلەسەی دوژمنانیش ئاشکرا بکەن . . ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ عێراق هیچ دوژمنێکی نی یەو گشت وولآتانی جیهان دۆستی یەو هاورێ یەتی یە نەء . . هەرگیز ئێمە دوژمنی خۆمان دەناسین و مێژووش ناوی ئەوانەی بە چاوچنۆکی سەیری خاک و نیشتمانمان دەکەن تۆمار کردووەو لە نێوان هەر قوناخ و سات نەساتێکدا هێرشی نارەوایان بەسەر وولآتەکەماندا کردووە و پاش ماوەیەک بەسەر شۆڕی و نائومێدی کشانەتەوەو هیچیان بە هیچ نەکردووە . . هەروەک ئێستا بەچاوی خۆمان دەبینین چۆن ماوەی دوو ساڵە رژێمی ئێران چۆن هەوڵیان دا بۆ داگیرکردنی خاکی پیرۆزمان ماوەی دوو ساڵە چەنگاوەرەکانی عێراق ئەوەیان سەلماند کەوا هیچ هێزێك تر ناشێت لە خاکی پیرۆزی عێراقدا نزیك ببێتەوە .

لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا رژێمی ئێران سەدەها جار هەوڵی ئەوەی داوە خاکی عێراق داگیر بکات و خۆی لە شارەکانماندا نزیك بکاتەوە . . بۆ ئەوەی ئەگەر بە درۆش بێ بڵێ سەرکەتنم وەدی هێناوە .

بەڵام بۆمان دەرکەوت و گشت دەوڵەتانی جیهانی ئەم راستیە دەزانن . رژێمی ئێران لە یەکەم رۆژی دەست پێ کردنی شەرەکەیدا هیچ سەر کەوتنێکی وەدی نەهێناوە عێراق توانی زیاتر لە پێنج شاری گەورە لە شارەکانیان داگیربکات و دەسەڵاتی خۆی لەنێو جەرگەی خاکیاندا بسەپێنی و زیانێکی ئێجگار زۆری پێ بگەیەنێت . عێراق شۆڕش لەم ماوەیەدا بەئەوپەری بروابەخۆو بە مەعنەویاتی بەرزەوە شەری کردووەو هیچ وەخت ماوەی ئەوەی نەداوە زەفەری لێ بسێنرێت دیسان هەمیشە بە ئەوپەری دڵپاکی و هەست بە لێپرسراویەوە لەگەڵ لیژنە ئاشتی خوازەکاندا بووەو یارمەتی ئەوانی داوە بۆ ئەوەی بتوانن کۆتایی بەم شەرە بهێنن . . بۆ .

بەمە سەرکردایەتی شۆڕش توانی بۆ زۆربەی هەرە زۆری جیهانی ئەوە بسەلمێنێ کە هیچ دوژمنایەتیەکی لەگەڵ ئێراندا نی یەو بە چاوێکی تەماعەوە سەیری خاکی ئێران ناکات و هەرگیز نیازی ئەوەی نی یە دەست بخاتە نێو کاروباری ناوەوەی ئێراندا . .

بەڵام رژێمی ئێرانی لەسەروی هەموویانەوە خومەینی ی تەڵەکەباز نایانەوێ ئەم شەرە راوەستێت . . چونکە خۆیان بەرپایان کردووەو نیازی خراپیان هەیەو بەم شەرە درێژە بە مانەوەی خۆیان دەدەن . دەڵێن هەرچەند لەم ماوەیەدا عێراق خەریك کراو دوژمنی زایۆنی دەستی درێژی خۆی بۆ لوبنان گەیاندو ئەو هێرشە نارەوایەی بەسەر خاکی لوبناندا کرد . بەڵام شەرەکە گەلێ راستی ی چەسپاند لەوانە :

یەکەم : سوپای عێراق ئەوەی چەسپاند هیچ دوژمنێك هەر چەند گەورەبێت یان خاوەن دەسەڵات بێت ناتوانێت خۆی لە خاکی عێراقدا نزیك بکاتەوە و هێرش بباتە سەری . . ئەگەر هەوڵی ئەوەشی دا ئەوا هەروەك رژێمی ئێران لێ دڵی و روو رەشی دەبێت .

دووەم : عێراق نەك تەنها توانای ئەوەی هەیە خاکی خۆی بپارێزێت . . بەڵکو توانای ئەوەشی هەیە خاکی دەوڵەتانی عەرەبیش بپارێزێت .

سێیەم : دۆست و نادۆستی لێك جیاکرانەوەو ئاشکرا بوون . . کێ دوستەو کێ دۆست نی یە .

چوارەم : زۆربەی هەرە زۆری وولآتانی جیهانی لایەنگری عێراق بوون و یارمەتی ی ئەدەن جگە لە دوژمنی زایونیزم .

پێنجەم : توانای بەهێزی و سەرکردەیی و سەرکردەی شۆڕشی و لە سەروی هەموویانەوە صدام حسین دەرکەوت . . کە توانای ئەوەی هەیە عێراق لە هەموو هێرشێکی نارەوا بپارێزێت و بە سوپای دلێری عێراق و خاکی عێراق بپارێزێت .

بە بۆنەی تێپەر بوونی دوو ساڵ بەسەر قادسیەی صدام دا . . پیرۆزبایێکی گەرم لە سوپاو گەلی عێراق و سەرکردەی شۆڕشەکەمان و لە سەرووی هەموویانەوە کاك صدام حسین دەکەین . . چونکە عێراق سوپاو گەل و سەرکردەیەکی ئاوای هەیە هەمیشە سەربەرزەو هەرگیز ترسی لەسەر نی یە .

# ئەوانەی دوژمنیان لە رۆژهەلاتی بەسرەدا تێکشکاند دەتوانن لە بەرەکانی تریشدا تێکی بشکێنن .

لەم رۆژانەدا دوو ساڵی رەبەق بەسەر ئەو شەرەی کە تاقە حوکمرانەکەی ئێران بەسەر عیراقدا سەپاندی ، تێدەپەرێ ، و بە تێپەربوونی ئەم دوو ساڵە وە جارێکی تر توانای شەرکردنو بەرگری‌کردنی رۆڵەکانی عیراق لە خاكو نیشتمانەکەیان دەردەکەوێ‌و لە هەمان کاتیشدا خەونە چڵکنەکانی دوژمن گۆربەگۆردەبێ .

حوکمرانانی ئێران کاتێك ئەم شەرەیان دژی عیراق بەرپا کرد ، دەیانویست خاکی پیرۆزی عیراق بگرنو بیخەنە پاڵ وولاتەکەی خۆیان ، وە هەرچەندە ئەم ئامانجە پووچەڵەیان بۆ جێ‌بەجێ نەکراو بە درێژایی دوو ساڵ گەورەترین زیانی گیانیو مادی‌یان لێ‌کەوت ، کەچی هەر دەسبەرداری ئەم ئامانجە گلاوەیان نەبوونو ، لە راستیشدا ئەم دەستە حوکمرانەی تاران ، کە ئێمە ، خۆیانو خەونە چەپەڵەکانیان لە خەڵکی تر باشتر ، دەناسینەوە ، هەروەها بەئاسانی دەسبەرداری ئەم تەماعکاری‌یەیان نابنەوە .

ئەم تاوانبارانەی بەرامبەر بە میللەتانیانو بەرامبەر بە مرۆڤایەتی هیچ گوێ بەو زەرەرو زیانە گیانی‌یەی لێ‌یان‌دەکەوێت نادەنو ، ئەوپەری ئامادەن بۆئەوەی هەموو ئێران بکەن بە کوچی قوربانی خەونو خووە چەپەڵەکانیان .

ئەو نەزانانە تاکو ئێستا وانەکانی مێژوو فێر نەبوونو واتاکانی بەرگری‌کردنی دلێرانە لە خاكو نیشتمان کە عیراقی‌یەکان بەوپەری لێهاتوویی‌یەوەو بە درێژایی دوو ساڵی رابووردوو پیشانیان دا ، نەدرکاندووە .

هەروەها ئەم چاو چنۆکانە نازانن کە چاخی ئیمپراتۆرییەتی چوو گۆربەگۆر بوو ، و مەسەلەی دامەزراندنی ئیمپراتۆرێتی خومەینی خەونێکی جادووگەرە گەورەکەیە .

وە بەرامبەر بەو هەڵوێستە نامرۆڤایەتی‌یەی دوژمن عیراق هیچ رێگایەکی بۆ نیە تەنها بەردەوام‌بوون لە جەنگی رەوامانو بەرگری‌کردن لە خاكو نیشتمانو ، لێدانی دامەزراوو شوێنە گرنگەکانی ئێران ، تاوەکو دوژمن لە خەونە پروپووچەکانی بەئاگا بهێنینەوە .

سەرۆکی فەرماندە لە ووتارە بەنرخەکەی ئەم دوایی‌یە‌ی‌دا فەرمووی کە ئێمە لەپێشوودا لە لێدانی زۆر لە جێگاو شوێنی گرنگی ناو ئێرانو لەوانە هەندێ لە دامەزراوە نەوتی‌یەکانی دەستپارێزیمان دەکرد ، ئەمەش بەو هیوایەی کە کاتێك ئاشتی جێ‌بەجێ دەبێت ، هەڵێك لە بەردەم ئێرانی‌یەکاندا مابێتەوە بتوانن بەهۆیەوە رێگای ژیانێکی راستەقینە هەڵبژێرنو بگرنەبەر . بەڵام ئەگەر رژێمی ئێران سووربوو لەسەر ئەو هەڵوێستە نامرۆڤایەتی‌یەی ئەوا هەموو بنکەو دامەزراوە گرنگەکانی دەبنە جێ‌ی دەست‌وەشاندنی هێزە ئاسمانی‌یەکانمان زیاتر لەو بنکەو دامەزراوانەی لە گۆرەپانی جەنگ‌دان .

وە لەم بارەیەوە دورگەی «خارك»و دامەزراوە نەوتی‌یەکانیو ئەو نەوت گوێزەرەوانەی کە تیایدا وەستاونو یان نەوتی لێوە دەگوێزنەوە ، دەبنە جێگای دەست‌وەشاندنی هێزی ئاسمانی عیراق .

لەپاش ئەم هەرەشەدانەی سەرۆکی فەرماندە بە دوو رۆژ فرۆکەکانی هێزی ئاسمانی لە رۆژی «١٩٨٢/٨/١٧» هەڵسان بە سوورانەوە لە ناوچەی نزیك‌بوونەوەی نەوت گوێزەرەوەکان لە دورگەی «خارك»ەوە بەبێ هیچ دەست وەشاندنێك . وە قسەکەرێکی سەر بە هێزی ئاسمانی رایگەیاند کە ئێمە لەمەدا مەبەستمان ئاگادارکردنەوە بووە نەك بۆردومانکردنی ئەو کەشتی‌یانە . ئەمەش وەکو هەوڵدانێك بۆ بەجێ‌هێنانی ئەو ئاگادارکردنەی سەرۆکایەتی گشتی‌ی هێزە چەکدارەکانمان بۆ ئەو کۆمپانیاو دەوڵەتانەی کە نەوەك نەوت گوێزەرەوەکانیان بە کاری نەوت گوێزانەوە لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندا راسپێرن .

وە لە رۆژی ئاینده «١٩٨٢/٨/١٨»دا دامەزراوە نەوتی‌یەکانی دورگەی «خارك» لە لایەن هێزی ئاسمانی عیراقەوە بۆردومان کرا وە قسەکەرێکی سوپایی رایگەیاند کە ئەمەش هەوڵدانێکی ترە لەلایەن ئێمەوە بۆ ئاگادارکردنی حکومەتی تاران کە دەست لە تۆپ‌باران کردنی شارەکانی بەسرەو خانەقینو مەندەلی‌و دامەزراوە گشتی‌یەکانیان هەڵگرێ .

هەروەها قسەکەرەکە ووتی ، لە کاتی بەجێ‌هێنانی ئەم کارەدا لە لێدانی ئەو نەوت گوێزەرەوانەی کە هەندێکیان لە بەندەرەکەدا بوونو هەندێکی تریشیان رووەو بەندەری نەوت بارکردنی دورگەکە دەبوونەوە دەستپارێزیمان کرد . وە بەمەش ویستمان کە دوا هەل بەو نەوت



گێڕەرانە بدەین کە دەشێ تا ئەو کاتە فرمانی تایبەتییان لە کۆمپانیا یان حکومەتەکانیانەوە لەبارەی هەڕەشەکەی عیراقەوە پێ نەگەیشتێ .

هەڕەشەکەی عیراق‌و بۆردومان‌کردنی دورگەی «خارك» کارێکی زۆریان کردە سەر ناردنە دەرەوەی نەوتی ئێرانی . لەم بارەیەوە چەند دەوڵەتێك کۆمپانیاو کەشتی‌یەکانی خۆیانیان ئاگادارکردەوە لەو مەترسی‌یەی تووشی‌دەبن ئەگەر هاتوو نزیکی ئەو ناوچەو جێگایانە ببنەوە کە عیراق بە ناوچەی کاری سوپایی‌ی داناوەو وولاَتانی لەو بارەیەوە ئاگادارکردووە .

وە لەم جێگایانە دورگەی «خارك»ە کە بەندەری نەوتی ئێرانی ی‌یە . ئاژانسی دەنگوباسی فەرەنسا رایگەیاند کە بیروڕایەکی وا باوە هەمەودوا زۆربەی زۆری خاوەن کەشتی‌یەکان دوودڵی لە ناردنی کەشتی‌یەکانیان بەرەو دوورگەی خارك بنوێنن .

هەروەها ئەو وولاَتانە دەستیان بە گەڕان لەدووی سەرچاوەیەکی تری نەوت لە جیاتی نەوتی ئێران کرد ، وە شارەزایانی نەوت لەم بارەیەوە ووتیان کە وەستانی ناردنە دەرەوەی نەوتی ئێرانی کارێکی ئەوتۆی لەسەر بازاری نەوتی جیهانی نیە .

بەرەنجام وا چاوەڕوان دەکرێ کە ناردراوی ئێران لە نەوت کەم‌ببێتەوە ئەگەر هاتوو بەیەکجاری نەوەستێ . . ئەمەش هەمووی بەهۆی هەڵویستە لاسارەکەی رژێمی تارانەوە .

لە لایەکی تریشەوە ئەو قسانەی کە فەریق روکنی یەکەم عدنان خیرالله جێگری سەرۆکی گشتی‌ی هێزە چەکدارەکان وەزیری بەرگری ، لەبارەی ئەو هێرشە نوێ‌یەی کە گوایە هێزەکانی ئێران بیکەنە سەر خاکی عیراق کردنی ، ئەوپەڕی باوەڕێکی بەرز بەخۆو وریایی‌و ئاگاداریی هێزەکانمان لە جموجولی دوژمن تیادا بەدی دەکرا .

جێگری سەرۆکی گشتی ، ووتی دوژمن دەربارەی بەگژاچوونی کەرتێکی تر لە کەرتەکانی بەرەی جەنگ ، خەریکی ووتووێژە ، وە بەپێ‌ی ئەو دەنگوباسەی پێمان گەیشتووە - کەرتی ناوەڕاستی بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژاردووە ، بەلاَم تاکو ئێستا مقۆمقۆی ئەوەیەتی کە ئەمە کەرتێکی سەرەکی یان ناوندی بێ بۆ سنوور پەڕینەوە .

ئەم وتووێژانەش لە سەر ئەساسی ئەو بڕوایەیە کە ئامادەبوونی ئێمە لە کەرتی خواروودا گەیشتۆتە پلەیەکی بەرزو ئەوان لەم کەرتەدا لەمەو پێش شکاونەتەوە ، بۆیە نایێ هەمان رێژەوی چەوت دووبارەبکەنەوە .

هەروەها بەڕێز جێگری سەرۆکی گشتی دووپاتی‌کردەوە کە ئەو توانا پۆلاَیینەی لە رۆژەلاَتی بەسرەدا هیزەکانمان نواندیان‌و دوژمنی تێك شکاند ، لە هەر کەرتێکی تریش‌دا ئەوان بیانەوێ بە هەمان شێوە رووبەڕوویان دەبێتەوەو هێزە شەڕ خوازەکانیان دەشکێنێتەوە .

**«کاروان»**

## سەنگەرەکـــەی دوژمن

هیشتا شەو نەهاتبو ، بەلام زۆر تاریك بو تاریکیەکەیش باڵی بەسەر ئەو شوینە پوشیبو کە ئیمە تیدا بوین ، تاریکیەکە لە هەوری رەشتالە تاریك تر بوو ئەتووت هیـــە چەند مەلەو یاڵۆ شاخی گەرن کەشیش دەوروپشتمانی گرتبو .

لەو کاتەدا چاوم هەڵبری تەماشای هەورە کەم ئەکرد زۆر بە وردی تەماشام دەکرد ئەتوت لە سەر شاخەکە پاڵیّ داوەتەوە . لەو کاتەدا لە ناو خەیاڵدا مەست بوم ئایا ئەم هەورە لە ئاسمانەو یان لە زەویەو زۆر تر نزیکە . . . بەلام ئەگەر تەماشای سەر شاخەکەت بکردایە ئەت‌ووت لە زەویەوە نزیك ترە .

لە ناو ئەم خەیاڵە بیّ‌بنەدا بووم لە دەنگی توپ باران بە ئاگاهاتم . لە تەنشتمەوە هاوریکانم چاوەروانیان دەکرد . . وەکو بازی مەشق پیّ کراو چاویان بە هەمو لایەکەوە ئەگێرا دەسە هەر وەکو بازیش ئازابوون . فەرماندەکەمان رای سپاردبوین کە سەنگەریکی دوژمن لە ناو بەرین . . ئەو سەنگەرەیش لە ریگاکەمان بوو . . ئەتووت سمڵی شەرە لە ناو بردنی پیّ ویست‌بو .

پێش ئەوەی برۆین فەرماندەکەمان وریای کردینەوەو وتی : سەنگەرەکە لە پشت ئەو شاخەیە بەلام زۆر وریابن . . ئاگاتان لە خوتان بێت . . تەماشای بەرپیّی خوتان کەن نەوەکو دوژمنان تەقەمەنیان لە ریگەتانا دانابیّ .

شەوداهات کوردواتەنی شەویش قەلاّی مەردانە زۆرمان نەمابوو لە سەنگەرەکەی دوژمن نزیك بینەوە . . خومان خستە سەر زك وبە هێمنی نزیك بوینەو وتا دەنگی سەربازەکانی دوژمن ئەهاتە گویمان ئنجا بوینە دوو بەشەوە هەر بەشیکمان لە لایکەوە رومان کردە سەنگەرەکەی دوژمن تا قریان تیّ خەین . . بو بەگو لە باران ئەتووت ئاسمان ئاگریّ گرتوە .

دوژمن وای لێك نەدابووەوە کە ئێمە هیرشیان بۆ ئەبەین . . ئەم هەمو کوشتارەیان لیّ ئەکەین . . ئیمە کە پینج کەس بوین وامان لە دوژمن کرد (کە ژمارەیان نزیکەی ٤٠ کەس بوو) .

بی. نالە ناڵیان لیّ بەرزبوەوە نەیان ئەزانی چی بکەنر بو کویّ

---

## — باری سەرنج —

— مولود —

لەو بیروباوەرە سەرەکی‌یانەی کە شۆرشی ١٧ — ٣٠ ی تەمووز ، هەر لە رۆژی سەرهەڵدانیەوە ، پاراستویەتی‌و لە سەری سورە ، ئەوەیە کە : شتێك ناڵێت کە توانای راپەراندنی نەبێت . . لە کارو فەرمان نادویّ کە نەیکات . . ئاگادارکردنەوەو هەرەشە ناکات ، گەر توانای جی‌بەجی‌کردنی نەبێت . . لە کردەوە لە وتن دوورەو نەیش وتن لە کردەوە دادەبریّ .

ئەم بیرو باوەرانەش ، هەر وەك چۆن لە بارو دۆخی هێمانەیەتی‌و کاتی ئاشتی‌دا ، ئاواش لە کاتی تەنگانەو شەرو شۆردا .

ماوەی ئەم دوو ساڵەی جەنگ ، زۆر باری رای بە خۆیەوە بینی کە ئەم بیروباوەرانە دەردەبرن . عیراق ، شەش رۆژ دوای جەنگ ، هەڵوێستە روون‌و ئاشکراکەی راگەیاند کەوا بە هیچ جۆرێك چاوی لە خاکی ئێراندا نیەو ئاشتی‌خوازە .

پاشە رۆژی ئەم قسەیەش ئەم بیروباوەرو پەیرەوەی دووپات کردەوە .

لە پاشان ، رژێمی خومەینی ، هەمیشە ئەوەی دەکوتایەوە گوایە عیراق قەت ناکشێتەوە ، کەچی بریاری ئازایانەی سەرکردایەتی لە ٢٠ی حوزەیرانی ئەم ساڵ‌دا ، هەمان هەڵویست‌و پەیرەوی عیراق بە کردەوە دووپات‌کردەوە لەو کاتەی کە سەرکردایەتی بریاری کشانەوەی سوپامانی دا لە گشت خاکی ئێران .

لە هەمان رێچکەشەوە . ئاگادارکردنەوەو هەرەشەی عیراق هات ، کە تیایدا داوامان لە رژێمی خومەینی کرد ، گەر لە شارەکانمان بدات‌و خۆی لە دەزگاکانی ئابووریمان نزیك بکاتەوە . ئەوە عیراق ، وەبە هەموو هێزەوە . لە گشت دەزگا ئابووری‌یەکانی رژێم دەدات‌و . . لە سەرانسەری ئێران تێك‌و پێکیان دەدات .

ئەوە بوو . ئێران . هەروەکو جارانی پێشووی ، بە زیاتر لێدانی شارەکانی عیراق . وەلاّمی دایەوە .

ئەمەش وای لە عیراق کرد ، کە هەرەشەکەی راپەرێنێت‌و دەست بە لێدانی دەزگاکانی نەوت بکات لە دوورگەی «خارك» و زیانێکی

ـ ـكەن شوینێك نەبو خویانی تیدا بشارنەوە دەنگی گولەی ئێمە ـ ـریقەی ئەهات بەلام سەنگەری دوژمن بە تەواوەتی کپ بوو . ئیمەش ـکشاینە دواوەوە تا گەیشتینە بەرزاییك لە لم دروست کرابوو . لەوێ ـ ـوەستاین چاوەروانی هاوریکانمان دەکرد .

چاوم بە ریگاکەو بو دەستم لەسەر چەکەکەم دانابو . بۆ هەموو ـرِوداوێکی لەناکاو وریا بوم . بەهاورێکەم ووت ئەبێ لە شوینی خوماندا هیچ جمو جولێك نەکەین . هاورێکەم ووتی مەبەستت جی‌یە ؟ لەوەلامدا ووتم : لەبەر ئەوە لە شوینی خوماندا بین بەوریای چومان بە ریگاکەو بێت نەوەکو دوژمن لە قولێکی‌کەوە بۆمان بێن . ـوئەگەر هاتو هاوریکانمان لەم ریگایەوە بێن بیان ناسین . وە ئەگەر هاتوو ئەوان ئیمەیان بینی بمان ناسن . وەئەگەریش دوژمن بێت خو ئەوە ـشتر شوێنەکەمان قایمەو ئەتوانین لە ناویان بدەین . هێندە شوینەکەمان چاك بوو . . دەرەقەتی ژمارەیەکی گەلێ لە خۆمان زیاتر ئەهاتین . . ـەخوا لەبەر زۆری‌و کەمی ژمارەیش نی‌یە کە لە هەقیان دێن . . لەبەر ئەوەیە ئێمە هێزی خێر خوازین لەسەر رەواین بەلاّم دوژمنان لە خۆیان زیاتر بیر لە هیچ ناکەنەوە بەیانەوی هەر رەکەزەکەی خۆیان بێت لەو کاتەدا ووتم : ئای‌رەگەز پەرستینە دەی کاریکتان پێ بکەین با بە دەواری شری نەکردبێ .

لەو کاتەدا تارمایی چەند کەسێك دیار بو بەرە بەرە لێمان نزیك بووەوە . تەماشامان کرد هاورێکانی خومانن . . یەکێك لەهاوریکانمان بریندارە . . بەلاّم ئەوان دوو برینداریان هەلێ گرتبو برینەکەیان خەتەر نەبو کە مەترسیان لیێ بکریت . . بەهاوکاری هەلمان گرتن تا گەیشتینە شوینێکی هێمنی .

بریندارەکانمان دانا تەماشای سەنگەرەکەی دوژمنمان دەکرد هیشتا دوکەلّی لیێ بەرز ئەبوەوە . . بەرەو هێزکەی خومان کەوتینە رێ .

پاش ئەوەی بریندارەکان تیمارکران . . براینە بروابکەن وەکو بریندارەکەی خۆمان بریندارە دیلەکەش تیمار کرا .

لەو کاتەدا کە هێشتا ماندوبونمان دەرنەچو بو چوین بۆ لای فەرماندەکەمان بۆ ئەوەی کارێکی ترمان پی‌بسپێری . . بەلام پی‌ی‌وتن ئێوە جاریێ ماندوون نورەی چەند برایەکی‌ترە . . بەلام قسەی خومان بێ من تۆزێك لە فەرماندەکەمان زویر بووم چونکە دەم و دەس کاریکی تری پیێ نەسپاردین بەس هێندەی وت : ئافەرین .

باوکی گولالە

---

زۆری پیێ بگەیەنیێو . عیراق هەرەشەی خوی بکاتەوە بەوەی گەر رژێمی ئێران لە لێدانو بۆردومانکردنی شارەکانمان بەردەوام بێ . ئەوە بەندەرەکە تێك‌و پێك دەدات .

ئەم بارو پەیرەوەش ، هەمان بیروباوەرِو هەلس‌وکەوت‌و هەلۆێستمان دەردەبرِن‌و دووپات دەکەنەوە .

هەرەشەکەی عیراق ، حالەتێکی نوێ‌یە . . چونکی جەنگ لە نێوان دوو وولاّت‌دا هەلگیرساوەو لە گۆری‌یە . هیچ پێویست بە هەرەشەکردن‌و ئاگادارکردنەوە ناکات . بەلاّم عیراق ، لە بیروباوەرِو تێروانینی بەرپرسیاری‌یەوە بۆ جەنگ ، رێگایەکی تری هەلبژارد . رێگای ئاگادارکردنەوە ، کە گشت مانای بەرپرسیاریتی‌و زیرەکانە هەلدەگرێت .

لەم رووەوە ، دەتوانین دەست‌نیشانی ئەم چەند شتانەی خوارەوە بکەین .

ئەم هەرەشەی عیراق ، مناوەرەیەکی سیاسی نیە ، بەلکو پەیرەوێکە لە بیروباوەرە نەگۆراوەکانمان ، چونکە رووی هەرە قوولی لێپرسینەوە دەردەبرێت ، بەوەی کە دەرفەتێکی تر بە رژێمی ئێران بدرێت کە جارێکی دیکەش هەلۆێستەکانی بەسەربکاتەوەو بە کاروکردەوەکانی خۆیدا بگەرێتەوە . . وە بۆ ئەوەی دەرفەتێکی تریش بۆ گەلانی ئێران برەخسینی تا باشتر بزانن کیێ بەرپرسیاری ئەم جەنگەو بەردەوام بوون‌و فراوان‌کردنیە .

هەرەشەکەی عیراق ، بەکارهێنانی زیرەکانەی هێزی عسکری دەردەبرێت لە شوێن‌و کات لە باری‌دا ، وە بە رێگایەکی بەکارترو کاریگەرتر .

ئەم ئاگادارکردنەوەیە ، لەگەلێ هەلۆێست‌و ئارەزووی راستگۆیی عیراق سەبارەت بە شەرراگرتن یەك دەگرێتەوە . عیراق نایەوێ وا لە وێنەدا دەربکەوێ کەوا ئەو ، بارودۆخێکی زێدەتر بۆ جەنگ دەخولقێنیێ .

ئەم هەرەشەیەی عیراق ، زۆر پێویست بوو بۆ ئەوەی مانای کردەوە بگەیەنیێ بۆ هەر ئاگادارکردنەوەو هەرەشەیێکی تری ئایندەدا

## ڕاپۆرتێك لەبارەی :

# میهرەجانی هونەری‌و ڕۆشنبیری کوردی لە هەولێر

## ● دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی میهرەجانێکی هونەری‌و ڕۆشنبیری گەورەی لە هەولێر سازکرد

## ● کتێب‌و شیعرو هونەرو ئاواز لە پێناوی سەرکەوتن لە جەنگدا

**دەزگاکەمان لە مانگی تەمووز ، مانگی شۆڕش ، لە ماوەی (١٢ – ١٨) ی مانگ لە شاری هەولێری دێرین‌دا ، مەلبەندی ناوچەی کوردستان گەورەترین‌و گرنگترین‌و فراوانترین چالاکی‌ی هونەری و ڕۆشنبیری‌و کوردی گێڕا . . لەم میهرەجانەدا سەدەها ڕۆشنبیری کورد بەشداری کردو بەرهەمی پەسندکراو و بایەخداریان پیشان‌دەو بەوپەڕی ئازادی‌و شادیەوە چالاکی‌ی هونەری‌و ڕۆشنبیری خۆیان خستە بەردەم کۆمەلانی خەلك .**

دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی بە سازکردنی ئەم میهرەجانە هونەری‌و ڕۆشنبیری‌یە خزمەتێکی گەورەی بۆ جوولانەوەی ڕۆشنبیری کورد پێشکەش‌کرد ، بە کۆکردنەوەی شاعیرو ڕۆشنبیران‌و هونەرمەندانی ناوچەی کوردستان ، بە پیشاندانی بەرهەمەکانیان جارێکی تر گیانی هونەری و ڕۆشنبیری بۆ پێشەوە بردو گوروگوڕمێکی نوێی بە جوولانەوەی ڕۆشنبیری کوردی‌دا . ، کە ئومێدەوارین گرنگی‌ی ئەم میهرەجانە ببێتە بەردی بناغە بۆ میهرەجانەکانی سالانی ئاینده ، تا هونەرمەندان‌و ڕۆشنبیرانی کورد چالاکی‌ی بێ‌وێنەی خۆیان بنوێنن‌و پێشکەشی کۆمەلانی خەلکی بکەن‌و ببێتە نموونەیەکی بێ هاوتا بۆ پێشکەوتنی نیشتمان‌و خزمەت‌کردنی گەلی عیراق .

پیشاندانی پیشانگای کتێبی کوردی ، پیشانگای هونەری تەشکیلی کوردی ، ئاهەنگی گۆرانی‌و مۆسیقاو شیعر خوێندنەوە لەلایەن زۆربەی شاعیرانی کوردەوە ، جارێکی تر گرنگی‌و بایەخی بە میهرەجانەکە دا و باشترو قوولتر دل‌و دەروونی کۆمەلی خەلکی هێنایە هەژان‌و گیانی هونەری‌و ڕۆشنبیری کوردی . . دەمەزەرد دەکردەوەو خستی‌یە پلەو قۆناغێکی نوێ‌وە .

### پیشانگای (١٣٤) سالەی کتێبی کوردی

لە سەعات دەی ڕۆژی (١٢)ی تەمووزدا ، بە کردنەوەی پیشانگای چاپکراوی کوردی لە هۆلی ڕۆشنبیری جەماوەر لە شاری هەولێری مەلبەندی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان ، میهرەجانی هونەری‌و ڕۆشنبیری کوردی دەستی‌پی‌کرد .

بەرێز مامۆستا محمد امین محمد ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ئۆتۆنۆمی‌ی ناوچەی کوردستان پیشانگاکەی کردەوەو ژمارەیەك لە ئەمیندارە بەرێزەکان‌و جێگرەکانیان و بەرێز مامۆستا مصلح جەلالی بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌و ئەدیب‌و ڕۆشنبیران‌و سەرەك‌و لێپرسراوانی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان لە ناوچەکەدا لە ئاهەنگی کردنەوەی پیشانگاکەدا ئامادەبوون و بەشداریان تیا کرد .

لەم پیشانگایەدا ، کە دەزگاکەمان بۆ پێکهێنانی ، کۆششێکی بێ‌وێنەی کردبوو ، زیاتر لە هەزار چاپکراوی هەمەجۆرەی : مێژوویی و زانستی‌و ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری گشتی کوردی تیا پێشان‌دا لە یەکەم کتێبی چاپکراوی کوردی‌یەوە کە دیوانی مەولانا خالیدەو سالی (١٨٤٨) چاپکراوە تا دوا کتێبی کوردی کە ئەمسال (١٩٨٢) چاپکراوە ، ئەمەش بە یەکەم پیشانگا دەژمێررێ کە بەو جۆرەو لەسەر شێوازێکی ڕێکوپێك سازکراوە کە مێژووی تەمەنی (١٣٤) سالەی کتێبی کوردی ئەخاتە ڕوو بەردەم خوێندەواران .

ئەوەی شایانی باسە بەشێك لە پیشانگاکە تەرخان‌کرابوو بۆ پیشاندانی ڕۆژنامەی کوردی لە تەمەنی (٨٤) سالەیدا ، کە کاتی خۆی ئەمسال لە ڕۆژی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردیدا دەزگاکەمان دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا







پیشانگایەکی بۆ ئەم مەبەستە کردەوە .
بەڕاستی ئەم ڕۆژە بە ڕۆژێکی گرنگ دادەنرێ لە مێژووی ڕۆشنبیرانو هونەرمەندانی کورددا ، کە دەستە دەستە خوێندەوارانو ڕۆشنبیران بە گیانێکی دڵسوزی دۆستانە بەرەو پیشانگاکە ئەهاتن ، وە گوێیان بۆ قسەی وێژەری بەڕێز شل ئەکرد ، وە بە چوی نرخزانی یەوە ئەیانڕوانیە کتێبە بەنرخەکانی کوردی . ئیتر هەموو لایەك حۆزگەیان ئەوەبوو هەندێ لەو کتێبانەیان دەستبکەوێ تا بیخەنە کتێبخانە تایبەتی یەکانیانەوە یان بۆ یادگار دووبارە سەودایان لەگەڵ بکەن . هەروەها ئاواتە خوازی ئەوەبوون هەموو ساڵێك پیشانگایەکی ئاوهاو لەمەش باشتر بکرێتەوە ، تا چاویان هەمیشە بە کتێبخانەی کوردی ڕوون بێتەوە .

## پیشانگای خنجیلانەی هونەری تەشکیلی کوردی

هەر لە بارگەی ئەم جارەی میهرەجاندا کەژاوەی هونەرمەندانی نیگارکێش لە کوردستاندا (بابەتو نیگارو ڕەنگو بۆیە) بوو بە میوانی ئەم شارە ئازیزەی کە قەلاً دێرینەکەی بۆتە پێشوازیچییەکی هەمیشە دڵ فراوان . . دەستو پەنجەی پیرۆزی ئەم هونەرمەندانە بوو بە عەشق پڕ لە ئەڤینی خەجو سیامەندو مەمو زینو محمدو سێویو ئینجا مەهابادی چاوگەش لەسەر لاپەڕەکانی بەڵگەنامەی پیشانگای تەشکیلی کوردی ئەم ناوانەمان بەرچاو کەوت :-

١ - کوێستان جمال علی - لە سلێمانی



٢ – حسين عبدالله طه – له هەولێر
٣ – فيصل عثمان – له هەولێر
٤ – دلڤين حسن شەنگاری – له هەولێر
٥ – سەردار مصطفى سنجاوی – له هەولێر
٦ – فارس سعدی – له هەولێر
٧ – اديب فايق احمد له سلێمانی
٨ – علی كريم أمين – له سلێمانی
٩ – فائق نوری – له سلێمانی
١٠ – محمد رسول – له سلێمانی
١١ – عدنان حسين ردێن له دهۆك
١٢ – نەهرۆ محمود شوقی – له سلێمانی
١٣ – جەلال رۆوف محمد له فلورنسای ئیتاليا
١٤ – حكمت هندی – له سلێمانی .
١٥ – ناصر توفيق – له سلێمانی
١٦ – ئازا حسيب قەرەداغی – له سلێمانی
١٧ – اسماعيل محمد عزام له دهۆك
١٨ – لقمان ميرزا رشيد له سلێمانی
١٩ – حمه سعيد باپير له سلێمانی
٢٠ – فەرهاد حمه امين له سلێمانی
٢١ – دارا محمد – له هەولێر
٢٢ – عثمان قادر احمد – له سلێمانی
٢٣ – گوهدار صلاح – له دهوك

بچكۆلەترين هونەرمەند لەو پیشانگايە «كوێستان جمال» بوو ، بەلام لەگەڵ ئەو تەمەنەشيا توانيبووی توانای خۆی بخاتە كارو لەم پیشانگا گەورەيەی هونەرمەندانی كوردا بەشداری بكات .

به تێكرايی تابلۆكان شوێنيان جێ هێشت لە دەروونی ئەم خەڵكەوە چەپڵەی ئافەرين بۆ ئەم هونەرمەندە ئێسك سوكانە لێدراو ماچی خۆشەويستی يانەيان بۆ ئاراستەكران

شايانی باسە لەم پیشانگايەی هونەری تەشكيلیدا (٥٦) تابلۆی هەمەجۆر خرايە بەرچاوی تەماشاكەران و هونەردۆستان ، كە جێگای رەزامەندی يان بوو .

پیشانگای هونەری تەشكيلی چوار رۆژ بەكراوەيی مايەوە ، زۆر له كۆمەڵانی خەڵكی بەشداری بينينيان كرد . داواخوازين كە هەموو ساڵێ بەلای كەمەوە جارێ پیشانگايەكی باشترو ناياب لەمە بگيرێ .

## كۆڕی شيعر

ئێوارانێك لەو گەرمەی هاوينەو رێكەوتی ١٩٨٢/٧/١٦ چەپكێك هۆنراوەو كۆمەڵێك لە شاعيرە لاوو ناسراوەكانی كورد خزانە ناو سينگ و بەرۆكی دەزگيرانی شيعر لە هەولێردا لەو شارەی كە دڵداری شاعيرو صافی و سەدايی هەيبەت سوڵتان و باواجی و حاجی قادر لێ ی دەچريكاند :–

هەر لەگەڵ دەنگدانەوەی ئەواندا ، شاعيرە دڵ ناسكەكانی ئەمرۆمان لە بەردەمی ميكرۆفۆندا ، شيعريان ووت باسی ئەڤين و عەشق وولاتيان كرد . . هەروەكو بەبالای جەنگی رەواو قادسييەی صدام يان هەڵ گوت :

**محمد صالح ديلان و مەدهۆش و حسيب قەرەداغی و عبدالله عباس و صلاح شوان و ناظم دلبەندو سكڤان عبدالحكيم و عثمان شەيداو فريا جاف و ئەژی گۆران و حسن عەوالانی و مكرم رشيد تاڵەبانی و دكتور شۆو رۆستەم باجەلان و غەريب رؤوف و حمه علی ووريا و خالد حسين دۆسكی و عدنان يونس بێ و حكمت محمد سعيدو جميل حاجی كريم و رمضان عيسی و شكری سليمان و شكری اسماعيل و شێخ محمدی باڵەك و محمد عبدالله احمدو نجيب صالح محمد وسەربەست زەندی و سيد جلال بەرزنجی** . . ئەمانە بوون چەپڵەی خەڵكی ناو هۆڵەكەيان دەقۆستەوەو ماچی گەرميان بەم رۆژگارە دەبەخشی .

بەراستی كۆڕی شيعرو شاعيران ئەوەندە گەرم بوو هەر له باس كردن نايە ، هەر شاعيرێك كە شيعرێكی



دەخوێندەوە سەرتاپا دانیشتوانی هۆڵ بە چەپڵە ڕێزان وەرامیان دەدایەوە بەتایبەتی کە ناوی گەلی کوردو کوردستانی خۆشەویست ئەهات . .

جاربەجاریش دوکتور شۆ بە شیعرە جوانە ڕەنگینەکانی . . دڵو دەروونی دانیشتوانی ئەهەژاندو ئاگری چەپڵەی خۆش ئەکردو . . تێکرا قرمەی چەپڵەو ئافەرین و هاوارکردن بۆ دووبارەکردنەوەی . لە هۆڵی دانیشتنەکەدا دەنگی ئەدایەوە . ئیتر شاعیرەکانی کورد هەرچی لە تواناباندا هەبوو کردیان ، وە زادەی بیریان بە شانازییەوە پێشکەش بە دانیشتوان کرد ، کە ئومێدەوارین هەمیشە لە شیعر ووتن و بەرهەمدان نەکەون و جولانەوەی ڕۆشنبیری کورد بەرەو پێش بەرن .

ئەوەی شایانی باسە نزیکەی (٣٥) شاعیری ناودار بەشداریان لەم میهرەجانەدا کرد . . هەندێکیان لەبەر هۆی تایبەتی و نەخۆشی وەکو مامۆستا صالح دیلان و شیخ حسیب قەرەداغی نەیانتوانی ئامادەبن بەلام بەرهەمی شیعری خۆیان ناردبوو . ئیتر هەرچۆنێ بێ شاعیرانی کورد بە بەرهەمی بایەخ داریانەوە بە گەرمی بەشداری خویان لەم میهرەجانەدا نواند و بە ئامادەبوونیان بازاڕی شیعری کوردییان گەرم کرد .

## گۆرانی و مۆسیقای کوردی . .

هەر لە کەلی ئامێدی و دهۆکی ڕەنگین و وولاتی پاشای گەورەی ڕەواندوزو شارە خنجیلانەی حاجی قادری کۆیی و هەولێری خاوەن ڕابوردووی پیرۆز ، هونەرمەندانی دەنگ خۆش و مۆسیقاژەن ئەم هەوارەیان ڕازاندبووە . سەدای لۆرکێ و ئایشۆکێ وئەلەرزەو دەنگ و ئاوازی «تەنیا عارەب عوسمان و جەلال سەعیدو ڤیان و سوزان» ببون بە پارچەیەك زەناو دەرژانە ناو گوڵشەنی ئەو ڕۆژە پاکەی کە ئەمانەی بە دیداری خۆشەویستی یەکتر شادکردبوو . . .

دڵشادی هونەرمەند پەنجەی ببوو بە پەرستگایەك هەموو کەمانەکان کڕنۆشیان بۆ دەبرد . هەتاوی نەورۆز بوو تالی قژی کەمانچەکەی و سەربردەو تەویی مەم و زین و عەشق پڕ لە زراقی خەجی بۆ سیامەندی دەگێڕایەوە .

کوره کوری کۆیەو ڕەواندوزی هەر خۆیان بۆ خۆیان دروستکەری ئەم ڕەشبەلەکە کوردەوارییانە بوون . کە تێکەڵ بە پێکەنین و خەنین و چۆراوگەی کانیاوەکانی جوندەیان و هۆمەر قوچانێ دەبوونەوە . .

شەوگارێك بوو کە دەیکردە ڕۆژی ١٧-٩٨٢١٨ . ئەم تیپانە پەیتا پەیتا چاوەگەشەکانیان لە دونیای پڕ لە عەشقی گۆرانی و مۆسیقای کوردی هەڵدەهێنا . . .

### ● تیپی مۆسیقاو گۆرانی «خانزاد»ی سەر بە یەکێتی گشتی ئافرەتانی عیراق لقی هەولێر .

١ - سرودی تەموز ئاوازو دابەش کردنی جان تۆماس گوتنی سۆزان و ڤیان بە یارمەتی کۆرس .

٢ کچە کوردی جەنگاوەر . ئاوازو دابەش کردنی جان تۆماس . گوتنی ڤیان فایق .

٣ - لورکێ شیعرو ئاوازی فۆلکلۆر . دابەش کردنی جان تۆماس . گوتنی کۆرس .

### ● تیپی باواجی کۆیە

١ باوەمیری - کورس

٢ - گەشتێك - صلاح محمد

٣ - چنارۆك - کۆرس . شیعرو ئاوازی فۆلکلور . ئامادەکردنی زاهید محمد

### ● تیپی پاشای گەورە لە ڕەواندوز

١ دەلالێ - کۆرس

٢ - لێ دێنی - کۆرس

٣ - مەندانە - احمد محمد شریف

٤ ئەمانە دەردم چارەکە احمد محمد شریف

٥ – بەدارێم وەکەن – کۆرس
ئەم گۆرانی‌یە بەچێژانە هەمووی لە ئـامـادەکـردنو دابـەش‌کـردنی هونەرمەندی لێ‌هاتوومان زرار محمد مصطفی بوو . . .
بۆ رۆژی دووەم تیپی (خانزاد)ی کچان . .
ئایشۆکێ دەلالێ – ڤیان فایق
٢ – ئەلەرزە – ڤیان فایق
٣ – خانەمیری – سۆزان فایق – شیعرو ئاوازی فولکلوری دابەش‌کردنی وورِیا أحمد .
٤ – پەشیمانی – سۆزان وڤیان فایق – شیعری گۆران ئامادەو دابەش‌کردنو ئاوازی وورِیا أحمد
● لە وولاتی گۆرانو أحمد مختار جافو تایەر بەگ . . . لە هەڵەبجەی سلێمانی شارە پیرۆزەکەی خوێنو بەفرو عەشق دەنگی زایەلەی قەتاری جافانو خورەی کانیاوەکانی «بەمۆ» بە دیداری خۆشەویستانەی «سەفین»ی خوێن شیرین شادبووەو سەربردەو مێژووی عەشقبازانەی «وەلی دیوانە»ی بۆ رەعیەتی ئەم هەوارە دەگێرایەوە ، تاوێکی خۆشنودی رەنگی ئەم گۆرانی‌یە هەورامی‌یانە ئەو ناوەی هێنایە هەژێنو لەپای تیپێکی میللی . . محمد عەبدولی هونەرمەند بە دەنگە پر لە سۆزەکەیەوە گەشتەکەی هەورامانی «گۆران»ی نەمری دەگێرایەوە تا درەنگی شەو ، دەنگی باڵەبانێو سازو سەنتوری کوردەواری‌یانە . ئەچرپایە گوێو دانیشتوانیش لەگەڵیا دەتوانەوەو هەڵدەپەرین . . .

● **تیپی هونەری هەولێر**
١ – ئەگەر رۆژێ نەتبینم – تەنیا عارەب عوسمان .
٢ – ئەگەر تۆ نەڵێ – جەلال سعید
٣ – ئەرێ هۆ لەیلێ – نیزام سعید
شیعرو ئاوازی فولکلوری – ئامادەکردنی وورِیا احمد

● **تیپی مۆسیقای دهۆك**
١ – گەیێن گەرا جەنگا
شیعری محسن قوچان – ئاوازو دابەش‌کردنی دڵشاد محمد سعید – گوتنی کۆرس .
٢ – لێلێ وەسۆ
شیعرو ئاوازی فۆلکلوری ئامادەو دابەش‌کردنی دڵشاد محمد سعید – گوتنی مونا صبری .
٣ – پارچە مۆسیقای «کۆچەر» ئاوازو دابەش‌کردنی دڵشاد محمد سعید – شیعرو ئاوازی فۆلکلوری .
٤ – نێرگز
ئامادەو دابەش‌کردنی دڵشاد محمد سعید – گوتنی نەجات عبدالمسیح
٥ – گۆلوکێ – شیعرو ئاوازی فۆلکلوری – ئامادەو دابەش‌کردنی دڵشاد محمد سعید – گوتنی مونا صەبری .
● دابەش‌کردنی ژمارەی زور لە کتێبی کوردی . . لە نێو گەرێ ئەو چالاکی‌یانەدا ، دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی (٧٠٠٠) دانەی لە ووتەکانی سەرۆکی فەرماندە هەڤاڵ «صدام حسین»ی دابەش‌کردە سەر رۆشنبیرانو جەماوەرانی بەشداربوو ، سەرەرای دابەش‌کردنی (٥٠٠) دانە لە ژمارەی تازەی هەردوو گۆڤاری «بەیانو رۆشنبیری نوێ»و کتێبی «عەمەرێ جەلالی» .
● کارتی بانگ‌کردن بۆ هەموو ئەدیبو رۆشنبیران لە کوردستانو لە بەغدا ناردرابوو لە لایەن دەزگای ناوبراوەوە ، مامۆستاو ئەدیبە ناسراوەکان ، لە یەکەم رۆژی میهرەجانەکەوە بەوپەری خۆشحاڵی‌یەوە بەشداریان کرد .
شایانی باسە (٩) نۆ تیپی مۆسیقاو گۆرانی کوردی بەشدارییان لەم میهرەجانەدا کردووەو دوو شەوی رەبەق ئەم تیپانە لەگەڵ هونەرمەندو هونەر دۆستانی کورد . . . بە گۆرانیو هەڵپەرکێ . . مۆسیقاو پێکەنین . . هاوکاریو دڵشادی . خۆشیان کرد .

## رێزگرتنی هونەرمەندو رۆشنبیرانی میهرەجانەکە

لە دوا رۆژی میهرەجانەکەدا ، چەند ئاهەنگێکی خنجیلانە سازکرا ، بۆ بەخشینی دیاریو پاداشتی لێژنەی ل بالای سەرپەرشتی میهرەجانەکە بەو رۆشنبیرو هونەرمەندو تیپانەی بەشداریان کردبوو .
لەو ئاهەنگانەدا بەرێز مامۆستا مصلح مصطفی جەلالی بەرێوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی سەرەکی لێژنەی بالای میهرەجانەکە لەوتەکانیا سوپاسو رێزی پیشاندا بەرامبەر بە دەنگەوەهاتنی دڵسۆزانەی ئەو رۆشنبیرو هونەرمەندانە کە دەورێکی پیرۆزیان گێرا لە سەرکەوتنی میهرەجانەکەداو ئەوەی دووپاتکردەوە کە ئەم بەدەنگە هاتنەیان شادمانی کردینو هانمان دەدات کە لەمەودوا هەنگاوی بەکارتر بنێین لە نواندنی چالاکی تری فراوانی بەم جۆرەی کە دەبنە هۆی پێشکەوتنی









.وتنەوەی رۆشنبیریو هونەری
گەنەکەمان دیسان مامۆستا جەلالی
ئەوەی روونکردەوە کە لە سایەی
.بەخدانی سەرکردایەتی حزبو
شۆرشداو ئەو گۆرانکاریانەی لە
ولاتەکەمان بە رابەری سەرکی
فەرماندە صدام حسین روودەدەن
دەسۆیەکی فراوان لەبەردەم ئێستاو
پاشەرۆژی رۆشنبیریو هونەری
گەلەکەماندا کراوەتەوە کە ئێوە دەتوانن
سوودی بەراستی لێ ببینن لەسەر
رێگای بەهێزکردنی یەکێتی نیشتیمانیمان .
لەو ئاهەنگانەدا ، دیاری بەنرخ
پێشکەش بە تێکرای ئەو رۆشنبیرو
هونەرمەندو تیپانە کرا کە بەشداری
میهرەجانەکەیان کردبوو ، ئەم لا لێ
کردنەوە بەلرخەش جێگای
رەزامەندیو سوپاسی هەموو لایەك
بوو ، ئەدیبو رۆشنبیرو
هونەرمەندەکان ، ئەوەیان
دووپاتکردەوە کە هەمیشە ئامادەن
بەشداری چالاکییەکانی دەزگای
رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی
بکەنو لەو رێگایەوە بەشداری . لە
خزمەتی رۆشنبیری گەلی کوردو عیراقدا
بەر فراوانتر بکەن . . . .

**لە بروسکەیەکدا بۆ سەرەکی فەرماندە**

رۆشنبیرو هونەرمەندانی
گەلی کورد دەستی رێز لە بەتەنگەوە
هاتنی سەرکردایەتی شۆرش
دەنێن بەرامبەر گەلی کوردمان .

رۆشنبیرو هونەرمەندانی ناوچەی
کوردستانی ئۆتۆنۆمی دەستی رێزیان
ناوە لەو بریارانەی ئەنجومەنی
سەرکردایەتی شۆرش کە دەبنە هۆی

پەرەپێدانی ناوچەکەو بەگوڕکردنی کاروانی شۆڕش‌و یەکگرتنی زیاتری جەماوەر .

لەو بروسکەیەدا کە لە کۆتایی میهرەجانی هونەری‌و رۆشنبیری کوردیدا ئاراستەی سەرەکی فەرماندە صدام حسین‌یان کردوە ئەوەیان دووپات‌کردۆتەوە کە ووشەی کوردی هەمیشە دڵسۆزی بیروباوەری شۆڕش دەبێت‌و بەرگری لە دەستکەوتە گەورەکانی دەکات .

**ئەمەش دەقی بروسکەکەیە :**

بە ناوی رۆشنبیرو هونەرمەندو شاعیرە کوردەکانەوە لە ناوچەی کوردستان کە لە هۆڵی رۆشنبیری جەماوەر لە هەولێر لە چوارچێوەی میهرەجانی هونەری‌و رۆشنبیری کوردیدا کۆبونەوەو دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری‌و راگەیاندن سازی کردوە سڵاو لە پاڵەوانی سوپای ئازامان‌و خوراگرتنی گەلی پاڵەوانمان دەکەین لەژێر ئاڵای شەکاوەکاندا بۆ پشێل کردنی دوژمنی ناپەسەند لە تاقەکەی خومەینی تاوانبارو بۆ بەرگری لە خاکی ئازیزی عیراق .

سەرەکی بەرێز: ووشەی کوردی دڵسۆز هەمیشە بەرگری‌کار دەبێ لە دەستکەوتەکانی کاروانی گەلی سەرکەوتومان‌و یەکێتی نیشتمانی عیراق‌و دەربری ویژدانی نیشتمانی کورد دەبێ‌و چەك دەبێ بەرووی چاوبرسیەتی بێگانەو پیلانەکانی هێزە شەرخوازەکان کە دژی یەکێتی گەلی عیراق‌و شورش مەزنەکەی‌و سەرکردایەتی مەزنتان سازی دەکەن .

سڵاوو رێزمان بۆ هەڵویستە مرۆڤایەتیە پیرۆزەکانتان‌و بریارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ پەرەپێدانی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان بێگومانین رەوتی کاروانی شۆڕش ١٧ – ٣٠ تەموزی پیرۆزو یەکگرتنی رۆڵەکانی گەلەکەمان بۆ بیناکاری عیراق مەزن پتەودەکات .

سڵاوو رێز لە گیانی شەهیدان کە بە خوێنی گەشیان قوربانیان دا بۆ بەرگری لە عیراق لە قادسیەی دووەم‌و شۆرشە رابەرەکەیدا .

**مصلح مصطفی جەلالی**
**سەرەکی لیژنەی باڵای میهرەجان .**

ئیتر بەم جۆرە حەفتەیەکی رازاوەی هونەری‌و رۆشنبیری‌ی کوردیمان لە مەڵبەندی کوردستان بەسەربرد کە لەناو روونـاکـبیران‌و خـوێنـدەوارانی گەلەکەماندا دەنگی‌دایەوەو رێزی لی‌گیرا ، هەروەها لە دەزگاکانی راگەیاندنی دەوڵەتیدا شوێنی شیاوی بۆ تەرخان‌کرا ، دووبارە هونەرو ئەدەبی کوردی دەوری رەسەنی خۆیان نواند لە پتەوکردنی گیانی برایەتی‌و یەکێتی‌ی نیشتمانیدا لە نیشتمانی عیراق خۆشەویستدا .

**«روشنبیری نوێ»**





# لەگەڵ دەنگسازی کوردی دا

مسعود محمد

لە ژمارەی ~~٩٨~~ ی ساڵی (١٩٨٢)ی (رۆشنبیری نوێ)دا برای بەهاتوو و دڵسۆزی زمانی کوردی د.ئاورەحمانی حاجی مارف بەگوتار لەژێر سەرەناوی (پێداچوونەوە . . .)دا چەند رەخنەیەکی لە هەندێ بیروڕای من دەربارەی یەك دوو باریکەرێی سەر بە فۆنەتیك‌و رێنووس کە لە شەقامەرێی زمانی کوردی دەکەنەوە گرتبوو هێندێکی دیکەشی بەپێی بەڵێنی خۆی هێشتبۆوە بۆ گوتارێکی دیکەی. بەر لەوەی چاوەچاوی گوتارەکەی دیکەی بم وام بە پەسەند زانی هەر لە ئێستاوە. دەست بەرم بۆ شی‌کردنەوەو گرفت رەواندنەوەی ئەو خاڵانەی کە نووسەری بەرێز بەلای قەناعەتی خۆیدا شکاندبوونیەوە چونکە دەشێ ئەو سەر سووکییەو دەست‌و قەڵەم رەهایی‌یەی ئێستا کە لە خۆمی‌دا شك دەبەم لە ماوەدا ونی بکەم‌و لایەنی خۆ روون کردنەوەو بیروڕا دەربڕینم لێ وەتەنگ بێت ئەوەی راستیش بێ چەندێکی بڵێی بە دەست ئەم نووسینەمەوە ناراحەتم چونکە مخابنە دووکەسی هێندەی د. ئاورەحمان‌و من لەیەکدی نزیك روو بەرووی یەکدی بن لەو باسانەدا کە دەبوو بە گفتوگۆو لەیەکدی حاڵی بوون تێیاندا بگەنە رایەك کە هەردوو لا لیێ رازی بن وەیا هەر نەبێ پەراوێزی جودایی بیروڕا لە نێوانیاندا تا رادەی لوان‌و ئیمکان وێك بێتەوە. رەنگە هۆی ئەو لێك ترازانەمام ئەوە بێ کە د.ئاورەحمان خوێندنی زمانی لەسەر دەستی پرۆفیسۆر و بەپێی بەرنامەو هەل‌ومەرجی سەلمێندراوەوە تەواو کردبێ منیش لەرێگەی لێکدانەوەیەکی خود بەسەرەوە بێ رابەر بەرەو ناو توێژەکانی زمانێکەوە چووبێتم کە هەر بەقەدەر دەنگ دانەوەی وشەو دەستەواژەو رستەکانی لە هۆش‌و دەروونمدا سەرەدەری لە دەستوورەکانی بکەم کە لەوێدا د.ئاورەحمانیش وەك من خاوەن پشکە هەرچەند دەشێ دەستووری دەق گرتووی ناو بەرنامە رووپێوێکی ئەو پشکە لە مرۆڤ گل‌دەنەوە بۆ بڕیارە یەکجارەکیانی خۆی وەیا، لە بارێکی‌دیکەدا، بەشێکی ئەو هەلانەی کە گەشتی بێ‌رابەر بە مرۆڤی وەکو منی دەکات بەرۆشنایی‌ئەو دەستوورانە ساغ بکرێتەوە.

لە پێشەکیەکانی گوتارەکەدا یەك دوو خاڵی سەرەتایی فۆنەتیکی سەر بە رێنووس لەوەوە نەختێك بە هەڵەبەر حیساب دەکرێن کە هاتوون بینینی من وەیا غەیری منیان لە بەڵگەکانی دابڕیوەو بە سەهووی رووتیان لەقەڵەم داوە وەك کە لەستوونی یەکەمی لاپەرە(١٢) دەخوێنیتەوە (. . . . .، چونکە ئاشکرایە (ن)ی چاوگی هیچ کاتێك دەنگی کۆنستانتی ناکەوێتە پێشەوە و رواڵەتی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێ عەرەبی‌و نەبوونی وێنەی (أ) تێیدا، بوەتە هۆی ئەوەی هەندێ لە نووسەران هەڵەی تێدا بکەن). ئەم نیشان دانە وەها رادەنوێنێ کە ئەوانەی قورس کردنی دەنگی پێش نوونی چاوگ بە بزوێن دانانێن هەستی پێ ناکەن هەر لەبەرئەوەی کە لە رێنووسی کوردیدا نیگار بۆ ئەم قورس کردنە دانەندراوە. بەڵام خواو راستان، لە دواتردا بۆمنی تێ دەهێنێتەوە کە دەڵێ (. . هەرچی مامۆستا مەسعوودە بە قورس کردنی دادەنێ).

من لە نووسینی لێرە بەپێشەوەمدا بەولای نوونی چاوگەوە بۆ ڕاستییەکی گەلێك ونتر لە نوونی چاوگ ، کە زۆر بەرچاوە ، ڕۆیشتووم کە لە لێکدانەوەو سەرنج ڕاگرتندا دیاردەیەکی دیکەی (چاوگی) م دۆزیەوە لەوەدا کە دیتم ئەو دوو کۆنسنانتەی (د ،ت)دەکەونە بەرایی نوونی چاووگ ، ئەوانیش بە فەرمانی فۆنەتیکی زمانی کوردی چەند کۆنسنانتێکی دیار کراو دەهێننە پێش خویان . هەرچی (د)ە یا دەنگی (ن) یا دەنگی (ڕ) پێش خۆی دەبەخێت وەك : (برژاندن ، چاندن ، کردن ، مردن . . .) لەوە بەولاوە هیچ کۆنسنانتێکی دیکە قبوڵ ناکات . دەنگی (ت) ش هەر بە حوکمی سروشتی دەنگەکان (س ، ش ، ر ، ف ، — ،و) لەپێشەوەی دێن . . هۆی دیاردەکەش دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی ئەو گونجانو نەگونجانەی دەنگەکانی کوردی کە چەند جارێك باسم کردووە ساغم کردۆتەوە کە گونجانی (ن ،د–ر ،د) لەوانەیە ڕێ نادات قورس کردن بخرێتە سەر دوو دەنگی (ن ،ڕ) لە بەرایی (د) ، ڕێش نادا قورسایی بخرێتە سەر (س ،ش ،ڕ)لە بەرایی (ت)دا هەرچی دەنگی (ف) کەمتر لەوان گونجاوە بەڵام ئەویش لە دەنگەکانی دیکە پتر حەز بە (ت) دەکات ، واشدەزانم کە بەشێکی کورد ئەم دەنگەی لە بەرایی (ت)ی چاوگدا گۆڕیوە بە (د) هەر لەبەر پتر گونجانی (د)ە کەیە لەگەڵ (ت)دا . نموونەکانی خوارەوە قسەکان ڕوون دەکەنەوە :

بەستن ، ڕستن
کوشتن ،مشتن
گرتن ،
کەفتن ،خەفتن (کەوتن ، خەوتن) . .

بەڵام دەبێ بڵێین دەنگی (ن) یش لەگەڵ (ت)دا گونجاوە کەچی لە پێش (ت)ی چاوگەوە نایەت . کاتی خۆی بۆ ئەوە چووبووم کەوا ڕەنگە زێدە گونجانی (ن) لەگەڵ (د)دا وەهای کردبێ بەتەواوی بۆخۆی بدزێتەوە .

ئەم ڕایەش لە دوو ڕووەوە پتر خۆی لە قەناعەت نزیك دەکاتەوە .

یەکیان ئەوەیە کە گونجانی (ن) و (د) وەهای کردوە لەسلەانی منگەو (غنە)یەك لە نێوانیاندا پەیدا بێ کە (د)ە کە بکات بە (گ) و بگوترێ (دەربەنگ ،مەنگ ،ئەفەنگی . .)

دووەمیان ئەوەیە بەشێکی ئاخێوەری دەورو بەری مەرگەو باشووری ڕانیە هەموو (د)ە کانی پێش نوونی چاوگ دەکەن بە (ت) و دەڵێن (کرتن ، مرتن ، برتن –لەبری کردن ، مردن ، بردن) کەچی (د)ی پاش (ن) وەك خۆی دەهێڵنەوەو دەڵێن (چاندن ، ستاندن . . .)

تا ساڵی (١٩٥٧)یش ئەم دیاردەیە هی نەدیتن نەبوو ، لەوە بەولاوە بەهۆی پەیدا بوونی گۆمی بناوانی (دوکان) و ژێر ئاوبوونی بەشێکی زۆری ئاوایی ئەو ناوچەیە خەڵقەکە بڵاوەیان لێکردو لە نیشتەجێ بوونی دواتردا تێکەڵ بە ئاخێوەری جۆر جۆری زارەکانی کوردی بوون ، منیش لەو ساڵەوە پێوەندی هاتوچۆم بەو ناوەوە کەم بۆوە کە ئیتر نەتوانم گوێبیستی ئاخاوتنیان بم ، بایی ئەوەی بیروڕای لێ هەڵێنجرێ . . .

دواتریش گوتارەکە لە بەرەو کۆتایی ستوونی سێیەمی لاپەرە (١٣) و ستوونی یەکەمو دوەمی لاپەرە (١٤)دا کە نەختێك دەوری (دەنگ ، پیت ، فۆنیم) هەڵدێت یارمەتی ئەو خوێندەوارانە دەدات کە بەتەواوی لە باسی فۆنۆلۆجی و ڕێنووس نابەڵەدن بەڵام کە دەڵێ (فۆنیم . . . بە تەنیا خوی خاوەنی ماناو واتا نییە) لێرەدا ڕوون کردنەوەیەك هەڵدەگرێ :

فۆنیم ، دەنگی لغوی – ئەلفوێ ، لە ناوتوێژی وشەدا بە تەنها واتا نابەخشێت وەك ئەوەی سێ دەنگی (د ،ا ،ر)لە وشەی (دار)دا هیچیان خۆی لەخۆی دا واتای نییە بەڵام کە بڕیارمان دا دەنگی (م) وەیا (ت) وەیا (ی) فۆنیمە چارمان ناچارە دەبێ بڵێین لە (برات)دا ئەم (ت) ە واتای هەیە چونکە ڕاناوەو دەلالەتی (تۆ) دەبەخشێت . لە (برام) دا دەنگی (م)یش کە فۆنیمە واتای (من) دەبەخشێت . . (برای) . . .

نەختێکی دیکەش ماوە لەبارەی واتاداری و نەداری فۆنیمەوە بدوێین : زمانزانانی عەرەبی بەر لە ١٠٠٠ ساڵ پتر ، لە (فقه اللغه) بۆ ئەوەچوون کە هەر فۆنیمە (لە تەعبیری ئەواندا «حرف») لە وشەدا دەلالەتێکی هەیە ، ئەم باسەش لەژێر سەرەناوی (الأشتقاق الکبار) لێی کۆڵراوەتەوە ، یا هەر نەبێ من لەژێر ئەم سەرەناوەدا خوێندومەتەوە . لەم مەیدانەدا (أبن جني‌و أبو علي الفارسي)بەتایبەتی یەکەمیان ، کەوابزانم قوتابی دووەمیشیان بوە ، دەستی باڵای هەبوە . . بەهەمە حاڵ ئەوانیش ناڵێن هەر حەرفە مەعنای مەفهوومی هەیە ، تەنها ئەوەندە دەڵێن کە هێای بەرەو ڕاگەیاندنی واتا هەیە . . لێرەدا ئەگەر سەرڕەوی و درشتیەك لە نووسیەکەمدا هەبێت بە بەخشینی خوێنەری دەدەمەوە چونکە دەمێکە ئەو باسانەم بە سەردا تێپەڕیوە ڕێشم نییە بگەڕێمەوە بۆ سەرچاوەکانیان ، گوتنیشیان بێزەرەرە ، مەگەر کەمو کەسرییەکی تێیاندا بێت لەسەر من حیساب بکرێو بەزەرەری خۆم تەواوبێت .

بەر لەوەی بێمە سەر خۆ روون کردنەوە لەبارەی ئەونوختە ـگیانەی تێیاندا یەکدی ناگرینەوە ، تێ بینیەکی گشتی هەیە چاکە گوترێ :

ئێمە ، نووسەرانی کورد ، بەزۆری (Phonology —فۆنۆلوجی) ـو Phonetic —فۆنەتیك) تێکەڵ دەکەین و باسی ناو یەکێکیان بۆ ـموی دیکەیان رادەگوێزین . بەلای منەوە هەرچەند واباشە ـسەکانی یەك بابەت لەو بابەتەدا لێ بکۆڵرێتەوە ، وەیا هەرنەبێ کە ـەریەوە بۆ ناو بابەتێکی دیکە ئەنگوستێکی بۆ رابکێشرێ ، ـیسانەوە بەمەرجێکی هەڵەو بەهەڵە بردن لە بەیندا نەبێ کەس لەو ـگوێستنە وتێکەڵ کردنە زەرەر ناکات .

من هیچ رەخنەیەکم نییە لەوەدا لەناو توێژی (جیۆگرافی)دا ـستیەکی گرنگی (دیمۆگرافی) بخوێنمەوە . بە نموونە ، لێکۆڵینەوە ـسروشتی دەنگی هەمزە خۆی لەخۆیدا سەربە فۆنۆلۆجییە ، بەلام ـۆزینەوەی دەوری هەمزە لە ئاخاوتنی کوردی دا سەر بە فۆنەتیکی کوردییە ، کەچی هیچ بەرهەڵستیم نییە لەوەدا کە نووسەرێك بێت وەدەمی دەرخستنی سروشتی دەنگەکەدا بابداتەوە سەر هەمزەی کوردی و رایەکی رابەری تێدا دەربرێت . ئێمە هەرچەند کە دەبێ رێك وپێکی بەرنامەی زانستی لە تۆژینەوەدا رەچاو بکەین ، نابێ وەتەنگ بێین لەوەی کە سەرەتایمان لەو تەرزە باسانەدا سنووری دوو دراوسێی هێندە بێ سنووری وەك فۆنۆلوجی و فۆنەتیکمان پێ بەزێنێ . ئەوەی راستیش بێ فۆنۆلۆجی لەوەدا بایەخ پەیدا دەکات کە بیێتە چرای مەڵبەندی فۆنەتیك ، دەنا بۆ خۆی بەتەنهاو دوور لە فۆنەتێکی زمان و ئاخاوتنی سەرزاران لەوە تێپەڕ ناکات کە ئارایشتی نەزۆکی رۆشنبیری بێت بەتایبەتی لەئاست زمانی کوردیدا کە پێویستی بە ناوکێڵ کردنی ریزی وشەکانی و لەراندنەوەی داوی تەعبیرەکانی هەیە نەك بە تێوەرامانی لەسەر بەرزایی زمانناسیەوە بە دووربینی فۆنۆلۆجی . . لەگەڵ هەموو رێزێکم بۆ ئەو بەرزاییو ئەو دووربینەدا . .

بەتەمانیم لەم گوتارەدا ورد ورد شوێن هەنگاوی نووسینەکەی د .ئاورەحمان هەڵگرمەوە و پێ بەپێ رەخنەو بیروڕاکانی جوابەجێ بی لەگەڵدا بکەم چونکە ئەم کارە لەرادە بەدەر درێژ خایێنە . لە تێکڕای نووسینەکەیەوە چەند خاڵێکی بنجی دەکەمە روانگەی سەرەتاتکە بەملاو ئەولای باسەکاندا ، لەوەشدا بە ناچاری لێکدانەوەی ئەوتۆ دەخەمەوە بەر سەرنجی خوێنەر کە لە نووسینی دیکەمدا پێیاندا تێپەڕیوەتم ، بەلام بەدەم کوتانەوەی کۆنە خەرمانی وشە کارییەوە گوڵو دانەی نەکوتراوو دێتراویش رەگەڵ پێ گێرەی ئەمجارەیان دەکەوێت . .

خاڵی یەکەم ئەوەیە لەبارەی (کسرة مختلسة)وە بگوترێ ، ئەو کەسرەیەی فۆنۆلۆجیستەکان بەبزوێنی دادەنێن و منیش بە قورس کردن :

ئەم دیاردەیە لە ئاخاوتندا شتێك نییە هەستی سەرنجدەری بەسەردا بکشێتو تێی هەڵنەئەنگوێت ، تەنانەت هێند زەقو بەپۆزە زمانزانانی عەرەب بەر لە ١٠٠٠ ساڵ پتر ناوی (کسرە مختلسة)یان لێ ناوە ، بە پێتۆڵیش لەبارەیەوە دواون هەر بە پێی سروشتی زمانەکەشیان لە نووسیندا نیگاریان بۆ دانەناوە وەك کە بۆ کورتە بزوێنەکانیان داناوە چونکە ئەم (کسرە)یە لەعەرەبیدا تەنها لە دەنگی پێش دەنگی کۆتایی وشەدا دەردەکەوێ کە هاتیتو بێ (اعراب) وەستاندت ، وشەی عەرەبیش لە رستەدا بێ (اعراب) نابێ . بە نموونە رستەی (هذا بکر) دەبێ (ر)ە کەی کۆتایی (بکر) تەنوینی بدرێتێ کە دەکاتەوە (ضمة و نون)و دەگوترێ (هذا بکر ، — بەکرون) کە هاتیت تەنوینەکەت بۆ مەبەستی ئاسانی ، تێ برد ئەوسا قورسایی وەیا (کسرة مختلسة) دەکەوێتە سەر دەنگەکەی (ك) — لەگەڵ ئەمەشدا رەخنەیەکم هەیە لەو ناوەی (کسرة مختلسة) بەتایبەتی کە وەپاڵ دەنگی واو بدرێت چونکە ئەم دەنگە خۆی (ضمە)ی درێژە ، کە بە کۆنسنانتیش دەردەبڕێ تامی (ضمە)ی هەرتێدا دەمێنێ کە ئیتر دەنگی (کسرة) قبوڵ ناکات . لەوشەی (دور — دەور)دا قورسایی سەر (و) ەکە دەنگی (ضمە)یە نەك (کسرە) . هەر ئەم خەسڵەتەی بوونی دەنگی (ضمە) لە (و)دا وای لە نووسەری کورد کردوە کە وشەی (وورچ ، ووزە . .) بە دوو (و) بنوسێت کە یەکێکیان واوی کۆنسنانت و ئەوی دیکەشیان کورتە بزوێنی (ضمە)یە .

رێکەوت وابوو مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ١٩٢٩ بە نووسین باسی ئەم دیاردەیەی کردوە نیگاری بۆ داناوە دەنا مەلاکانی کورد لەوەتەی دەخوێنن و دەرس دەڵێنەوە ئەم (کسرة مختلسة)یان بە سەر زمانەوەیە ، مامۆستا وەهبیش لەوانەوە سروشتی کورتە بزوێنی (ی)ی بۆ قەراردادە کرد کە بەچکەی (ی)ەبەلام لە خوێندنەوەی نوێیەوە بۆ ئەوە چوو کە نیگاری بۆ دابنێت . رۆژئاواییەکان لە نووسینی ئێستاکەیاندا لە زۆر حاڵو باردا گوێ نادەنە ئەم (کسرە . .)یە تا هەمووجارێك نیگاری بۆ دابنێن . بە نموونە کە دەنووسن (burn,turn,Worm) نیگار بەدوا پیتی (r) دا نانووسن هەروەهاش نیگار نایەخنە دوای ئەو پیتەی کە لەسەرەتای وشەوە بێ بزوێنی ئاشکرا دێت وەك (Crow, Screen, Please, bring) و هی تریش . .

وەك د. ئاورەحمان نووسیوەتی ، ئەم دەنگە بارتەقای بزوێن برگە لە وشەدا دروست دەكات ، بەلاَم شتێك ماوە لێرەدا د.ئاورەحمان نەیگوتوە : دەبوو بشلێ وێرای برگە دروست كردن ئاوازەش‌پەیدا دەكات لەو دەنگە كپانەدا كە لەگەڵیاندا دێت ، لەویشدا هەر بارتەقای بزوێن كار دەكات بەلاَم دوو تێبینی گرنگ‌و گرنگتر هەن نابێ پشت‌گوێ بخرێن چونكە رووناكی دەخەنە سەر سروشتی دیاردەكە :

یەكەم ، ئەوەیەكە گەر ئەم دیاردەیە بزوێن‌بایەو بەرەوكەسرەش بایە دەبوو لە دەربڕینی كاف و گاف سەرەتای وشەی كوردیدا ئەو كلۆریە پەیدا بكات كە بزوێنی كورت و درێژی (ی) پەیدای دەكات . دەبوو كاف (كردن)و گاف (گرتن) كلۆر كرابایانە . جا ئەگەر بگوترێ بزوینەكە هێندە بەهێز نیە ئەو كارە بكات دەڵێم منیش لەوەپتر داوا ناكەم كە دیاردەكە بابێ بزوێنی كورت كاریگەر نەبێ . كاف وگافی ئەوتۆیی ناوەندی وشەش هەروەهایە (شەكر ، سەگرمە . .)

تێبینیە گرنگترەكە ئەوەیە كە سەرنجی ورد دەری دەخات ئەم قورس كردنە لەهەموو حاڵێدا ئاوازە پەیدا ناكات ، هەرچی بزوێنە ، كورت‌و درێژی ، هەمیشە ئاوازەدارە . لەگەڵ خۆتدا بێ‌تەرەفانە وشەی (ستاندن) بڵێرەوە دەبینیت ئاوازە بەدوا دەنگی كپی (س)دا نایەت هەرچەند قورس كردنی بەسەرەوەیە . بەڵێ دەزانم كە بتەوێ دەتوانیت ئاوازە پەیدا بكەیت بەلاَم كاری ئانقەست جودایە لەگەڵ فەرمانی فۆنەتیك . لە وشەی (شت)دا ئاوازە بەدوا (ش)دا دێت بەلاَم كەگوتت (شتەكان) ئاوازەكە لە دەنگی (ش) ەوە نایەت . وشەی (فت) ئاوازەی هەیە بەلاَم كە گوتت (فتار) ئاوازەكە لە (ف)ەوە دەڕوات بۆ (تا) ، دیارە دەنگی (ر)ش هەر ئاوازەی هەیە هەرچەند وەستاویشە چونكە دەنگێكی ئاوازەدارە .

فۆنەتیك ناس كە بۆی ئاشكرا بوو ئەم دیاردەیە لەو بارانەدا ئاوازە پەیدا ناكات دەبێ بسەلمێنێ بزوێن نیەو شتێكی دیكەیە . بەنیسبەت دەنگ ناسی كوردەوە تێبینیەكی تاقی‌كەرەوە هەیە كە بۆغەیری كورد دەست نادات :

دەزانین لە زور شێوە ئاخاوتنی كوردیدا كە (ل)ی وەستاو كەوتە بەرایی (ت) ، دەنگەكەی (ل) بۆخۆی دەبێتە (ڵ) ، لامی قەڵەو ، دەنگەكەی (ت) ش وەك (ط)ی عەرەبی لێ‌دێت ، بەلاَم كە بزوێن كەوتە بەینیانەوە وەكو خۆیان لاواز دەمێننەوە . دەگوترێ (قەلتارە – قەڵطارە ، پالتۆ – پاڵطو ، بالتە – باڵطە . .هتد) .

جا ئەگەر ئەم دیاردەیە لە تاقی‌كردنەوەدا بدەینە بەر سەلیقەی دەنگناسیانەوە ئاخۆ بەچ ئاكامێك دەگەین ؟

بابێین وشەی (خلت ، خلط)كە (ل)ەكە تێیدا بەوەستاوی دەكەوێتە پێش (ت ، ط)ە كەوەو بەهەموویان یەك برگەن ، بیكەین بە دووبرگە و بڵێین (خ –ل –ت) ئایا لامە قەڵەوەكە لاواز دەبێتەوە یا هەر بەقەڵەوی دەمێنێتەوە ؟ ئەوەی من وەك بەدیهیەی دەزانم ئەوەیە كە لامەكە بەقەڵەوی دەمێنێتەوەو بەدوا خۆیدا (ت)ە كەش قەڵەو دەكات .

ئایا ئەگەر (كسرة مختلسة)ی سەر (ل)ەكە بزوێن بێت رێ دەمێنێ لامەكە قەڵەو بكرێ ؟ دەزانم لەكوردیدا لامی پێش‌تێ هەمیشە بەوەستاوی و بێ قورس كردن‌دێت بەلاَم بۆ مەبەستی تاقی‌كردنەوە مانیع نیە قورسایی بخەینە سەر (ل)ەكە هەر وەك مانیعش نیە بەنیازی تاقی كردنەوە بڵێین (كق)كە دەزانین هەرگیز دەنگی (ك) لەكوردیدا پێش (ق)یش نایەت . بەهەمە حاڵێ ئەم تاقی‌كردنەوەیە دەدرێتەوە بەبڕیاری سەلیقەی دەنگناسی ، بەكێكیش بیەوێ ئەنجامەكەی نەسەلمێنێ دەتوانێ پێ لەسەرئەو شتە داگرێ كە خۆی ئارەزۆیەتی . لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێم ئەگەر تاقی كردنەوەكە لامە قەڵەوەكەی پاراست ، ئیسپاتی بزوێن نەبوونی (كسرة مختلسة)كە دەكات ، ئەمما ئەگەر قەڵەویەكە هەڵستا ئیسپاتی بزوێن بوونی كەسرەكە ناكات چونكە ئەوسا رێ هەیە بڵێین ئەو قورس كردنە هەروەك ئاوازەی پەیداكرد ، بوە لەمپەریش لە نێوان (ل) و (ت)دا ، جگە لەوە بەڵگەیەكی دیكە هەیە لە نووسینەكەی د.ئاورەحمان خۆیەوە هەڵدەستێ هیچ كەلەبەر لەباسەكەدا ناهێڵێتەوە و بزوێن نەبوونی ئەو دیاردەیە بەئیسپات دەگەیەنێ بەمەرجێك بەڵگە سەلمێن بێ .

ئەم بەلگەیە لە دراوسێیەتی باسی بزوێنەكە لەگەڵ باسی فۆنیم‌دا خۆی دەسەپێنێ . وابەباش دەزانم لێرەدا بەدەم ساغ‌كردنەوەی حاڵ‌و باری (كەسرە)وەچەند شی‌كردنەوەیەكی روونتر كەرەوەش لەبارەی فۆنیمەوە بهێنمە ناو نووسینەوە ، كە ئەویش لەلای خۆیەوە بەتێكرایی هەم یاریدەی ئەسڵە باسەكە دەدات و هەم پتریش نیگای خوێنەر بۆ بینینی كێشەی فۆنیم فرەوان دەكات .

فۆنۆلۆجیستەكان ، كە د. ئاورەحمان لەوانەوە باسی فۆنیمان بۆ دەگێڕێتەوە ئەوە دەڵێن كە لەگوتارەكەدا بەكورتی نووسراوە ، واتە (فۆنیم بەو دەنگانە دەگوترێ كە لەزماندا وشەیێك دەهێنن و بە گۆران و نەمانیان واتا دەگۆرن) .

لێرەدا دەقی تەعریفەكەی د.ئاورەحمانم نووسیوەوە تاكو ئەگەر رەخنەیەكم هەبوو خۆی بكەم بە شایەدی جوداوازی بیروڕای هەردوومان .

کە تەعریفەکەی سەرەوە بکەینە کێشانەی لێکدانەوەمان دوو کەمی ێ پەیدادەبێ لەگەڵ هەندێ لە رایەکانی د . ئاورەحماندا ...ت ..کەون :

یەکەم : نابێ فۆنیم لەدەنگ گرنگتر بێ چونکە فۆنیم خۆی ...گەو هەرچی بایەخ و گرنگیەکی هەبێت بەر دەنگیش ...کەوێت ، بەڵام بایەخی ئەو دەنگە یاریدەدەرانەی کە فۆنیم نین هە..ۆ دەنگ دەمێنێتەوە . وەك کە دەڵێین هەموو ئادەمیزادێك گیان ...ەرەوە چی لە نرخی مرۆڤایەتیدا هەیە لە جغزی (گیان لەبەر) ...چێ . بەڵێ ، راستە بگوترێ ئەو دەنگانەی فۆنیمن گرنگترن ...و دەنگانەی فۆنیم نین .

دووەم : بەدوا ئەو تەعریفەدا باوەڕ بەو بەدیهیە دەکەین کە هەر ...گێکی (لغوی) لەپێك هێنانی وشەدا بەشدار بێت و بە نەمانو گۆ...نی واتا بگۆرێت وەیا نەمێنێت فۆنیم بێ بەو پێیە دەبێ دەنگی هەمزەش فۆنیم بێت چونکە هەموو مەرجەکانی تێدا هاتۆتە جێ کەچی گورج لە فونیمی دەخرێت . . بەڵام با جارێ واز لە هەمزە بهێنین و لەگەڵ فۆنیم خەریك بین :

تەعریفەکە هەموو ئەو دەنگانەی لە پێك هێنانی وشە بەشدارنین لە جغزی (فۆنیم)یان دەرداوێت وەك لرفە و فیکە و کوکە . .و هتد . . هەروەهاش ئەو هێزو سستیو بەرزیو نزمی و توندی و شکیەی کە بە پێی داخوازی دەربرینی تورەیی و رەزامەندی . .و . . ئەو جۆرە هەستانە تێکەڵ بەدەنگی وشەو رستە دەبن ئەوانیش فۆنیم نین . ئەوەندەی بزانم دەنگ ناسان لەبارەی فۆنیم نەبوونی دەنگ دواین هەر ئەوەندەیە کە د . ئاورەحمان لەگوتارەکەیدا باسی کردوە منیش رامگوێستە ئێرەکانە . بەڵام لە خەریك بوونی خۆمەوە بەو تەرزە باسانەی هۆش و دڵ دادەگرن بۆ فۆنیم نەبوونی هەندێ دەنگی دیکە چووم کە وەك دەنگی (لغوی) دەبیسرێن بەڵام لەبەر جۆری دەربرینیان و تێکەڵ نەبوونیان لە پێك هێنانی وشە ناشێ فۆنیم بن :

زوربەی دەنگە کپەکان بەبەریانەوە هەیە لەرێی بردنە ژوورەوەی هەناسە بۆ ناو دەم و سی ، نەك هەر بە هێنانەدەری ، پەیدا ببن ، هێندێك لەو دەنگانەش وەك (ف ، ث ، هـ) بەئاسانی لەو بەرەوا ژییەوە پەیدا دەبن ، تۆ بینە زمان و لێوت بۆ دەربرینی دەنگی (ف) وەیا (ث) ئامادەبکەو لە دەرەوەی زارتەوە بەرەو ناوەوەی هەوا هەڵمژە دەبیەیت دەنگی (ف ، ث)پەیدا دەبێت ، دەنگی (هـ) لەوانیش لەبارترە : هەر نەختێك خۆت هەناسە سواربکەو زارت بکەرەوە بۆ هاتوچۆی هەناسەت ، دەبیەیت بە درێژایی هەناسە سواریت دەنگی (هـ) بەرەو دەرەوە و بەرەو ناوەوە پەیدایە . دوور نابینم لە کوردیدا وشەی (هەناسە) بە ئەسڵ لەو دیاردەوە سازدرابێ کە لەپێشەوە بە (هە) دەست پێ دەکات ، ئینجا ناشزانم کەرتەکەی دیکەی ( . .ناسە)لە چییەوە هاتوە وەیا وشەکە بە درێژ بوونەوەی رۆژگار چەند دەنگی لێ سواوە . . بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تەرزە دەنگانە کە برای دەنگی سروشتین هیچ کاتێکیان نابنە فۆنیم چونکە ناتوانێ دەنگی دیکە بەدوا خۆیدا بهێنێت و وشە دروست بکات ، جگە لەوەی کە هەرگیز ناتوانێ ئاوازە پەیدا بکات چونکە ئاوازە لەپیکی قورگەوە بەرەو دەرەوە دەردەچێت هەر بۆیەشە دەنگی ئاوازەدار بەرەو ناوەوە پەیدا نابێت .

جگە لەم دەنگانە دەنگی (کسرة مختلسة)ش هەر بەپێ تەعریفەکەی د . ئاورەحمان بۆ (فۆنیم) ناشێ فۆنیم بێت ، ئەمەش بەڵگەی قسەکەم :

وشەکان(..shetil. bizin, bezim, golim, genim, kirim, merij) لەم جێگەیەدا تاقی دەکەینەوە . دەبینین هەموویان (کسرە مختلسە)یان لە دەنگی پێش کۆتاییاندا هەیە . ئنجا با بڵێین :

bezmurezim — golme sawar — genmit bird — kirmeke
merjit girt — shetle gul — bizne merez

لەهەموو وشەکاندا دەنگەکەی کەسرە موختەلەسەی برگەی دووەمی و شەکان نەما . ئەگەر فۆنیم بوایە دەبوو واتای وشەکان گۆرانیان بەسەردابێت وەیا واتاکەیان تێ بچێت کەچی وەکوو خۆیان ماونەتەوە . (genim) بوو بە (..genm) هەروەهاش وشەکانی دیکە لەهەمان شوێندا (کسرة . .)کەیان دۆراند و واتایان نەدۆراند . تۆ بڵێ بەرانبەر ئەم راستییە پرۆفیسۆرە زلەکانی فۆنۆلۆجی جیهان جواب بدەنەوە ؟ هەرچی بیڵێن بابێ فلسێك ناکات چونکە بەو تەعریفەی ئەوان بۆ فۆنیمیان داناوە دەنگەکە فۆنیم نییە . خۆ ئەوەی راستیێ بەرلەوەی ئەم تاقیکردنەوەش فۆنیم نەبوونی دەنگەکە بەئیسپات بگەیەنێ ، هەر چونکە دەنگەکە پێداویستێکی فۆنەتیکییەو لەدروست کردنی وشەدا دەوری نییە نابێ بە فۆنیم دابندرێ .

رەنگە بگوترێ لەو تاقی کردنەوەیەدا هەرچەند دەنگەکەی بەرەو کوتایی وشەکان تێ چوو بەڵام لەبرگەی دواتردا بەدەرکەوتەوە ، لەوەرامدا دەڵێم :

١ — ئێمە قسەمان لەمانو نەمانی فۆنیمە پێك هێنەرەکانی ئەو وشانەیە ، چ هەقێکمان بەسەر ئەو دەنگانەوە نییە کە لە وشەکانی

پێشووتر هەبووبێتن وەیا لە برگەی دواتر پەیدا ببن .

٢ – ئەو (کسرە مختلسە)یەی دواتر لەبرگەیەکی دیکەدا پەیدا دەبێ پەکی لەسەر تێ‌چوونی (کسرە . .)ی پێشووتر نەکەوتوە چونکە خوی دەبێتەوە پێداویستێکی فۆنەتیکی بۆئەوەی بتوانرێ وشە وەیا کەرتی وشە دەربیردرێ .

گوتارەکەی د.ئاورەحمان لە ماموستاکانی فۆنۆلۆجییەوە بریارێکی یەکجارەکیمان پێ رادەگەیەنێ کە دەڵێن برگە بێ بزوێن نابێ ، بەمەشدا (کسرة مختلسة) لە خۆوە و لەپەنا ئەو بریارەدا دەبێتە بزوێن ، کە بوو بە بزوێن یەکسەر دەشبێتە فۆنیم . ئەم بریارە لە ماموستاکانەوە پێ دەڵێن (مصادرة علی المطلوب – دزینەوەی مەبەست) چونکە بەرلەوەی بزاندرێ ئایا ئەو (کسرە . .)یە هێزو قورس کردنە وەیا بزوێنە لە رێی ئەو بریارەوە دەبێ بەبزوێن . ئێمە دەزانین بزوێن برگە دروست دەکات بەڵام هەرچونکە قورس کردنیش برگە دروست دەکات مەرج نییە بزوێن بێت ، بەتایبەتی پاش ئەوەی دیتمان ئەو قورس کردنە لە هەندێ حاڵدا ئاوازە پەیدا ناکات ، ئنجا زانیشمان بەتێ‌چوونی واتای وشە ناگۆرێت .

هەرچونێك بێ بابزانین برگە لە ئاخاوتندا چەند پلەی هەیە :

١ – برگەی هەرە کورت لە کۆنسنانتێك‌و قورس کردن پەیدا دەبێ وەك وشەی (چ)

تۆ کە حۆری وەرە نێو جەنەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەرو سینەیی سووزانمدا

٢ – برگە هەیە لە کۆنسنانتێك و کورتە بزوێنێك پێك دێت وەك (دە ،تە ،مە . .)

٣ – برگە هەیە لە کۆنسنانتێك و بزوێنێکی درێژ پێك دێت وەك (با ،دۆ ،سێ) . . .

٤ – برگەی دوو کۆنسنانت‌و قورس کردن وەك (مز .در .گل . .)

٥ – برگەی دوو کۆنسنانت‌و بزوێنێك وەك (مەر ،کەس ، کوڕ) . .

٦ – برگەی دوو کۆنستانت و بزوێنێکی درێژ وەك (مار ، تیژ ،خۆش . .)

٧ – برگەی سێ کۆنسنانت و قورس کردنێك وەك (بست ، مشت ،مرد ،بنج)

٨ – برگەی سێ کۆنسنانت‌و کورتە بزوێنێك وەك (بەست ، کورد ، بیست . .)

٩ – برگەی سێ کۆنسنانت‌و بزوێنێکی درێژوەك (کارد ، ماست ، دانگ . .)

ئەم برگانە پێ بەپێ درێژ دەبنەوە لەپلەی یەکەمەوە تاپلەی نۆیەم ، نە لەیەکەم بەولاوەولەنە نۆیەم بەملاوە وشەی یەك برگەیی پەیدانییە دەمەتەقەیەك هەڵدەستێ لەسەر ئەوەی ئایا لە دەربڕینی دەنگی وەکو (س ،ش ،ژ ،ز . .)دا بێ ئەوەی هیچی دیکەیان بەدوادا بێت برگە پەیدا دەبێ ؟ ئەگەر برگە نییەئەدی چییە ؟ دەنگی وەکو (د ،ك ،ت ،ب . .)دەرنابردرێن ئەگەر قورس کردنیان لەگەڵدا نەبێ چونکە درێژکردنەوە هەڵناگرن هەرچی ئەوانی دیکەن درێژکردنەوە هەڵدەگرن .

بەهەمە حاڵ ئەم وردبێوییە لێرەدا لزومی نییە و دیاردەکە بۆ بینینی خوێنەر بەجێ دەهێڵم‌و دەچمەوە سەر رچەی باسەکە .

بەلای باوەڕی خۆمەوە ، کە لە تاقی‌کردنەوەشدا باوەڕەکەم پتەوتر دەبێ ، برگەی یەکەم (دەنگێك‌و قورس کردن) بزوێنی حەقیق تێدا نییە بەڵکو جۆرێك لە هێز پێ‌دان وەیا قورس کردنی تێدایە کەپێداویستی ناچاری بۆ ناو وشە وەیا ناو تۆیژی رستەی دێنێت ، هەر ئەم هۆیەشە وا دەکات (کسرة مختلسة) بە فۆنیم حیساب نەکرێ چونکە بەشێکی بنجی‌و سەربەخۆ و بەردەوامی وشە نییەو بەتێچوونی واتا ناگۆرێ‌و نادۆرێ ، هەرچی بزوێنە بەشێکی بنجییە لە وشەدا . هەرچەند کورتە بزوێنەکانی ( ضمة ، کسرة ، فتحة) لەرووی نرخی دەنگەوە ناچنە ریزی کۆنسنانت‌و بزوێنە درێژەکان چونکە وجودی سەربەخۆیان نییەو لەدوا کۆنسنانت نەبێ دەرناکەون ، بەڵام دەوریان لە پێك‌هێنانی وشەو رستەدا وەك دەوری دەنگە تەواوەکانە بنجی‌و بەردەوامە ،تەنانەت کەمتر لەکۆنسنانتەکان سوانیان بەسەردا دێت . بەنموونە لە وشەی (بەستریێری)دا دەنگی (س) دەسوێت‌ووشەکە دەبێتە (بەترێری)وەیا (ت) ەکە دەسوێت‌و دەبێتە (بەسرێری)بەڵام کورتە بزوێنی (فتحة) بەدوا (ب)ەکەدا هەردەمێنێ . کاتێك کە وشەکە تەرکیبی گۆڕاو بۆو بە (پترێری) دەنگەکەی (فتحه) تێ‌دەچێ لەگەڵ تێ‌چوونی خویدا (ب)ەکەشی کرد بە (پ) و (س)ەکەشی تێبرد .

کورتە بزوێنی راستینە پێداویستی دەنگ دەربرین نییە کە بەپێی داخوازی جێگە بێت‌و بروات چونکە لە شیرازە هۆنی وشەدا بەشدارەو بەردەوامە ، دەوریشی لە رستە سازی و تێك‌بەستنی دەستەواژەو وشەی ئامێتەدا وەك دەوری هەموو دەنگەکانی زمانە چ بزوێنی درێژ بێ‌و چ کۆنسنانت . بە نموونە لەوشەسازیدا :

دەست : دەستە

نە (دست)واتای هەیە ، نە (دەست)یش جێ (دەستە) دەگرێتەوە . هەرچی (کسرة مختلسة)یە پێداویستی دەربڕینی دەنگەکانە بەپێ مانو نەمانی پێداویستەکە . ئەو (کسرة . .)یە لە ئاخاوتندا دەمێنێتەوە وەیا جێ‌گۆرکێ دەکات وەیا تێ‌دەچێت ،لەوە

هەرگەڕی کە پتریش لە کورتە بزوێن بێوجودی سەربەخۆیە .

بانەختێك سەرنج لەم نموونانە بگرین :

وشەی (سەر)یەك بڕگەیە ، بەڵام کە داتە راناوی کەسی یەکمی تاك وەیا دووەمی تاك دەبێتە دوو بڕگە (سەرم سەرت) . لەخۆوە دیارە بڕگەی دوەم ئەم (کسرة مختلسة)یە پەیدای کرد کە هاتە سەر (ر)ەکە . تو بڵێ ئەمە لەکوێوە هات ؟

وەك بەدیهیە ئاشکرایە هی کۆتایی (سەر) نیە هەروەها وەك بەدیهیە دیارە هی راناوەکانیش نیە . کەواتە دیسانەوە وەك بەدیهیە دیارە کە پێداویستێکی ئاخاوتنە . لەم حاڵەتەدا کە تاکە دەنگێك لەدەرەوە بۆ کۆتایی وشە دێت دەبێ بەهۆی قورس کردنەوە لەیەکدی جودا بینەوە هەرچەند بەپێ داخوازی دەنگسازی ئەمانەش بێ دەنگەکەی اکۆتایی وشەکە بە سکوونی تەواوەوە بکەوێتە بەرایی ئەو فۆنیمەی لەدەرەوە دێتو پێوەی دەلکێت . لەم نموونەیەی (سەرت)دا دەنگی (ر)لەلایەن فۆنەتێکەوە بە سکوونی تەواوەوە دەکەوێتە بەرایی (ت) وەك کە دەڵێ (کەرت ، مارت)بەڵام (ر)ەکە قورس‌کرا لەبەر ئەودەستوورەی تازە باسم‌کرد . هەروەهاش کە راناوی (ت) هاتە دوای (کەس) لەوێشدا قورسایی دەخرێتە سەر (س)ەکە هەرچەند (س) لەرووی فۆنەتیکی کوردییەوە دەبێ لە بەرایی (س)دا بەتەواوی بوەستێ بێ قورس کردن . (کەس ،کەست)

بەڵام کە گوتمان (ئەمە سەرمە ، لەسەر سەرتە ، عەشرەتێك خزمو کەستە . .) لەهەموو حاڵدا قورسایی سەر (ر ،س)هەڵدەستێ هەرچونکە بەهۆی هاتنی بزوێنێك بۆسەر (م ،ت)ەکە قورسایيەکەی بەرایی ، شوێنی نەما . کورد ناڵێ (سە –رمە Se – rime کە –ستە Ke – site, سە – رتە se – rite) (لەمەشدا دەستووری فۆنەتیك بەسەر دەستووری رستە سازیدا زاڵ بوو منو تۆش بەرپرسی ئەو جێگۆڕکێیەو لەناوچوونە نین لێشمان داوا ناکرێ بێقوولْ بوونەوە بزانین بۆچی حوکمی (دەنگ) بەسەر حوکمی (رستە سازی)دا زاڵ دەبێ بەڵام لێمان داوا دەکرێ دیمەنەکە ببینین ونرخی راستینەی ئەو قورس کردنە بزانین تاکو لەپێویست بەدەر بایەخی پێ نەدەین .

زاڵ بوونی دەستوورەکەی فۆنەتیك بەوەدا باشتر روون دەبێتەوە لە جیاتی (کەست) بڵێین (کەستان) چونکە یەکسەر قورسايیەکە هەڵدەستێ بێئەوەی هیچ بزوێنێکی دەرەکی بەدوا راناوکەدا بهێنین ، هۆیەکەش ئەوەیە کە راناوی (تان) خۆی بزوێندارە .

لەو نموونە مەشوورەی (نووستن ، مردن)دا کە نوونی چاوگ بەدوا کاردا دێتو کەسرە موختەلەسە بەمل دەنگی کۆتایی کارەکەدا دەبڕێ ، ئایا قورسایەکە هی چییە ؟ دەزانین هی کارەکە نییە چونکە کە (ن)ی چاوگت لادا کارێکی رێكوپێکی بێ قورسایی دەمێنێتەوە (نوست ،مرد) .دیارە هی (ن)ی چاوگیش نییە چونکە تاکە دەنگ لە خۆوە قورسایی بەپێش خۆیەوە ناگرێ ، جگە لەوەی کە لەو کارانەی کۆتایی‌یان (ا ،و ،ی)بێت قورسایيەکە وجودی نییە هەرچونکە لە بنەڕەتدا وجودی نیەو بە دوا بزوێنیشدا هەبوونی نامومکینە . (سووڕان ،بەزین ، ئەزموون . .) .

بێگومان زمانی حالی ئەو پرۆفێسۆرە زماناسانەی نرخ بەو قورس کردنە دەدەن دەڵێ هەقان بەسەر ئەو لێکدانەوەیە نییە بەرانبەر شتێك کەهەست بە هەبوونی دەکەین ، چونکە مادەم ئەو شتە هەیە دەبێ لە نووسیندا تێ بخوێندرێتەوە . بەڵام ئەوان پرۆفێسۆرانە بایی سەری دەرزی مافی قسەی ئەوتۆیی‌یان نییە ، ئەویش لەبەر دوو هۆی گرنگ و گرنگتر :

هۆی گرنگ ئــەوەیە کەهاتو لێکدانەوە بەڵگەی بەدەستەوەدا نابێ پشت‌گوێ بخرێ دەنا دەبێ لەئاست سەرابیش بەڵگەی هەڵوەشاندنەوەی بپێچینەوەو بە ئاوی دابنێین .

دەزانین سەراب دیاردەیەو چاو دەیبینێت ، بەڵام دەشزانین ئاو نییە لە کەسیش ناسەلمێندرێ بڵێ دەبێ نرخی ئاوی پێ بدرێت .

هۆیگرنگتر لە هەڵوەستی پرۆفێسۆرەکان خۆیانەوە رووبەڕوویان دەبێتەوە : ئەوان هەر لەرێی لێکدانەوەوە دەیانەوی بسەلمێنین دەنگی هەمزە بەخۆیو ئاوازەو زەقوزۆپییەوە فۆنیم نیەو یاریدەدەرەو نابێ نیگاری هەبێ ، ئنجا بۆ دەبێ لە ئاست ئەو دیاردە زێدە کزو بێهێزو بێدەوامەدا کە (کسرة مختلسة وەیا قورس کردنە) نابێ بایەخ بە لێکدانەوە بدرێ . خۆ ئێمە هەرای نێوان زۆردارو زۆرلێ‌کراو نابڕینەوە تاکو بەزەیی بە بەڵگەو بێ بەڵگە بەلای زۆرلێ‌کراوماندا بشکێنێتەوە . لە رێنووس و رێزمان وفۆنەتیك وئەوان کارانەدا شکانەوەی تۆژەرەوە بەلای خاوەن هێزدا دەبێت .

راستییەکەی ، هەڵوەستی ئەو پرۆفیسۆرانە لە ئاست هەمزە و (کسرة مختلسة)دا تەشقەڵە کردنە بە رێنووسو بەسەر جوملەی لایەنی دەنگ لە باسەکانی زماندا و چ مانای شیرنتری تێدا نییە ،ئۆباڵی من و تۆو قوتابیەکانیشیان دەچێتەوە ئەستۆی ئەوانەوە کە ساڵەها بەگوێیاندا دەچرپێنن و چی دەیڵێن بە بەدیهیەمان لەسەر دەسەپێنن ، قوتابیش بێتو بەرهەڵستی لە بیروڕایاندا بکات نیوەی عومری لەدەست دەچێت .

رەنگە بەلای خوێنەرەوە منیش لەئاست دەنگی هەمزەدا دەست‌بەتاڵی‌بەڵگەو بنۆس بم وەك کە پرۆفێسۆرەکان لە قسەکانی مندا دەست بەتاڵ نیشان دران . . کاتێك گەیشتینە باسی دەنگی هەمزە ئەم لایەنەی دەست‌پڕی ودەست بەتاڵی خۆ بەدەر

دەبەخیت . دانانی نیگار بۆ ئەو قورس کردنە لە ڕێنووسدا بەرەنگاری کێشەیەکمان دەکات بەقەدەر قەڵافەتی زمانی کوردی ، ئەمەش نموونەی کێشەکە :

کە وشەی (رانك)مان لە فەرهەنگدا بە (ranik) . نووسی ئەوسا یا دەبێ لە هەموو حاڵو بارێکدائەو نیگارەی (کسرة مختلسة) لەدوا (ن)ەکەوە بێت ، یا دەبێ لە حاڵی تێچوونیدا نیگارەکەی رەش بکەینەوە :

(١) – ئەگەر نیگارەکەمان لە هەموو حاڵدا نووسی شێوەی ئاخاوتنمان دەبێتە ئەسیری ڕێنووسەکەو لە کوردی رەسەن دەشۆرێت چونکە لە ڕێنووسدا قورس کردنێك بەسەر وشەدا دێنین کە لە ئاخاوتندا تێچوە وەك ئەوەی کە گوتت (رانکەکە) ناڵێیت(ranikeke) بەڵکو دەڵێیت (rankeke) هەروەهاش لە زوربەی هەرەزۆری کوردیدا کە قورس کردنەکەیان بەپێی جێگە و مەبەست دێتە ناو ئاخاوتن وەیا تێدەچێت ئیتر دەبێ رستەی وەك (کرمەکە گرژە) بخوێندرێتەوە (kirimeke girizhe) . چونکە لەوشەی (کرم ، گرژ)دا قورس کردن هەیە) . هەر ئەمەش دەبێتە ئاکامی ناچاری بەملدا بڕینی (کسرة مختلسة) چونکە قوتابخانەکان سەرلەبەریان وەهای دەنووسن ، هەرچی منداڵیش هەیە بە قوتابخانەدا تێدەپەڕێتو زمانی کوردی لەو ڕێنووسەوە فێر دەبێت ، مادەم نیگاریش بۆ (کسرة مختلسة) داندرا دەبێ بخوێندرێتەوە وەك کە هەموو نیگاریکی دیکە دەخوێندرێتەوە ، دەبێ (فکرم پەرشە )بخوێندرێتەوە (fikirim perishe) . . ئنجا ئەگەر لەوەرامدا پێم بڵێیتەوە ئەم کێشەیە دەدەرێتەوە بەسەلیقەی خوێنەر کە خۆی دەزانێ قورساییەکە ماوەتەوە یا هەڵستاوە ،منیش پێت دەڵێمەوە کە سەلیقە بەرەوان بێ بوچی لێ ناگەڕێی لە سەرەتاوە بڕیاری مانو نەمانی قورساییەکە بدات ؟ بۆچی دوو جاران ئیمتحانی سەلیقە دەکەیت ، جارێکیان بەوەدا کە دەبێ بزانێ قورسایی هەیە یا نییە ، جارێکیشیان بزانێ گوێنەداتە ئەو نیگارەی لە نووسیندا بۆ قورس کردنەکە هەیە و لە ئاخاوتندا تێچوە . چەند سەیرە تۆ رازی نەبیت بنووسرێ (کرمەکە)و بخوێندرێتەوە (کرمەکە)و پێ لەسەر ئەوە داگریت کە بنووسرێ (kirimeke) .و بخوێندرێتەوە (kirmeke) . . .

لە زمانی کوریدا بگەڕێیت دەبینیت ئەم هاتنو چوونەی (کسرة . .) بەقەدەر دەمارەکانی لەش تێکەڵ بە شیرازەهۆنی زمانەکەیەو هێندەی کە جیوەش لەبەر پەنجەکانت هەڵدێت ئەویش لە ئاخاوتندا خۆیت لێ دەشارێتەوە .

٢ – ئەگەر نیگارەکەمان لەکاتی هەبوونی قورس کردنەکەدا نووسیو لەکاتی نەمانیدا رەشمان کردەوە ئەوسا بەشێکی بەرچاوی وشەی کوردی دووبڕگەیی دوو شێوە نووسینی دەبێ ، لەفەرهەنگیشدا پێویست دەبێ بەوەی خوێنەر ئاگادار بکرێ کە (کسرة)ی فلانە شوێنی وشەکەهەمیشەیی نییە . ئەم ئاگادار کردنەوەو دوو جۆر نووسینەش بۆ وشەی فەرهەنگی لە ئیمکاندا دەبێ بەڵام (کسرة . .)ی کە لەتێك بەستن و دارشتنی وشەو رستە دێنو دەچن بێچارەسەر کردن دەمێنێتەوە ، بە نموونە وشەی (گرتن)دەنووسرێ (girtin) بەڵام لە ڕێژەی فەرمانو نەهیو ئایندەدا قورساییەکەی سەر دەنگی (گ)تێ ذەچێت و وشەکە دەبێتە (bigre, megre, bigrim) . . . وشەی (دیتمت) دەنووسرێ (deetimit) .کە بوو بە (دیتمتەوە) دەبێتە (deetimtewe) . ئیتر بەو پێیە هەزاران تێك بەستنو تێك هەڵکێشان و لێك ترازاندن کە ئیمکان نییە لەپێشەوە فەرهەنگی بۆ دابندرێ وەیا پێش بینی تێدابکرێ ، هەرجارە لەنووسیندا نیگاری ئەو قورس کردنە تێیاندا دەردەکەوێت و و ن دەبێت ، کەئەمە خۆی عەیبێکی گەورەترە لەوەی پێشەکی بڕیاری نەنووسینی نیگاری ئەوقورس کردنە بدرێ . ئەوەندەی زمانی بێگانەم خوێندبێتەوە نەمدیتوە وشەو دەستە وشەو رستەکانی جار لەجارێ چۆنیەتی نووسینیان بگورێ .

ئێمە لەو نموونانەی شکل بەدیهیدا دیتمان قورس کردن لەوشەدا تێچوو و واتاشی نەگۆڕا ، بەمەشدا هەر بەپێ تەعریفی پرۆفیسۆرەکان نرخی فۆنیمی نەما ، ئیتر ئەگەر هەر پێ داگرین لەسەر پێویست بوونی نووسینی ، دەبێ نیگار بۆ دەنگی توورە بوونو لاواندنەوە . . و . . ش دابنێین چونکی ئەوانیش جۆرێکن لەدەنگ و بۆ مەبەسی تایبەتیش دێنە ناو ئاخاوتنەوە . وا دەبێ نارەزامەندی دەنگێکی وشە دەگرێتو بڕگەی تێدا پەیدا دەکات وەك کە دەگوترێ (فلانەشت ؟ دەسا فللسێك ناهێنێ !) لەجیاتی (فلسێك . .) یاخود لەنەهی کردندا دەگوتری (نەککەی بچیت بۆ لای . .) .

دەبێ بزانین مومکین نییە ڕێنووس هەموو دەنگێکی ئاخاوتن شکڵ نووس بکات هیچ ڕێنووسێکی ئەم جیهانەش نییە هێندەی ئێمە مەراقی خوردکردنەوەی ئاخاوتنی هەڵگرتبێ . من لەگۆشە نیگای خۆمەوە چ دوشمنایەتیم نییە لەگەڵ ئەو قورس کردنەدا هەروەکو دۆستایەتیشم لەگەڵیدانییە ، تەنانەت ئەگەر بەکۆمپیووتەر زانرا کە جۆرێکیشە لە جۆرەکانی بزوێن لیێ وەتەنگ نایەم ، هەر ئەوەندە حیسابەی بۆ دەکەم کە بزوێنی یەکجار کورتو بێهێز کاری بزوێنی عادەتی ناکاتو تێدەچێتو واتا ناگۆڕێت و فۆنیم نییە ، خۆ ئەگەر بەبڕیاری کوتەکم حەقچن نیگاریشی بۆ دابندرێ سەغڵەتم ناکات . ئەویش لەبەر دوو سەبەب (١) یەکێکم لەوانەی

ـعـ ـن کەی دێت و کەی دەچێت (٢) بەشی هەرەزۆری عومرم
. ـو ـد ی ئەوەی ناچارم نازی خوراپی بکێشم . . من پەروشی دوو
ـشـه :

یەکەمیان ئەوەیە کە بەخوراپی نرخێکی لە پێویست زیادی
ـگی و بایەخ بوخوی دابریوەو گەلێك بەولای بەرژەوەندەوە زەینی
ـوسـەرانی کوردی بەخویەوە خەریك کردوە لە حالێکدا ئەو قورس
ـردنـه بریتییە لە پێداویستی نا بەردەوامی رستەسازیو وشەسازی ،
ـهـ ـه نەمانی پێداویستەکەش قورس کردنەکە دەرەوێتەوە جا ئەگەر
ـبـ ـێت ئەم مەبەسانەی قورس کردنەکە پێکیان دێنێت چشتی بێ
ـبـخ نین لەوەرامدا دەلێم پێك هاتنی ئەو مەبەسانە بێ ئەوەی نیگار
ـو قورس کردنەکە دابنددرێ دێنە جێ ، چونکە وەك بزوێن و
ـکـهـستانت نییە بە نەنووسینی کەلەبەر بکەوێتە وشەو رستەوە وەیا
ـو ـێـن بگوری وەیا بێ واتابن . هەرچون بە سەلیقە دەزانین بەپێی
ـیـست دەنگی پارانەوە لەحالی پارانەوەدا بخەینە ئاخاوتنەوە بێ
ـمەوەی نیگاری بو دابنێین هەر وەهاش بە سەلیقە دەزانین قورس
ـکـردن لەکوێ دەبێت و کەی هەلدەستێت .

دوەمیان ئەوەیە کە تێخوێندنەوەی قورس کردن ئەرکێکی بێ
ـسـەروبن دەخاتە بەر رێنووس و نووسەرو خوێنەرەوەی کوردی
چونکە نووسەر دەبێ هەمیشە بەپێی هاتن و نەمانی قورسایەکە
حەریکی گورینی رێنووسەکەی بێت . ئێمە وەتەنگ دێین لەو
ـرێنووسەی ئێستاکەمان لە بەرزوری خال و نیشانەی سەرو ژێری
ـپـیـتەکانی ، ئەم جارەیان سەربارێکی قورستر لەبن بارەکە سواری
دەست و قەلەممان دەبێ کەچی کەسیش هەستی بەنوقسانی رێنووس
ـنـەکردوە لەبەر نەبوونی نیگاری قورس کردنەکە ، ناچاریش نەبوە
ـپـرسـی ئایا قورسایەکە بو کوێ بهێنێت و کەی تێ ببات .

د . ئاورەحمان لەستوونی یەکەمی لاپەرە (١٣)ی گوڤاردا بەسەر
(گەنم گەنمەکە) دا دەچێتەوە خوی لەوە ناگەیەنێ کە نووسینی
(genmeke) لەچاو (genim) دا شکلێ کونی دوراندو نیگارێکی
(أ) ی سەرلەبەری لێ کەم بوە خو هەردووکیشیان هەر (قمح)ن و
هەمان وشەن ، هەر ئەوەندە دەلێ لەبری برگەیەك برگەیەکی دیکە
پەیدا بوو ، لەمەشدا هیچ دلدانەوەیەك شك نابەین چونکە
سەرەرای ئەوەی کەبرگەی دوەم لە دەرەوەی وشەی (گەنم)
پەیدابوو بەهاتنی بزوێن وەیا قورس کردن بو کوتایی وشەکە ،
کێشەمان کێشەی تێ چوونی دەنگ و نەمانی نیگارەکەیەتی نەك (برگە
سازی) چونکە وشەو رستە هەر دەبێ برگەو کەرتیان هەبێ ، ئەوەی
نەخوێندووشە دەنگ و وشەو کەرت و رستە دەردەپەرێنێ بەلام کە
بوو بە نووسەر چاوەکانی دەبینن جارێکیان نووسرا ((Genim) و

جارێکیشیان نووسرا (genm) کە بوو بە فوینم ناسیش دەبینێ
ئەودەنگ ونیگارەی بە فوینم داندرابوو هەلستاو واتاشی تێك نەدا .

راستییەکەی ئەم تەرزە رێنووسە رێ دەدات داوا بکرێ ، وەك
کراوە ، فەرق لە نێوان نووسینی (کا) و (کێ) ش بکرێ ، داله
کلورەکەی سلێمانیش نیگاری بودابندرێ — وەك کە مامۆستا وەهبی
بە (ذ) ی دەنووسی — منگەی نێوان (ن ، گ) ی (دەربەنگ)یش
لەنووسیندا تێبخوێندرێتەوە . بەلێ دەزانم کێشەی ئەمانە هاوچوونی
تەواوی کێشەی (کسرة . .) نییە بەلام خو کێشەن ! (کسرة
مختلسة)ش هاوتای بزوێنی کورتی ئاشکرا نییە کەچی دەلێن دەبێ
وەك ئەو بایەخی پێبدرێ ، بە هەمەحال کێشەی (کا ، کێ) و
دەنگی دالی کلور و (ن ،گ) پتر لە کێشەی (کسرة . .) نرخ پەیدا
دەکات لەوەدا کە هەمیشەیی و بەردەوامن و نارەوێنەوە وەك کە
قورس کردن کاتی ونابەردەوامەو تێ دەچێت .

د . ئاورەحمان چەند رستەو دەستەواژەیەکی هێنابوە بە نموونەی
ناقولایی نیگار دانەنان بو ئەو قورس کردنە ، وەك (جلم برد شتم —
من کرم گرت — من پرشنگم گرت . .) لەروالەتدا نموونەکان رەخنە
هەلدەگرن بەلام بە لێوردبوونەوە مەسەلەکە دەگورێ :

ئێمە دەزانین هەردەنگێکی لە بەرای وشەوە بێت و بزوێنی
ئاشکرای لەدواوە نەیەت بەناچاری قورس دەکرێ ئیتر نیگار
دابندرێ وەیا دانەندرێ قورس کردنەکە لەخووە بەسەر زاری مروڤدا
دێت . جا ئەگەر لەپێشەوە بریارمان دا ، وەك کە رێنووسی
ئینگلیزی بریاری داوە ، ئەم شتە ناچارییە بدەینەوە بەفەرمانی
واقیع و رەنجی نیگار کێشانی تێدا نەبەین شتێکمان کردوە لە بریاری
هوش پێشکان و ژیر بێژی بوەشێنتەوە هەروەك لە جودا نەکردنەوەی
کاف و گافی کلوریش هوشیان بەکار هێناوە و عەزابێکی بێ لزوممان
لەکول نووسەری کوردو کوردی کردوتەوە ، هەرچەند لەئاست ئەو
کاف و گافەدا هەموو کورد لە هەموو حالێ و باردا یەك مامەلە ناکات
چونکە کوردی بەری سوران لە وشەی وەك (دەپشکوێ ،
دەئەنگوێ . .) دا کلوریان ناکەن چونکە لەئەسلدا کاف و گافی
(پشکووتن ، ئەنگووتن . .) کلور نین ، هەروەها (مەرەکەبی
کوینك و دەولەتی کویت و کوین ئەلیزابێت . .) کاف و گافیان وەك
خویان دەمێننەوە . . لەگەلێ ئەمەشدا ئاسان کردنی رێنووس و
یەکچوون کردنی لەزمانێکدا ئەوە دەهێنێت تێبینی وەها بەرتەسك
لەبیر بکرێ . ئائێستاش رێنووسی لاتینی کە من دیبێتم قورس کردنی
بەرایی وشە تێدەبات و نیگاری بو دانانێت و کەسیش تێیدا
نەشێواوە . ئێمە لە رێنووسی ئێستاکەماندا کە بەپێتی عەرەبی
دەنووسرێ گرفتێکمان نەهاتوتە بەر لەو تەرزە رستەو دەستە واژانەدا

که د . ئاوره‌حمان نموونه‌ی لیّ هێناوه‌ته‌وه ، برواش ده‌که‌م (فرچکم گرت) گه‌لێك خۆش خوێن‌و ئاسانتره له‌وشه‌ی وه‌ك (تیّهه‌لّ چوومه‌وه – تێهه‌ڵچوومه‌وه – تیّهه‌ڵچوومه‌وه) .

د . ئاوره‌حمان ده‌یتوانی ئه‌و نموونانه بهێنێته‌وه بۆ به‌ئیسپات گه‌یاندنی که‌م بایه‌خی ئه‌و قورس کردنه له‌نووسیندا به‌وه‌دا بلّیّ ئه‌ریّ خوێنه‌ری کورد کامتان هه‌ڵه ده‌که‌ن له خوێندنه‌وه‌ی (لنگم بلّند کرد) ؟ به‌راستی که‌سیش هه‌ڵه‌ی تێدا ناکات هه‌رچه‌ند وشه‌ی (لنگ) بزوێنێکیشی لیّ‌قرتاوه چونکه راستییه‌که‌ی (لینگ)ه .

له‌و رسته‌یه‌ی (لنگم بلّند کرد) دا به‌رێکه‌وت وشه‌کانی (لنگ ، بلّند ، کرد) به‌فه‌رمانی ده‌نگسازی کوردی له‌خۆوه گرفتیان ره‌ویوه‌ته‌وه چونکه ده‌نگه‌کانی (نگ ، ند ، رد) له‌و ده‌نگانه‌ن که به‌دوا یه‌کدیدا قورس کردن هه‌ڵناگرن ئنجا ئه‌گه‌ر قورسایی‌سه‌ر (ڵ)ه‌که‌ت هه‌ڵگرت ده‌بیّ (ن)ه‌که قورس که‌یت‌و له (د)ه‌که‌ی دابریت، ، ئه‌مه‌ش دژی ده‌نگسازی کوردییه چونکه (ن)ی وه‌ستاو له به‌رایی ده‌نگه‌کانی (گ ، د ، ت) دا قورس کردن هه‌ڵناگریّ راستییه‌که‌ی ئه‌و ده‌نگه‌ی (ن) له وشه‌ی کوردیدا له به‌رایی (ج) شدا قورس ناکریّ وه‌ك (بنج ، ره‌نج ، کونج . .) به‌لاّم گوێم لیّبوه هه‌ندیّ کورد له وشه‌ی (به‌نج) دا قورسایی ده‌خه‌نه سه‌ر (ن)ه‌که . ده‌بیّ ئه‌وه‌ش بلّێم له ده‌نگسازی کوردیدا هاتنی بزوێن له به‌رایی ده‌نگه‌کانه‌وه داخوازی قورس کردنیان ده‌کات به‌پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌ی به‌دوایاندا بێت ، به‌نموونه وشه‌ی (دنك) ئاسانتر نوونه‌که‌ی ده‌وه‌ستێندریّ له (ده‌نك) . که بزوێنه‌که‌ش بوو به‌بزوێنی درێژ وه‌ستانه‌که مومکین نابیّ وه‌ك له‌وشه‌ی (رانك) دا ده‌بیّ نوونه‌که قورس بکریّ . به‌لاّم که بزوێن به‌دوا وشه‌که‌دا هات قورساییه‌که ده‌روات وه‌ك که ده‌ڵێی (رانکه‌که‌م) نوونه‌که ده‌وه‌ستێندریّ . هه‌ر له‌به‌ر فه‌رمانی ئه‌م جۆره ده‌ستووراته‌ی ده‌نگسازییه که گوتت (پلّنگ ، بێژنگ ، ره‌وشت) چارت ناچاره ده‌بیّ ده‌نگه‌کانی (ڵ ، ژ ، و) قورس بکه‌یت چونکه (نگ ، شت) له کوردیدا بیّ قورس کردن به‌دوایه‌کدیدا دێت ، که‌سێك وه‌هایان ده‌رنه‌بریّ کورد نییه و کوردی فێر نه‌بوه .

ماینه‌وه له‌گه‌ڵ راناوی که‌سی یه‌که‌می تاك به‌دوای وشه‌ی (لنگ)دا (لنگم) : تۆ که به‌خه‌ڵقت راگه‌یاند هه‌ر تا که ده‌نگێکی کۆنستانتت له‌ده‌ره‌وه‌ی وشه‌وه هێناو به وشه‌که‌وه‌ت لکاند قورسایی ده‌خاته سه‌ر دوایین ده‌نگی وشه‌که عوزری هه‌ڵه‌کردنت به‌ده‌ست که‌سه‌وه نه‌هێشتوه ، ئه‌وساش نه‌ك‌هه‌ر له‌ئاست راناودا ، بگره له‌ئاست هه‌موو پاشگرێکیش چاوی خوێنه‌رانت کردوته‌وه وه‌ك . (کوڵك ، کوڵکن – ده‌ست ، ده‌ستك : (Destik,Kulkin) .

ده‌ستووراتی ده‌نگسازی که خه‌ڵق له خۆوه بیّ‌ئاگاداری و لیّ وردبوونه‌وه به‌کاریان دێنن گه‌لێك باری ئه‌و قورس کردنه‌ی نه‌رم کردوه ، به نموونه دوو وشه‌ی (فرچك ، گرفت) ده‌ده‌ینه به‌ر ده‌ستووراتی ده‌نگسازی .

دوو ده‌نگی (ف ، گ) له به‌رایی وشه‌کانه‌وه به فه‌رمانی ناچاری قورس ده‌کرێن که ده‌کاته‌وه فه‌رمانی ده‌نگسازی . له وشه‌ی (فرچك) دا دیسانه‌وه به‌ناچاری ده‌بیّ ده‌نگی (ر) له‌گه‌ڵ ده‌نگی (ف) بیێته برگه‌ی یه‌که‌م چونکه هاتنی (ر)ه‌که به‌دوا ده‌نگێکی قورس کراودا ده‌بیّ برگه دروست بکات مه‌گه‌ر داخوازیه‌کی به‌هێز وه‌ها بکات سه‌ر له‌نویّ (ر)ه‌که قورس بکرێت ، وه‌ك ئه‌وه‌ی له جیاتی (فرچك) وشه‌ی (فرشته) بایه ده‌بوو (ر)ه‌که قورس بکریّ بۆئه‌وه‌ی (ش)ه‌که به‌بیّ قورسایی بکه‌وێته به‌رایی (ت)ه‌که‌وه . هه‌ر هۆیه‌کی ئه‌وتۆییشه وه‌ها ده‌کات له وشه‌ی (گرفت) دا (ر)ه‌که قورس بکرێت چونکه ئه‌گه‌ر قورس نه‌کرێت ده‌بیّ (ف)ه‌که قورس بکرێت ده‌شزانین (ف) حه‌ز له (ت) ده‌کات . .

ئێمه که ئه‌م ده‌ستووره فۆنه‌تیکیه سروشتییانه‌مان له ده‌نگسازی کوردی‌دا هه‌ست پیّ‌کرد سه‌یرمان نایه‌ته‌وه له‌وه‌ی کورده‌واری له خۆوه بلّیّ .

بیّ – ژنگ

ب – رشت

گ – رفت

پ – ڵنگ

پر – شنگ

که – نشت

د – روست

ب – نێشت

شاخی (سگرمه – (س – گر – مه) ئه‌گه‌ر بزوێنی به دوادا نه‌هاتبایه ده‌بوو بگوتریّ (سگ – رم) به‌لاّم ئه‌گه‌ر (سگرت) بایه ده‌بوو بگوتریّ ( س – گرت) وشه‌ی (باڵنده) ، ئه‌گه‌ر پێداویستی فۆنه‌تێکی نه‌بوایه ده‌بوو وشه‌ی (باڵ) که بنجییه برگه‌یه‌ك بێت و (نده) ش که پاشگره برگه‌ی دووه‌م بێت به‌لاّم چونکه (ن) ی پێش (د) ده‌بیّ وه‌ستاوی ته‌واوبیّ (ڵ)ه‌که‌ی به‌قورس کراوی بۆخۆی راکێشاو له‌ئه‌سڵی وشه‌که‌ی ستانده‌وه . که‌چی (باڵگره) ده‌بیّ (باڵ – گ – ره) بخوێندرێته‌وه چونکه وشه‌ی باڵ که بنجییه هیچ ناچاریه‌کی ده‌نگسازی (ڵ)ه‌که‌ی لیّ ناستێنیّ بۆ سه‌ره‌تای (گره) که له وشه لێکدراوه‌که‌دا پاشگره ، ئینجا ئه‌گه‌ر پێم بلّێیت ئه‌م

ـستوورانه کەی بەبیری خوێنەردا دێت تا له خوێندنەوەدا بە پێی ـگـزی بە بێ نیشانەو نیگار پێرەویان بکات ، له وەرامدا ـێـ :

نووسەر کەبیەوێ نیگار بۆ قورس کردن دابنێت دەبێ بەسەلیقە ـ ـە فێربوون شوێنی ئەو قورس کردنانە بزانێ دەنا له ئاخاوتندا هەڵە ـکات و قورس کردنەکە له شوێنی نالەباردا دادەنێت . ئنجا کە حـ وەها بێ نووسەرو خوێنەر هەر وەك لەئاخاوتندا بەرەهایی و بێ ـگر وشە دەردەپەڕێنێ له خوێندنەوەشدا هەروەها دەکات جـکە شتێك دەخوێنێتەوە کە پێشتر له گەرووی خۆی دەرهاتوەو ـتر بەسەر نووکی قەڵەمەکەیدا تێپەڕیوە ، نووسەرو خوێنەریش ـیـ حوکمدان چونکە خوێنەریش وەك نووسەر ئاخێوەرو سەـیقەداره . بێگومان سەلیقەی راستو رەوان بێ تەدەخولی ڕێنووس و نووسەر لەئاست ئەو قورس کردنەدا ئازادترو رەهاتر ـەبێ لەوەی بێین دەستووری مامۆستا وەهبی بەسەردا بسەپێنین بۆی ـوسین (فیرچیکم گیرت ، دەستیم بیلیند کیرد . .)

۲) ئەگەر رەوابێ رەخنەی ئەوتۆیی لەو قسانەی من بگیرێ دەبێ سەرلەبەری زانستەکانی زمان یاساغ بکرێن چونکە هەموویان تێ‌کردنەوه و وردە کاریو دەستوور سازی و کێشانەو پێوانەی بەنامەکی له شتی ئەوتۆدا دەکەن کە زوربەی بابەتیان لەوانەن کاری سەلیقە بن . کام ئاخێوەری رەوانە بێنە له ڕێزمان و سینتاکسی تاق ـکەوەمتەق ناکا . قسەی من وەیا هی د . ئاورەحمان بۆ ئەو کەسانەیە کە لەبەرتیشکی لێکدانەوەدا سەیری دیاردەی ئاخاوتن و نووسین دەکەن . ئاخێوەری عادەتی نە بابەتی ئەوتۆیی دەخوێنێتەوەو نەتێ دەگات و نە بەتەماشە رۆژەك لەرۆژان پەنگ بەقسەکانی دەروونی بخواتەوه تا دەیانخاتە بەرانبەر ئاوێنەی ڕێنووس و ڕێزمانو زمانناسیو وشە سازیو دەنگسازییەوە .

بەراستی ئەم کێشەیەی (کسرة مختلسة) له ڕێنووسی ئێستاکەی کوردی عیراقدا هیچ گرفتی دروست نەکردوەو خەڵقەکە بەهۆی نەبوونی نیشانە ئەو (کسرة . .) یە دەتوانن لووستر و ڕێکتر نووسینی کوردی بخوێننەوه ، تەنانەت نموونەکانی د . ئاورەحمان بۆ خۆیان شایەدی ئەم راستییەن چونکە هیچ خوێنەرێك هەڵەیان تێدا ناکات . کاتێك کەوتینە سەر نووسین بەلاتینی ، گرفتەکە سەر بەرز دەکاتەوە چونکە لەلاتینی دا چاومان بەجۆرە نووسینێکی دیکە فێربوە ، هەرچەند دەزانم زمانناسی کورد پتر لەهی ئینگلیزو فرەنسە بایەخ بەو قورس کردنە دەدات ، تەنانەت ئەگەر رێ هەبێ نووسەری ئینگلیزیش ناچار دەکا له جیاتی (Bring,Turn) بنووسێت (Biring,Turin) .

راهاتنو ئۆگر گرتن لەسەر جوملەی چالاکی مرۆڤیعادەتیدا کاریگەرێکە بارتەقای رۆشنبیریو زانستو خوێندن جڵەوکێش و پاڵپێوەنەرە . تۆ بێنە ئینگلیزێك ناچار بکە وشەی (neighbour – دەخوێندرێتەوە «نێبەر») وەها بنوسێ وەك لەزارەوە دەردێت (nyber) دەبینیت دەستو قەڵەمی دەشێوێن ، وشەی (archive) بە فرەنسەییەك نیشانبدە دەخوێنێتەوە (ئەرشیف) کەچی ئینگلیز دەخوێنێتەوە (ئارکیف . .) . ئینگلیزێك کە بنوسێت (ئای) ئەگەر بە واتای (چاو) بێت دەنووسێت (eye) بەواتای (من)یش دەنووسێت (I) . چ سەیریشی بەوکارەی نایەت .

دەبێ بزانین ڕێنووسی لاتینی بەتێکرایی ، پاشماوەی بەرەوپێش چووی و بەعەیب وعاری ڕێنووسێکی چەندهەزار ساڵەیی‌یەکە له بنەرەتدا هیرۆغلێفی بوەو دواتر بە گۆڕانەوە بۆتە ڕێنووسی نەتەوە سامیەکانو له ۷۰۰ی پێش‌زایینی‌دا پەڕیوەتەوە بۆ یۆنانیەکان (بنۆرە : فرهنگ ایران باستان ، پورداود – العلاقة بين النطق والكتابة في تعليم العربية – محاضرة مجيد الماشطة ، نيسان ۱۹۸۲) لەوێشەوە وردە وردە بەوڵاتانی ئەوروپادا بڵاو بۆتەوە . یۆنانیەکانیش بەشێك له کۆنسنانتەکانیان کردوە بەبزوێن کە لەنووسینی ئارامیدا کۆنسنانت بوە بەلاٌم بە شێوەیەکی لێڵ بە بزوێنیش بەکارهاتوە (مجيد الماشطة – العلاقة بين النطق والكتابة . .) ڕێکەوتێکی سادەی سەرەتایی بوو کە له نووسینی لاتینی دا دەنگی هەمزە نیگاری بۆ نەکێشراو رەگەڵ نیگاری دەنگی‌دیکەدا تێکەڵ کرا ، ئەوساش بەر له ۷۰۰ر۲ ساڵ نە فۆنۆلۆجی هەبوو نە فیلۆلۆجی نە سینتاکس و نەهیچ ، هەرچی دەسکاریەکی له ڕێنووس‌دا کرابێ بەچکەی نابەڵەدیو سەرپێیی‌و پەلە بوە بێ مامۆستاو بێ رابەر . گەلێك باری نووسینی ئینگلیزی و فرەنسەیی تامی (هیرۆگلێفی) دەدات کە لەوێ‌دا وشە نیگاری هەبوە نەك دەنگ ئەگەر ڕێنووسی ئێستاکەی کوردی ئەو هەموو دەست هەڵبڕینەوەی تێدا نەبوایە لەبەر زۆری خاڵو نیشانەو نەلکانی بەشێکی پیتەکانی بە پیتی دواخۆیانەوە ، سەد جاران لەلایەن کێشانەو پێوانەوە له هی لاتینی (وەك فرەنسەیی و ئینگلیزی) زانستیتر دەبوو چونکە چی دەنووسرێ خزمە لەگەڵ ئەوەی دەگوترێ ، تەنانەت ناوناوە وردپێوی وەهای تێدا کراوە زۆر ژیرانە ڕێنووس و ڕێزمانی لەیەکدی گرێ‌داوە وەك کە فەرق‌کراوە لەنێوان تاکە پێشگرو دوو پێشگردا لەرووی لکاندنیان بە کارەوە وەیا پێشنیار هەبوە بە فەرق کردن لەنێوان نیشانەکانی فەرمان و نەهی و ئایندەو نەفی لەگەڵ پێشگر وەیا راناوێکی کە دەکەوێتە پێش کارەوە لەو روەوە کە ئەو نیشانانە پتر تێکەڵ بە تەکوینی تاکە (کار) دەبن بێ ئەوەی بیانکەن بە لێکدراو . . جوداوازی نێوان (نە)ی بە واتای

(no) و (نە)ی بەواتای (neither,nor) لەرێنووسدا ئەویش هەر وردە کارییەکە کوردی ناسەکان لە ئاکامی تێکرای پێشکەوتنی زانستەکانەوە بۆی چوون دەنا بەر لە ٥٠ ساڵێك کە کوردی دەنووسرا کێشانەو پێوانەی تێدا بەکار نەدەهات .

بروا دەکەم هەر جۆرە رێنووسێکی بۆ کوردی بەپێی لاتینی قەرار دادەبکرێ بەهۆی راهاتنەوە لە ئاکامدا بەلووسی دەخوێندرێتەوە ، بەتایبەتی چونکە پیتەکانی دوو جۆر نین کە بلکێن و نەلکێن ، خاڵ و نیشانەشیان وەك نەبێ وەهایە . ئینجا ئەگەر رێنووسەکە تائەو رادەیەی ناقۆڵایی تێدا پەیدا نابێ ، لەو قورس کردنە رەها بکرێ بەقازانجی زمان و رێنووسی کوردی تەواو دەبێ . بەلای منەوە ناشێ قورس کردنێکی بەردەوام نەبێ نیگاری بۆ دابندرێ . . قورس کردنی دەنگی سەرەتای وشە نیگاری ناوێ . . کورتی رای من ئەوەیە : هەتا بکرێ پێویستە لەو نیگارە خۆمان بدزینەوە چونکە فۆنیم نییە بەردەوام نییەو داخوازی دەنگسازییە . . لەوەشدا زۆرم بۆ ئەو قورس کردنە بەجێ هێشتوە چونکە بەپێی تەعریفی فۆنۆلۆجیستەکان فۆنیم نەبێ مافی نیگار بۆ دانانی نابێ .

## دەنگی هەمزە :

گوتارەکەی د . ئاورەحمان کە بیروڕای فۆنۆلۆجیستەکان لەبارەی هەمزەوە پەسەند دەکات و لەوانەوە بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ فۆنیم نەبوونی ئەو دەنگە ، بەرەو لێکدانەوەیەکەوە دەڕوات کە لەپێشەوەبڕیاری خۆی داوە بە ئیعدام کردنی هەمزە ، تەنانەت هەبوونی لە بەرایی وشانەوە بە بەڵگەی نەبوون دادەنێت . ئەو مامۆستایانە دەیانەوێ بسەلمێنن کە هاتنی هەمزە لە بەرایی وشە تەنها بۆ دەربڕینی ئەو ڤاولانەیە کە بەدوایدا دێن .

د . ئاورەحمان دەنووسێت : (هەمزە . . . دەنگێکی یاریدەدەرە لە سەرتای ئەو وشانەوە وەیا ئەو برگانەوە پەیدا دەبێ کە بەبزوێن دەستپێدەکەن . )

جاری دەبێ وەکو بەدیهیە بزانین کە دەستپێکردنی وشە وەیا برگە بە (بزوێن) لە بنەرەتدا موستەحیلە . بزوێن هەمیشە بەدوا کۆنسنانتدا دێت . تەنها لێرەدا تێبینییەك هەیە دەبێ بن لێونەخرێ . دوو دەنگی بزوێنی (و ،ی)ی درێژ شێوەی کۆنسنانتیشیان هەیە ، راستییەکەشی دەبێ بڵێین (و ،ی)بە بەریانەوە هەیە بینە بزوێنی درێژ .

لە وشەی (یار ،پایز ،وەشت ، دەروازە)دا هەردوو دەنگی (ی ،و)کۆنسنانتن هەرچی دەنگی ئەلفە هەربزوێنەو نابێتە کۆنسنانت . هەندێك لەزمانزانانی کۆنی عەرەبی کە هەمزەیان بە ئەلفی کۆنسنانت داناوە زۆر لەسەهوودان تەنانەت یەکێکی وەکوو (ابن درستویە) لەکتێبی (تصحیح الفصیح)دا هەمزە بەدەنگێکی سەربەخۆ دادەنێت . بزوێنی کورت لەدەنگی ئەلفیش پتر پابەندی کۆنسنانتە چونکە هێندەی ئەو وجودی سەربەخوی نییە : تۆ بێنە وشەی (گە ،گا)لەرێکۆردەردا تۆماربکە و دواتر دەنگەکەی (گ) لە هەردووياندا بسڕەوە و گوێ بگرە لەوەی بە بزوێنی دەمێنێتەوە دەبیەیت دەنگەکەی ئەلف دەناسرێتەوە باشتر لەوەی کورتە بزوێنی (فتحة)بناسرێتەوە .بەهەمەحاڵ ئەم لایەنە سەرێشەی کێشەی هەمزە نییە .

ئاخێوەر کورد بێت و عەرەب بێت و رووس بێت ناتوانێ دەنگی بزوێن لەبەرایی وشە بدرکێنێت .ئنجا کە هاتنی بزوێن لە بەرایی‌دا موستەحیل بێت چۆن بسەلمێنین مام (بارام)ێکی بەر لەوەندە هەزار ساڵە بیری بۆئەوە رۆیشتوە هەمزە بخولقێنێ هەر بۆئەوەی موستەحیلەکە بکات بەمومکین . بۆچی نەهات دەنگی کۆنسنانتی دیکەی حازر بەدەست بخاتە پێش ئەو بزوێنانەی هەمزەی خستنەپێش ، خۆ لە هەزاران هەزار شوێنی دیکەدا وەهای کردوە کە هەمزە فۆنیم نەبێت و مەوجوود نەبێت بۆچی. لەجیاتی (ئێرە ئاو . .) نەگوترا (فێرە ، ژاو) . ئنجا ئەگەر بڵێ چ قەیدی هەیە هەمزەیان تێدا بەکاربهێنێت منیش دەڵێم چ قەیدی هەیە دان بەوەدا بهێنیت کەهەمزەش وەك (ف ،ژ)فۆنیمەو دەنگە وێك هێنەری وشەیەو بەلادان و گۆڕانی واتا یا نامێنێ یا دەگۆڕێ ؟ ئەم راستییانە بوچی بکوژرێن ؟ هەر هەتا هەمزە بکوژرێ ؟

چەندێکی فکرم دێنم و دەبەم بۆئەوەی هۆیەك بدۆزمەوە فۆنۆلۆجیستی رۆژئاوای ئیقناع کردبێت بەوەی هەمزە فۆنیم نییە هەر ئەوەندەم بەبیرداديت کە لەکۆنەوە نیگاری بۆ دانەندراوە ئیتر چاوی بە نەبوونی راهاتوە ، دواتریش دەرکی کرد کە بەزۆری وەیا هەمیشە بزوێنی بەدوادا دێت لەوەرا یەکەندەردوو دڵی تەسکین بوو بەوەی کەوا هەمزە هەروەك نیگاری نییە فۆنیمی رەسەنیش نییە . . . جا ئەگەر ئەمەش سەبەب نەبێ هیچ سەبەبێك نامێنێتەوە لە رووپەرەی زمانناسی و دەنگسازیدا بە بۆرە تەئویلیش‌پشتگیری لەو رایە بکات چونکە دەنگی هەمزە نەك هەر هەیەو بەس . بەڵکو لە دوو روەوە پێش دەنگەکانی دیکە دەکەوێتەوە :

(١) – دەنگی هەمزە یەکەم فۆنیمی ئاوازەدارە (دواتر لەسەر ئەم خاڵە دەروێن) .

(٢) – لەهەموو زماناندا هەیە کە دەزانین فۆنیمی دیکەی وەك (چ ، ژ ، ط ، ص ، ف ، ث ، غ ، پ ، گ ، ذ ، گ ، ذ ، ڵ ،

ح ، خ ، ض ، ظ ، ع) هێندەی هەمزە پەرەسەندوو نین .

ئەدیاردەی پێش‌کەوتنەوەی هەمزە لە بزوێن راستیەکی فۆنۆلۆجی هەیە زۆر بە سەیری سەرەوبن کراوە : هەمزە بزوێن بەدوا خۆیدا دەهێنێت نەك بزوێن لەهیچەوە هەمزە خەلق دەکات و دەیخاتە پێش خۆیەوە . لەو دێڕانەی دواتردا راستی مەسەلەکە روون ئەکەمەوە بەداخەوەش کەس لەسەری نەنووسیوە وەیا بۆی نەچوە تا سەرچاوەیەك یارمەتی نووسینەکەم بدات چی لێرەدا دەیڵێم شتێکە یەکەم جارە دەگوترێ یاخود هەرنەبێ بەلای خۆمەوە یەکەم جارە ، چونکە نە لەکەسم بیستوەو نەلەکەسیشم خوێندۆتەوە :

رۆشنبیری کورد ، دەنگناسان بەتێکرایی !

نەك تەنها هەمزە بەڵکو سێ دەنگی دیکەش لەوانەی پێیان دەڵێن (حروف الحلق) لە کوردیدا بەدەگمەن نەبێ بێ‌بزوێن نایەن . دەنگەکانی (ء ، هـ ، ح ، ع) هەمیشە لەسەرەتای وشەدابزوێنی ئاشکرا لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن .

دەنگی هەمزە بەرەژوورترین دەنگی ئاوازەدارە ، هێندیش‌بەرەژوورە لە عەینی ژێ دەنگەکانەوە ، کە ئاوازە پەیدادەکەن ، دەردەچێت .

دەنگی (هـ)بەرەژوورترین دەنگی کپە کە ئەگەر هاتبایە بە ژێ‌دەنگان بکەوتبایەوە دەبوو بەهەمزە . هەر ئەم نزیکایی شوێنی پێوە هاتنیانیشە دووئەنجامی بەخشیوە .

ئەنجامی یەکەم ئەوەیە کە دەنگی (هـ)ش بەزۆری وەك هەمزە لەنێوتوێژی وشەدا تێ‌دەچێت . بەنموونە کاری (هات)لەئایندەدا دەبێتە (دێت)و بەدەگمەن نەبێ ناگوترێ (دەهێت) ، لەسلێمانیش بۆتە یەت . لەرێژەی فەرماندا دەبێتە بێ :

گێل ئەگەر تورکی تعال ئەر عەرەبی

بێ ئەگەر کوردی وەگەر فارسی بیا

کاری هێنام دەبێتە دێنم ، هەرچەند دەشگوترێ (دەهێنم) ، بەلأم لەفەرماندا بەزۆری (بێنە) لەباوە چونکە نیشانەی (ب) بزوێنی نییە وەك کە نیشانەی ئایندە (دە)بزوێنی هەیە . (هارین) لە وشەی لێکدراودا دەبێتە (دەستار) نەك (دەستهار) . (هاویشتن) لە لێکدراودا دەبێتە (رەشاوێژ)نەك (رەش هاوێژ) .

راهەژاندن بۆتە راژاندن

راهێڵ بۆتە رایەڵ

هەڵهاتن بۆتە هەلأتن

هەڵهێنان ، هەڵێنان

لەمەوە دەردەکەوێ ، تێ‌چوونی دەنگی هەمزە لەناوتوێژی وشەدا وەك تێ‌چوونی دەنگی (هـ)هیچ پێوەندی بە فۆنیم نەبوونەوە نییە : دیاردەیەکە دەچێتەوە بۆ سروشتی هەردوو دەنگ کە لە ژوورووی هەموو دەنگانەوە دێن . هەر بەپێ داخوازی فۆنەتیکیش وا چاوەڕوان دەکرێ دەنگی هەمزە کە ئاوازە دارە ئامادەترێ لە دەنگی (هـ) بۆئەوەی لە ناو توێژی وشەدا خۆی بەدەنگی ئاوازەداری بزوێن ببەخشێت .

ئەنجامی دوەم ئەوەیە کە لە زۆر وشەدا هەمزە و هێ بەیەکدی دەگۆردرێنەوە :

لە فارسی : أنار ، أنجیر ، أنگبین ، أنبان ، أبر ، آوردن

لە کوردی : هەنار ،هەنجیر ، هەنگوین ، هەنبان ، هەور ، هاوردن

ئۆدە بۆتە هۆدە

ئەیوان بۆتە هەیوان

ئەلووژە بۆتە هەڵووژە

ئاسان ، هاسان

ئێسك ، هێسك

چونکە دەنگی هەمزە و (ع) ئاوازە دارن بەیەکدی دەگۆردرێنەوە :

(ئاسمان – عاسمان) ، (ئەرز – عارد) ، (ئەزیەت – عەزیەت) ، (ئەژدەها – عەزیا) (ئەبابەیلێ – عەبابەیلێ) ، (ئەستەم – عاستەم) ، علیق – ئالیك) (عومەر – ئۆمەر – هۆمەر) ، ئەنتیکە – عەنتیکە) ، (ئەلەتریك – عەنەتریك) ، (ئەنەدۆڵ – عەنەدۆڵ) هەرچوار دەنگی (هەمزە ، هـ ، ح ،ع)کە لە قورگەوە دێن بزوێن بەدوا خۆیاندا دەهێنن . دوو دەنگی (ح ،ع)کە کوردی رەسەنیش نین دوای ئەمەی پەڕینەوە بۆ ئاخاوتنی کوردی هەمان دەستووری (هەمزە ، هـ)یان بەسەردا دێت . لە عەرەبی هەردوو دەنگ دەشێ بوەسێندرێن وەك (رعب ، نبع ، سبعی – رحب ،نحو ، رمح – بەلأم لەکوردیدا وشە نییە ئەو (ح ،ع)ە تێیدا بێ بزوێن بێت وەك ، عیو ، عەزیا ، حوشتر ،حەفت . .) ناو ناوەیەك نەبێ کە بەدوا بزوێندا دەوەستن وەك (پەح ،تەح – دەعبا «لە دابەوە هاتوە – مەعیەن «لە معین ەوە هاتوە . .)

ناشزانم وشەی (بڵح)لە کوێوە هاتوە بەخۆیو (ح)ی بێ بزوێنیەوە .

قسە لێرەدا لەگەڵ ئەو وشانەیە کە شکڵی کوردییان وەرگرتوە نەك وشەی عەرەبی کە وەك خۆی ماوەتەوە وەك (بەحر – بحر) .

له ئینگیلزیشدا دەنگی (هـ) وەك دەنگی (هەمزە) هەم لە بەرایی وشەوە دێت هەم بزوێن بەدوا خۆیدا دەهێنێت . وشە هەیە وەك (Re – hearsal) بەهۆی پێشگرەوە دەنگەکەی (هـ) تێیدا ناو توێژ بکا لەوانە بەولاوە زۆربەی هەرە هەرە زۆری دەنگی (هـ) لە فەرهەنگی ئینگلیزیدا دەکەوێتە بەرایی وشەوە .

وشە هەیە شکڵی (هـ)ی تێدایە بەڵام ناخوێندرێتەوە وەیا دەنگەکەی (هـ) پێش دەبەخرێ وەك (When, where) وشەی (Who) بە (هوو) دەخوێندرێتەوە . سەرەتای ئەو وشانەی بە (هـ) دەست پێ‌دەکەن وەهان :

(hy , hu, ho, hi, he, ha) واتە بزوێن دەکەوێتە پاشیەوە وەك هەمزە .

مامەڵەی فارس لەگەڵ (هـ)دا جودایە چونکە لەناو توێژو کۆتایی وشەدا دەردەکەوێ وەك (ئەهرەمەن ، نهادن ، بەهرە ، شاه ، ماه ، کوتاه ، ستوه) . .

بەهەمەحاڵ لە وێشدا دەکەوێتە دوای بزوێنەوە ، لە سەرەتای وشەوەش هەردەبێ بزوێنی بەدوادا بێت وەك دەزانین زمانەکان هەموویان یەك دەستووری دەنگسازییان نیە بۆیەیە ناشێ دەستووری ئەمیان بەبەڵگە دابندرێ بۆ ئەویان وەیا حوکمی دەنگسازی غەیری خۆی هەڵوەشێنێتەوە .

ناو ناوەیەك لە کوریدا (هـ ،ح)بە یەکدی دەگۆردرێتەوە وەك (هفت ، حفت – هەوا حەوا هونەر ، حونەر . .) .

لە کوردیدا ئەوەندی سەرنجم گرتبێ تەنها لە دوو وشەی (ئنجا نجم)دا دەنگی هەمزە لە بەرایی وشەدا بێ بزوێنی ئاشکرا هاتوە دیارە (ئنجا)ش بە ئەصل (ئەمجارە)بەلە کۆتایی وشەی کوردیشدا دەنگی هەمزە لە (نەء ،بەء)دا هاتوە کە گۆڕاوی (نا ،با)یە .

دەنگی (هـ)لەبەری سۆران و تێکرای کوردستانی خوارووداا بە دەگمەن نەبێ لەناو توێژی وشەدا نەهاتوە وەك (نهوم ، سەربهوردی –) . هەرچەند بەتەواوی لە زاری کرمانجی سەرووددا دەنگی (هـ)م بەتاقی نەکردۆتەوە بەڵام وابزانم لە وێدا بتر دەنگی (هـ) هەم بە وەستاوی و هەم لەناو توێژی وشەدا دێت لە کرمانجی سەرووددا مەیلێك هەیە بۆ وەستاندنی دەنگی بەرایی وشە تەنانەت (لە) دەکرێ بە (ل) ، ئەمەش تا رادەیەك لەو دەستورانەی دەنگسازیدا بەدەر دەداتەوە .

بەهەمەحاڵ ئێمە خەریکی دۆزینەوەی سەرجوملەی دەنگسازی کوردی نین ، خەریکین بزانین ئایا دەنگی (هەمزە)لە کوردیدا فۆنیمە یان نا ؟ لەو نموونانەی کە دەشیەنە ناو نووسینەوە ئەم مەبەستە روون دەبێتەوە . نموونەکانی زمانێکی وەك ئینگلیزی باشتر لە هی کوردیش وەرامی مامۆستا زلەکانی فۆنۆلۆجی دەدەنەوە چونکە بەلای ئەوانەوە بەرچاوترن ، ئنجا لە زمانێکیشدا هەڵدەهێنجرێن کە گوایا دەنگی (هەمزە) تێیدا فۆنیم نیە . یەکچوونی دەنگی (هـ) وهەمزە لەرووی هاتن‌و نەهاتنیان لەناو توێژی وشەی ئینگلیزیداو هاتنی بزوێن بە دوایاندا پتر یارمەتیمان دەدەن بۆ نزیك خستنەوەی دیاردەی (حروف الحلق) لەبەرچاوی ئەواندا چونکی لە زمانی ئینگلیزیدا تەنها ئەم دوو دەنگە هەنە لە گەرووەوە دەربچن پێنجەکەی دیکە لەوێدا پەیدانین ، هەر شتێکی لەبارەی (ح ،ع)ەوە بیڵێم ناگاتە بەر چەژی دەنگناسی ئەوان . بەهەمەحاڵ ئەو مامۆستایانە دەنگیشمان نەبیەن خۆ دەنگی ئەوان دەبیەین و زمانەکانیان تا رادەیەك دەبنە کێڵگەی تاقی‌کردنەوەی بیروراکانیان لەبەر رووناکی ئەو توێژینەوەی کە ئێمە بە بەڵگە تێیدا دەکەین بەو پێ‌یە لە نێوان خۆماندا رێمان هەیە دەنگی یەکدی ببیەین و ئەگەر شتێکی قەناعەت بەخشمان لەو مەسەلانەدا گوت لە یەکدی بسەلمێنین . من کە لەبارەی هاوچوونی هەمزەو (هـ) ەوە دەستورێکی دەنگسازی کوردیم رەچاوکرد دواتر زانرا بەڵگەی ئەو دەستوورە لە زمانی ئینگلیزیدا پتر دەست دەکەوێ رێم هەیە داوا لە دەنگناسی کورد بکەم چاو بە بڕیارەکانیدا بگێڕێتەو کەوا بە ئەسڵ لە دەنگناسی و دەنگسازی رۆژئاوای وەرگرتوون .

سەیری فەرهەنگی (المورد) بکەدەبینیت لە ئینگلیزیدا دەنگی هەمزە فۆنیمێکی وەهایە کە ئەژماری ئەو وشانەی بە هەمزە دەست پێ‌دەکەن پترە لە وشەی هەریەکێك لە دەنگەکانی دیکە . هەموو ئەو وشانەی بە (O,i,a) وئەوانی بە (e) دەست پێ‌دەکەن (جگە لە ٥٠ وشەیەکی eu کە دەبێتە «یو») سەرلەبەریان هەمزەیین ، بەشێکی زۆری ئەو وشانەی بە (U) دەست پێ دەکەن ئەوانیش هەمزەیین .بە حیسابێکی سەرپێیی پتر لە (٤٠٠٠ چوار هەزار) وشەی (المورد) هەمزەیی‌یە ئنجا چەند موعجیزەیەکی گەورەیە کە بسەلمێنین ئەو میللەتە لە کۆنەوە حەزی دەکرد وشەکانی بەبزوێن دەست پێ بکەن ، کەدیتی هاتنی بزوێن لەبەرایی وشەدا موستەحیلە هات و ئەم هەمزەیەی بە چوار هەزار وشەوە ناو بزوێنی بەدوادا راکێشا وموستەحیلەکەی پێ سەرنەرم کرد . عاجباتی هەرە عاجیاتیش لەوەدا ئەوەیە کە جاری نەیدەزانی دەنگسازی و بزوێن‌و کۆنسنانت چین چونکە ئەوسا نەخوێندەوار وکەرەوار بوو . . دەبێ جارێکی دیکەش جۆرە موعجیزەکاریەکی کردبێ کە هەمان رەفتاری لەگەڵ دەنگی (هـ) شدا کرد خۆ نەشی دەزانی هەمزەو (هـ) لە (حروف الحلق)ن ! !

دوو دەنگی (غ ،خ) کە ئەوانیش بەھی گەروو داندراون ، چونکە لە رۆخی بەرەو دەرەوەی گەرووەوە دەردێن و لە پیکی قوڕگەوە دوورن مامڵەتی کۆنسنانتی (ك ،گ)یان لەگەڵدا دەکرێت‌و ە بەرانی وشەوە بەوەستاوی (بێ بزوێنی ئاشکرا) دێن وەك (خزین ، خزم ،خز ، غریوە ، غژە ، غلۆر بوونەوە . .) بەلای ـوەری منەوە دەنگی (خ) بەحاڵ هی گەروە چونکە خۆی لە دەنگی (ك) دەخشێنێت ، تەنانەت بە هەوڵدان دەشێ دەنگی (ك) پشت (خ) بخرێتەوە وەیا (خ) بهێندرێتە واوەی (ك) .

هەر دوو دەنگیش بەیەکدی دەگۆردرێنەوە لەناو توێژو کۆتایی وشەوەش دێن وەك (ئاخ ،ناخ ،رۆخ ،پوخت ،سیخوڕ — داغ ، ـغ ، راغ ،جغز شەغەڵ . .) .

د .ئاورەحمان کە دەڵێ هەمزە فۆنیم نییە دەبوو ئەوزمانانەی بەلای خۆیەوە هەمزە تێیاندا فۆنیم نییە دەست نیشانیان بکات چونکە دەشێ دەنگێك لە زمانێکدا فۆنیم بێت و لەیەکێکی دیکە هەر پەیدا نەبێ .بە نموونە دەنگی (ض) هەر لە عەرەبیدا فۆنیمە . وەك دەزانم ەلای مامۆستاکانی رۆژاواش هەمزە لە عەرەبیدا فۆنیمە .لێرەدا جیاوازییەکی بنجی هەیە لە نێوان فۆنیم بوونی (ض ، هەمزە)لە عەرەبیدا : هەرچی دەنگی (ض)ە تایبەتی عەرەبییە ، بەلام کە هەمزە لە عەرەبیدا فۆنیم بێ و هەمان دەنگیش لە کوردی و غەیری کوردیدا هەبێ بۆچی لەوانیشدا فۆنیم نەبێ ؟

د . ئاورەحمان لەو بەڵگانەی بۆ فۆنیم نەبوونی هەمزە هێناوینەوە گۆڕانی دەنگی هەمزەیە بە بزوێن وەیا تێچووینەتی :

ئەم بەڵگەیە لە جیاتی من وەرامی خاوەنەکەی دەداتەوە نەك ـەخەی من و هەمزە دەگرێت چونکە لە کوردیدا کە دەماوەدەم بە ێژگەی مێژوودا بێ‌تۆمار کردن هاتۆتە خواری سوانی دەنگ و گۆڕانی ـەدەنگێکی دیکە دیاردەیەکە زەق زەق لە چاوان دەچەقێ . ئەو زمانانەی نووسینی کۆنیان هەیە دەق وشەو رستەو ئامێرو ئامرازەکانیان پارێزراون و دەبنە پێوانەی گۆڕان وسوانێکی لە ئاخاوتندا بەسەریاندا هاتوە . ئاخاوتنی ئێستاکەی فارسی کە بەسەر زاری فارسەکانەوەیە زور دوورە لە شێوە ئەدەبی فارسی (دەری) کە نە هەزار ساڵەوە پێ دەنووسرێت وپێشتریش لە سەردەمی ساسانیەکاندا پێ دەنووسرا زۆریش لە دەقەکانی ئەوسای ماون . جا ئەگەر بەراوردێك لە نیوان فارسی رەمەکی و ئەدەبی وەیا عەرەبی رەمەکی وئەدەبی .بکەیت دەزانیت چۆن تا رادەی سەرەوبن بوون لەیەکدی دوورن هەرچی کوردییە تەنھا شێوە ئاخاوتنی بەمیرات ماوەتەوە ، لە شێوەی کۆنی کەمتا کورتێکی بێ بایەخ نەبێ بەدەست ناکەوێت .ناوناوە لە ئاقێستاو پەهلەوی وشەی ئەوتۆ دێت لە

کوردی ئێستاکەدا هەیە و لە فارسیدا نەماوە یا هەر نەبوە وەك وشەی (گوشن ئەسپ) بەواتای (نێرە ئەسپ)کە لەوێدا وشەی (گوشن) بەواتای نێر لە شکڵی (گون) لە کوریدا بەردەوامەو لە فارسیدا نییە . لە فرێزی (ئەنووشە رەوان) بەواتای (بێ مردن گیان —نەمر—) وشەی (نووشە) کەبەواتای (مردن)ە لە کوردیدا بۆتە (نووستن) کەبرای مردنە و لە فارسیدا وێنەی نییە . . لەو تەرزە کەمتا کورتە بەولاوە کوردی کۆن وەجاغی کوێر بۆتەوە . ئنجا کە بێینە سەر باسی قرتان و گۆڕانی دەنگ لە کوردیدا هەمزەی بەستەزمان تێدا ون دەبێ چونکە هەتا بڵێی دیاردەیەکی بەرفرەوانە :

یەکێك لەودەنگانەی ی بۆ سوان و تێ‌چورن خۆش جڵەون دەنگی (ت)و دەنگی (د)ە .لە کرمانجی سەروودا هەموو (د)ی دوای (ر)تێ‌دەچێت وەك (مرن — مردن ،کرن — کردن . .) لە سلێمانی ئەم دەنگە بەزۆری کلۆر دەکرێت واش دەبێ بەدوا (ن) دا دەبێتە (گ) هەندێ جاریش بیستوومە دەیکەنە (و)وەك کە دەگوترێ (کاك ئەحمەو — لەجیاتی ئەحمەد—) .وشەی (مرۆ)و (مەرد)لەبنەڕەتدا یەك شتن . .دەنگی (ت) لە (د)ش خوش جڵەوترە بەتایبەتی لە دوا دەنگی (س)دا وەك : (دەستگا — دەزگا ، دەستك — دەسك دەستێنێ — دەسێنێ (دەسەنێ) ، دەست — دەس ، راست — راس . .) .

وشەی (هەڵبستە) بۆتە (هەستە) بەتێ‌چوونی (ڵ ، ب) وەیا (هەڵسە) بەتێ چوونی (ب ، ت) .

وشەی (ئێسقان)ی سلێمانی کە لە (استخوان)ی فارسیەوە نزیکە لەبەری سۆران بۆتە (ئێسك) . (خشەثرە پاونە)ی سەردەمی هەخامەنشی بۆتە (شارەوان) . لەزۆر باردا (فرۆشتن ، کرۆشتن)دەبێتە (فرۆتن ، کرۆتن) . لە نموونەکانی پێشووتردا دیتمان چۆن دەنگێك بە دەنگێکی نزیکی خۆی دەگۆڕێت ، یەکێك لەوانەش دەنگی هەمزە بوو .

بێ‌گومان مەیلی مرۆڤ بۆ ئاسان کردنی ئاخاوتن ، بەرەو سواندنی دەنگ‌و سووکتر دەربڕینیەوە دەبات هەر ئەم هۆیەیشە وەها دەکات رێژەی ناوی کارای تێ‌نەپەڕ لە زۆر شوێنی کوردەواریدا لە جیاتی (و) کەدەنگێکی قورسە (ی) بۆ بەکار بهێنن کە لەو سووکترە ئیتر لەجیاتی (نووستوو ، رۆیشتوو ،هەڵستاو)دەڵێن (نووستی ،رۆیشتی ،هەڵستای—) . بەری سۆران کە لامی قەڵەو دەکەن بە (ر) ی لاواز لەبەر ئەم هۆیەی سووك کردنی دەربڕینە . هەڵبەت دیارە (داخێوێ) لە (دەئاخێوێ) سووکترە هەروەهاش (بەرداش)لە (بەردەئاش)و (سەراو)لە (سەرئاو)هەروەك (هەستە)لە

(هەڵبستە)سووکترە .

ئەم تەرزە بەڵگەیە کە لە ئاست هیچ دەنگێکدا نەکراوەتە هۆی بڕیاردان لەسەر فۆنیم نەبوونی هەر بۆیە دێتە حیسابەوە کە لە سەرەتاوە بڕیاردراوە هەمزە فۆنیم نییە ، سەرەڕای ئەوەی کە بەدەنگی وەك خوی (هـ) نەگیراوە تا یەکچوونییان نیگارابکێشێت و هەنگاوی دوایین بۆ بڕیاری ئیعدام کردنی نەختێك بوەخرێ . بەڵگەی گۆڕانی دەنگ وەیا تێچوونی بۆ ئیسبات کردنی فۆنیم نەبوونی ئەو دەنگە ، بەتایبەتی لە کوردیدا کە زور لە دەنگەکانی دەسوێن و تێدەچن ، دەبێتە هوی ئیعدام کردنی زوربەی فۆنیمەکانی چونکە نابێ (قیامەت هەر لە بەرخی مەلا رابێ)و تەنها هەمزەی پێ ئیعدام بکرێ . بەشێك لە زمانەوانی کورد لە زاراوەی هەمزەش وەتەنگ دێن هەروەك لە زاراوەی (کسرة ، ضمة ، فتحة)ش قەڵسن ،گۆیا ئەمانە پاشماوەی سەردەمی دواکەوتنن ، کەچی هەر چوار زاراوە وێڕای ئەوەی کەمەبەست دەپێکن قسەش کورت دەکەنەوە . لە زمانەکانی رۆژاوادا وشەیەك نییە (همزە)ی پێ بناسرێ ، لەهیچ زمانێکی غەیری عەرەبیشدا زاراوەی هێندە کورت وسووك نییە کە کورتە بزوێنەکانی پێ بناسرێتەوە . ئێمە دەڵێین (کورتە بزوێنی واو . یێ) بۆ فەتحەش هیچ زاراوەمان نییە چونکە فەتحە کورت کراوەی ئەلف نییە . . ئەمانە دەڵێم بۆ راگەیاندنی دەوری لایەنی نەفسی مرۆڤ لە باسەکانی زانستی رووتدا .

ئەو بەڵگەیەی گۆڕانی دەنگی هەمزە لەو وشە عەرەبییانەدا کە دێنە ناو ئاخاوتنی کوردییەوە کە گۆیا ئەویش فۆنیم نەبوونی هەمزە نیشان دەدات تەنها لەو حاڵەدا قبوول دەکرێ کە دەنگی هەمزە لە کوردیدا نەبێت چونکە ئێمە کە لە ئاخاوتنی خۆماندا دەنگێکمان هەبوو و لە وشەسازیدا بەکار هات وبوە پێك هێنەری وشەو دەستەواژە و بە نەمانی واتا نەما چ پایەی کەم نابێتەوە بەوەدا کە لەبەر قورسایی دەنگەکە وەیا لەبەر شوێنی لەوشەدا بسوێت وبگۆڕێت چ لە وشەی کوردی بێت و چ لەوشەی بێگانە بێت . نموونەکانی کە د . عەبدوررەحمان لە عەرەبییەوە وەری گرتوون (دائم – دایم ،دائرة – دایەرە ، مسئلة – مەسەلە ،بئر – بیر) هەموویان هەمزەکەیان لەناو وشەدایە کە ئەمە هۆیەکی کافییە بۆ گۆڕینی دەنگەکەی هەمزە وەیا سواندنی چونکە لە کوردی خۆیدا هەمزە لە ناو وشەدا دەرناکەوێ ، ئنجا دەشزانین دەنگی (ی) سووکترە لە هەمزە ، بەڵام چونکە لە وشەی (مسؤول)دا دەنگی (و) بۆخوی قورسە رۆشنبیری کورد هەمزەکە دەهێڵێتەوە و نایکا بە (و) هەرچی نەخوێندوشن بەزۆری دەڵێن (مەنسوول) .لە وشەی (مەئیووس)دا هەمزە تێ ناچێ لە (رەئیس و مەرئووس)یشدا هەروەها . .

راستییەکەی هەموکوردێکیش نالێ (دایەرە ، دایم) بەڵام بەتێکرایی دەڵێن (قایمەکاری . .) . ئەمانە هەموو واز لێ بێنەو سەیرێکی ئەو وشە عەرەبیانە بکە کە بە هەمزە دەست پێ دەکەن وەك (ئەمیر ، ئەسیر ، ئیسپات ، ئیستراحەت ، ئەحەی ناصر ، ئوستاز ، ئوممەت . .) لە هیچیاندا دەنگی هەمزە ناسوێت و ناگۆڕێت چونکە لە بەرایی وشەوە دێت کەچی چونکی دانیشتووی سلێمانی حەز لە (یۆ . .) ناکەن بەزۆری دەڵێن (وێسف ،وێنان ،وێنە »«ناوی گۆڕاوی –یۆنە–) دوور نییە وشەی (وێڵ وتەرتیب)یش لە (یۆڵوتەرتیب)ەوە هاتبێت کە وشەکە تورکیە بەواتای (رێگە) . ئەو وشە عرەبیانەی هەمزەیان لە کۆتاییەوە دێت ، بەسەر زاری کوردەوە هەمزەکەیان لێ دەسوێت وەك (رجاء ، وفاء ، برئ ، ناشئ) کە دەبنە (رەجا ، وەفا ، بەری ، ناشی )چونکە ئەگەر کوردیش بانایە پێ هەمزە دەبوون .

سەیر لەوەدایە ئاخێوەری رەمەکی عەرەب لە هەندێ ناودا (هەمزەکاری) دەکات و دەڵێت (ئمحمد ، ئحسین ، ئستیفن) کە لەمانەدا هەمزەکە زیادییەکە دەوری فۆنیم نابینێت وەك کە لە کوردیشدا دەگوترێ (عەولای عومبەران) ئەو (ب)ە لەناوی (عمر)دا فۆنیم نییە چونکی واتا ناگۆڕێ یا خود کە (کساره) دەکرێتە (کەستارە) دەنگی (ت) لەوێدا فۆنیم نییە . .

ئنجا ئێمە لەبەر رۆشنایی واقیع و بیروڕای ئەو پرۆفیسۆرانەی هەمزە بەفۆنیم دانانێن وقورس کردن بەفۆنیم دادەنێن دەتوانین پرسیار و وەرامی ئەوتۆیی تەرتیب بدەین :

ئایا لە کوردیدا هەمزە دەنگە ؟
بەڵێ دەنگە .
ئایا کە تێچوو واتای تێ دەچێت ؟
بەڵێ تێ دەچێت .
ئایا کە بەدەنگێکی دیکە گۆڕدرایەوە واتا دەگۆڕێت ؟
بەڵێ دەگۆڕێت .
ئایا بەسڕانەوەی ئەو دەنگە کوردی ناتەواو نابێ ؟
بەڵێ ناتەواو دەبێ .
کەواتە ئەویش فۆنیمە وەك پ ،ف ،ل !
نەخێر فۆنیم نییە .
با بێینە سەر قورس کردن :
ئایا ئەو قورس کردنە بوونی سەربەخۆی هەیە ؟
نەخێر .
ئایا مومکینە تێ بچێت ؟
بەڵێ تێ دەچێت .

که‌تێ‌چوو واتا تێ‌ ده‌چێت ؟ده‌گۆرێت ؟
ـخێر نه تێ‌ده‌چێت نه‌ده‌گۆرێت .
ـ‌ێ که زه‌رووره‌تی مانه‌وه‌ی به‌سه‌ر چوو تێ‌ده‌چێت ؟
ـه‌بێ‌ له زۆر باردا به ناچاری تێ‌ ده‌چێت .
که‌واته فۆنیم نییه !
ـه‌بێ‌ فۆنیمه و ده‌بێ‌ نیگاریشی هه‌بێ‌ ! !

**تێبینی :**

له‌باره‌ی وشه‌ی (هه‌ناسه) :

دوای لێ‌بوونه‌وه له نووسینی ئه‌م گوتاره رێکه‌وت گێرامیه‌وه بۆ کتێبه‌که‌ی (فرهنگ ایران باستان) و له‌وێدا به سه‌ر وشه‌ی (أن – نه‌ن) دا که‌وتم که له ئاڤێستادا به واتای نه‌فه‌س هه‌ڵێنان هاتوه ، ئه‌وه‌وه زانیم که‌رتی (هه‌ن) له وشه‌ی (هه‌ناسه) دا ئه‌و (ئه‌ن) ه‌یه و هه‌مزه‌که‌ی گۆراوه به (هـ) نه‌ك وه‌ك من به هه‌ڵه بۆ شیکردنه‌وه‌ی چووم . . . ده‌مێنێته‌وه که‌رتی (اسه) له وشه‌که‌دا که نازانم له‌چییه‌وه هاتوه .

## بۆ راست کردنه‌وه :

له ووتاره که‌ی مامۆستا عبد الستار کاظم که له ژماره (٩٣) و (٩٤)دا بلاوکرابووه‌وه چه‌ند هه‌ڵه‌یه‌ك روویدابوو وا له خواره‌وه راستی یه‌که‌یان ده‌نووسین‌و تکای راست‌کردنه‌وه‌و لێبوردنمان هه‌یه له خوێنه‌رانه‌وه :

**ل – ١٧/ستوون – ٢ دێر – ١٨/١٧ راستی‌یه‌که‌ی :**

یان به پێچه‌وانه‌وه دووی بزوێن و یه‌کێکی کۆنسونه‌نتیان ده‌که‌وێته – نێوان .

**ل – ١٧/ستوون – ٢ / دێر ٢٣ راستی‌یه‌که‌ی :**

بوونی ده‌نگێکی بزوێن له نێوانی دوو ده‌نگی بزوێندا له تواناادا نی‌یه .

**ل – ١٨/ستوون – ١/ دێر ٢٢ ، ٢٣ راستی‌یه‌که‌ی :**

یاسای گونجان‌و نه‌گونجانی فۆنیمان (قانون التنافر و التوافق بین الفونیمات)

**ل – ١٩/ستوون – ٢/دێر ١٠ راستی‌یه‌که‌ی :**

یان له بنه‌ره‌تی مێژوویی یه‌وه له بزوێنێك له‌گه‌ڵ کۆنسۆنانتێکی تری قرتێنراوه‌وه وه‌رگه‌راوه .

**ل – ٢٢/ستوون – ١/دێر ٣٤ راستی‌یه‌که‌ی :**

دووباره کردنه‌وه نی‌یه .

**ل – ٢٣/ستوون – ٢/دێر – ٢٩ راستی‌یه‌که‌ی :**

بزوێنیش

**له ژماره (٩٤) یشدا** ل – ٣٤/ستوون ١/دێری ١٧ و ١٨ راستی‌یه‌که‌ی ئه‌وه‌یه بنووسرێ‌ (به راستی پاشگره) .

ل – ٣٦/ستوون – ٢/دێر ٢٨ راستی‌یه‌که‌ی (هاتمه‌س) .

ل – ٣٦/ستوون – ٢/دێر ٢٩ راستی‌یه‌که‌ی ئه‌و (ی) یه‌ی .

گرامەری تەقلیدی بەگشتی بایەخ بە ووشەو دارشتنی ووشە ئەدات . هەر ووشەیێك لە زمانا
قالبەکانی چینو لەچ رەگ‌و پاشگرو پێشگرێ یێك هاتووە و نژادی و ئەو قوناغانەی پیایا
تێپەڕبووە و ماناکانی چین . . . هتد . بێ ئەوەی دەوری پەیوەندی نێوان بەشە بنجی‌یەکانی
ستە . لە دەست نیشان کردنی قالبە جیاوازەکانی ووشە دەرخات .

یێکێ لە سەخترین و ئاڵۆزترین لایەن لە زمانا جیاکردنەوەی لێڤڵی مۆرفۆلوجی (دارشتنی ووشە)و لێڤڵی سینتاکسە (دارشتنی ڕستە) . ئەم سەختی‌یە – لە زمانی کوردی‌یا – لەم نموونەیەدا خۆی دەرئەخات :

ئایا (**ئەیانبینین**) ڕستەیە یا ووشەیە ؟

**١ – گەر ڕستە بێ پێناسینی ووشە چی‌یە ؟**

**٢ – گەر ووشە بێ پێناسینی ڕستە چی‌یە ؟**

بێ ئەوەی خۆمان بخەینە گێژاوی ئەم مەسەلەیەوە ، لەم قۆناغەدا وای لە قەڵەم ئەدەین کە گۆڕینی قاڵبی ووشە دوو هۆی هەیە :

١ – هۆی مۆرفۆلۆجی : هەندێ (ئەفیکس) (پێشگر و پاشگر و ناوگر) ئەخرێنە سەر رەگ و ووشەی زمانەکەوە بۆ دروست کردنی ووشەی تازەی تری خاوەن مانای تازە ، بێ ئەوەی ئەم ئەفیکسانە هیچ پەیوەندی‌یێکی ووشەکە بە بەشێکی تری ڕستەوە دەربڕن وەك (هەڵ –) ، (ڕا–) ، (–ەوە) ، (–ن)هتد .

**گرتن – هەڵگرتن**

**– ڕاگرتن**

**خواردن – خواردنەوە**

**نووست – نووستن . . .هتد**

٢ – هۆی سینتاکسی : هەندێ ئەفیکس ئەخرێنە سەر رەگ و ووشەوە بۆ دەربڕینی پەیوەندی نێوان ئەم ڕەگ و ووشانە بە بەشەکانی تری ڕستەوە . (وەك ڕاناوەکانی لکاو پەیوەندی‌ی نێوان بکەر وفرمان دەرئەبڕن) .

بۆ جیاکردنەوەی ئەم دوو لایەنە سەیری ئەم نموونەیە بکە .

(ن)ی(نووستن)لە ڕستەی

**ئەوان نووستن**

جیایە لە (ن)ی (نووستن) لە ڕستەی

**نووستن خۆشە**

(ن)ی یەکەم پەیوەندی نێوان بکەروفرمانی دەربڕی (واتا پاشگرێکی سینتاکسی‌یە) (ن)ی دووەم خرایە سەر ڕەگی فرمان بۆ دروست کدنی ناو . (واتا پاشگرێکی مۆرفۆلوجی‌یە) .

بەم جۆرە ئەبێ قاڵبە جیاوازەکانی ووشە لەناو چوارچێوەی ڕستەدا دەست‌نیشان بکرێت چونکە هەندێ دارشتن‌و گۆڕین بەستراوە بە گۆڕینی پەیوەندی ووشەکە بە بەشەکانی تری ڕستەوە . یێکێ لەم لایەنانە ، لە دارشتنی ئەو جۆرە فرمانانەدا دەرئەکەوێ کە بە (فرمانی بکەر نادیار – المبنی للمجهول)ناو ئەبرێت . یاسای گۆڕینی رستەی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار :




واتا :

١ – بکەر و ڕاناوی لکاو لا ئەبرێن

٢ – بەرکار دێتە خوار و جێی بکەر ئەگرێ بەڵام چەمکی (بەرکاری)ی خۆی‌نادۆڕێنێ .

٣ – ڕەگی داهاتووی فرمانەکە وەرئەگرێت و گەر کاتەکە رابردوو بوو (را)ی وەك پاشگرێ ئەخرێتە سەر ، گەر کاتەکە داهاتوو بوو (ڕێ) .

٤ – نیشانی جۆری کات (مەبەست لەمە (ئە)ی هەمیشەیی و (بوو)ی رابردووی . .هتد) شوێنی خۆی ئەگرێ .

٥ – بە پێ‌ی کەس وژمارەی بەرکارەکە ڕاناوێکی لکاوی ئەخرێتە سەر – فرمانەکە وەك تێنەپەڕ خۆی ئەنوێنێ .






کرمانجی سەروو سیستەمێکی جیاواز لەم رووەوە پێشان_
ئەدات :




**واتا**

١ – بکەر و راناوی لکاو لائەبرێن

٢ – بەرکار دێتە خوار .

٣ – چاووگی فرمانەکە وەرئەگیرێت .

٤ – (هاتن –ە)زیاد ئەکرێ و ئەخرێتە نێوان بەرکار و فرمانەوە .

٥ – کاتی فرمانەکە لەبەر فرمانی (هاتن) ئەکرێ .

٦ – بە پێی کەس وژمارەی بەرکارەکە راناوێکی لکاو بە فرمانی (هاتن)ەوە ئەلکێنرێت . وەك




**تێبینی**

گەر فرمانەکە لە کاتی داهاتوودا بێ و بەرکار بە راناو دەربرابێ ئەوە راناوەکە لە کۆمەڵی (من – تە . . .هتد)ئەبێ . کە رستەکە گۆررایە رستەیێکی بکەر نادیار راناوەکە ئەبێ بگۆرێت بە کۆمەڵی (ئەز – تو . .هتد)–



مصلح جلالی

**عبداللەی کوڕی خەبابی کوری ارت کە باوکی سەحابەبوو خۆشی لە مەدائن نوێنەری علی بوو . . کاتێك شوراتەکان هەڵیان کوتایە سەری‌و خوێ وخێزانەکەیان کوشت . . علی نە لەشکری ناردەسەریان‌و نەهەرەشەشی لی‌کردن وبەقسەی خۆش لە گەڵیاندا خەریك بوو کە ئەوەی ئەم کارەی کردووە شوراتەکان بیدەن بە علی و کەچی ئەوانیش وەڵامەکەیان ئەوەبوو کە ئێمە هەموومان ئەم کارەمان کرد . . . بەڵام نامەونامەکاری‌و چاویەیەك کەوتنیان لەگەڵ علی داهەبوو . . ئەم گفت‌وگۆ ونامەو نامەکاری‌یە توانیان کە هەندێك کۆمەڵ لە شوراتەکان والی بکەن بگەڕێنەوە لای علی و ئەوبەشە زۆرەشی کەمایەوە وازیان لە گفت‌وگۆو نامەونامەکاری لەگەڵ علی‌داهێناو بەدەنگی بەرزیی هاواریان ئەکرد (رۆشتن رۆشتن بۆ بەهەشت) .**

بەڵام ابی ایوبی انصاری کە لە لەشکرەکەی علی دابوو ئەو ئالآیەی هەڵکرد کە ئەوەی‌بگەڕێتەوە لای لەشکرەکەی علی ئەواهیچی لیّ ناکرێ‌و ئەوەشی کەواز لەم کۆمەڵی شورانە ئەهێنی‌و بۆ خۆی ئەچێتەوە کوفەو مەدائن ئەویش هەر هیچی لیّ ناکریّ چونکە ئێمە نامانەویّ خوینتان برێژین وبتانگوژین ئەم قسانەی (ابی أیوب) تارادەیەك کاریان کردەسەر خەڵکەکەو یەکیّ لەوانە ( فروەی کوری نوفلی ئەشجەعی) بوو کەوتی بەخودا نازانم چ بیانوویەك بە علی بگرم‌و شەری لەگەڵدا بکەم . . ئەم پیاوە بەخۆی‌و پێنج سەد پیاوێکەوە شوراتەکانی جیّ هێشت‌و شوێن علی‌یش نەکەوت‌و هەردوولایانی بەجیّ هێشت‌و دوای ئەمانە دوو هەزار کەسیّ لە شوراتەکان گەرانەوە لای علی .(١)

**عبداللەی کوری وەهەبی راسبی کە شوراتەکان لەبەر ئەوەی زۆر نوێژی ئەکردوو زۆریش خواپەرست بوو لەماڵی زەیدی کوری حسینی کواو عبداللەی کوری کوانی‌یە شکری وعروەی کوری جەریرو یەزیدی کوری عاصی مەجازی بە ئیمامی خۆیان هەڵیان بژاردو بەشی زۆریشی لەبەر ئەوە بوو بە دڵیان بوو چوونکە شارەزابوو** (رای) راستی هەبوو بەپیرکارەوە زوو ئەچوو بەوەناسرابوو کە نەفرەتی لە هەردوو لایەنی تەحکیم کردبوو علی بەکافردانابوو .

وتی : علی تەحکیمی خوی‌اپشت گویّ خست‌و پیاوان حوکم ئەدەن‌و هەر ئەمیش بوو کە لەشەری نەهرەواندا سەرکردەی شوراتەکان بوو شەری لەگەڵ علی داکرد .(٢)

کاتیّ کە عبداللەی کوری وەهەبی را-بی بە لەشکری شوراتەکانەوە هێرشی هێنایە سەر سووپاکەی علی هاواریان ئەکرد (ئەچین ئەچین بۆ بەهەشت) علی کە ئەمەی دی بەلا یەنگیرانی خۆی وت : ئەگەر هێرشیان هێنا پێش ئەوەی بگەنەسەرتان ئێوە وەرنە دواوە . . سووپاکەی علی لەبەر توندی هێرشی شووراتەکان خۆیان پیّ نەگیراو بەشێك بەلای چەپ‌و بەشێك بەلای راستدا لایانداو رم وتیر هاوێژەکانی سووپای علی بەرەنگاریان راوەستان‌و لایەنگیرانی علی وردە وردە لێیان نزیك بوونەوە تاتێکەلاوی یەکتربوون‌و شەرەکە گەرم بوو . بەڵام لەشکری شورات بەرگەی ئەم شەرەی نەگرتوو هەموویان کوژران .

حەکیمی کوری سعید وتی :– پاش ئەوەی کە تووشی شەر لەگەڵ خەڵکی نەهرەواندا هاتین هەروەك ئێمە پێمان وتبن بمرن مردن‌و لە سووپای علیش لە حەوت کەس زیاتر نەکوژراو (حرقوسی کوری زهیر) لەناو کوژراوەکاندا هێنرایە دەری‌و عبداللەی کوری وەهەبی راسبی کەمیری شوراتەکان بوو لەگەڵ عبداللەی کوری کوانی یەشکریدا کوژران‌و شیتی کوری رەبعیش گەرایەوە ژێر ئالآی علی .(٣)

جا ئەگەر بگەرێین بۆ ئەو هۆیانەی کە علی‌یان ناچارکرد لە نەهرەواندا شەر لەگەڵ شوراتەکاندا بکات زنجیرەیەك شتمان دەست ئەکەویّ کە پێش بەرپابوونی ئەو شەرە شتی گەورە بوون‌و هۆی سەرەکیش بوون بۆ بەرپابوونی ئەو شەرەو لەوانەش : پێش شەری نەهرەوان علی لایەنگیرانی خۆی راسپار دبوو کە هەموو شوراتێك خەلەو دەغڵودان چی بەر بکەویّ بیدرێتی‌و سەرپێچیان لی‌نەکریّ بەمەرجیّ ئەوانیش بی‌دەنگ بن‌و خراپەو دەستدرێژی بەرامبەر خەڵکی نەکەن‌و

حز ئەگەر هاتوو دەستیان درێژکردیان خراپە یەکیان بەرامبەر خەڵکی ... ئەبێ بەرەقترین شێوە وەلاّمیان بدرێتەوە .(٤)

ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترە وەشەری ناو خۆ هەبوو شوراتەکان زیاتر ...وروژاندو تاوە ناتاوێ بەسەدەها هەزارەهایان لەشوێنێکدا ...ئەچوونەوە کەخۆیان دەستنیشانیان کردبوو ئەکەوتنە شالاّو بردنو علی ... کردن . . علی‌یش جایان خۆی یاخود کارگێرێکی خۆی ... ئەیەراندنو هەموویانیان ئەکوشتن .

**بەلاّم ئەوەندەی پێ نەئەچوو کەسەر لەنوێ درووست ئەبوونەوە . ...سا ئەکەین : ئەشرەسی کوری عوف شەیبانی کە شۆرشی بەرپا کردوو ...ی لایەنگیرەکانی کە هەموو کوژران ، هێندەی نەخایان هیلالی ...ی عەلقەمەی تەمیمی شۆرشێکی بەرپا کردوو علی هێشتا لەمیان ...و بووەوە کە ئەشهەبی کوری بشری بجلی یاخی بوو و کە لەمیشیان ...ا سەعدی کوری مەعقەلی تەمیمی شۆرشی کردوو هێشتا لەمەیشیان ...ر بووەوە کە ئەبو بەکری حویکی سعدی شۆرشی بەرپا کرد . .**

...شەکەی ئەم ئەبو بەکرە لەگەڵ شۆرشی ئەوانی تردا جیاوازی هەبوو ...کە ئەو لەشکرەی کە لەگەڵ ئەم سەرکردەیەدا بوو هەموو عەرەب ...وونو خەڵکێکی زۆری نەتەوەکانی تریشی تێدا بوو)

ئەم سەرکردەیە بەوهێزە گەورەیەی شوراتەوە کە لەدەوری ...بوونەوە سوپای علی‌یان راونایە دەوروبەری کوفە وشپرزەیان ...رد . . .

علی کە ئەمەی بینی هات سوپایەکی زۆر گەورەی درووست کردوو ...رەنگاریان وەستاو شکاندنی . . بەم پێیە شۆرشی شوراتەکان دژی ...ی لە شەری صفین تا شەری نەهرەوان خایاندیو علی توانی چەند ...سێکیان نەبێ هەموویان لەناو بەرێتو ئەم چەند کەسەش هەندێك ...نەوە بەنۆ کەسیان لەقەڵەم ئەدەنو . (بەلاّم هیچ دوور نیە کە ئەم ...رەیە موبالەغەی تیا کرابێو ئەوەی کە ئێمە تێبینی بکەین ئەوەیە کە مێژو شۆرشەیەك لەدوای‌یەکانی شوراتەکانە کە دژی دەوڵەتی ئەمەوی ...رپایان ئەکرد .) (نووسەر) ، دوان لەو نۆکەسە چوونەتە عەمانو ...وانیان چوونەتە-کرمانو دوانیا چوونەتە سجستانو دوانیان جزیرەو ...کێکیان چۆتە یەمەن .(٦)

علی وای زانی کە شوراتەکانی هەموو کوشتووەو رزگاری بووە لێیانو ...ری بەتەواوی بۆ راست بۆتەوە . . چونکە ئەوانەی کوژرابوون هەموو ...تی خۆی لە صفین‌دا دلسۆزی علی بوونو ناسرابوون کە عیراقی بوونو خەڵکی شاری بصرەو کوفە بوونو هەمووش کەس‌و کارو کورو براو ...وکی ئەوانە بوون کەلە لەشکرەکەی علی دابوون . . تەماشا ئەکەین (عدی کوری حاتەمی طائی) خۆی لە سوپاکەی علی دابوو کەچی کورەکەی کەناوی (زید) بوو لەگەڵ شوراتەکان بووەو کوژراوەو ئەمەش یەکەم هۆبوو کە لەشکرەکەی علی خەفەت دایگریێو چپ‌و هۆری تێبکەوێو معاویەش لەو لاوەکە زانی علی خۆی بۆ شەر لەگەلاّ کردنی ئامادە ئەکات پێش علی خۆی لە صفین قایم کردبوو چاوەروانی ئەنجامی شەری نەهرەوانی ئەکردو کە علی گەرەایەوە (نخیلە)ی نزیك کوفە بۆ ناو سوپاکەی معاویە بەو پەری کامەرانیەوە گەرایەوە شام .

**شەری نەهرەوان لە مانگی سەفەری (٣٨)ی کۆچیدا واتە (١٧)ی تەموزی (٦٥٨)زاین دەستی پێ‌کردو پاش ئەم شۆرشە زنجیرەیەك هەستانو شۆرشی شورات سالأنی (٣٩-٤٠)ی کۆچی روویانداو ئەم شۆرشانە بوونەهۆی کوشتنی علی بەدەستی یەکی لە شوراتەکان کە ناوی (عبدالرحمن کوری ملجمی مرادی) بوو مێردی ژنێك بووناوی (قطام) بوو ، ئەم ژنەکەس‌و کارەکەی هەموو لە شەری نەهرەواندا لە ناو چوو بوونو کەشووی کردووە بەم (عبدالرحمن)ە**(٧) .

**وەك گێرراوەتە وەسێ شتیدا داولێ کردووە کە ئەبێ بۆی بکات . یەکەم ئەوە بووە کویلەیەکی پیاوی هەبێو دووەم کویلەیەکی ئافرەتی هەبێو سێ‌یەم ئەبێ علی بکوژێت .**

وەك مێژوو نووسان دەریان خستووە ئەشعەث کەسەر کردەیەکی سوپای علی بوو لە کوفە بوو پێش شەری صفین بۆ دوژمنایەتی کردنی علی معاویە هەڵی ئەخەڵەتێنێو نەخشەی کوشتنی علیش هەر لەو سەر دەمەدابووە چونکە کوری ملجم ئەچێتە کوفە لەماڵی (ئەشعەث) دائەبەزێ .(٨)

کوری ملجم رۆژی (١٧) رەمەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچی بە شمشێرێکی ژەهراوی تا ئەتوانێ شمشێرێك لە تەوقی سەری علی ئەداتو بە دەنگی بەرز هاوار ئەکاتو ئەلێ : علی حوکمدان هەر بۆ خوایەنەك بۆتۆ . . ئەمەش لەو دەمەدابوو کە علی ئەچوو بۆ مزگەوت بانگی بەیانی بدات . .

ئەوەی جێی سەرنج راکێشان بێ ئەوەیە لە ئەحکامەکانی شووراتدا لایەنی ناوەندی گرتن نەبووە . . دەستەی راست ئەوانەبوون کە باوەریان هێناوەو دەستەی چەوتیش کافرن .(٩)

لێرەدا ئەبێت لای خاڵێکی گرنگ لادەین . . ئەویش ئەوەیەکە بیروباوەری شوراتەکانو لە ئاین تێگەیشتنیانو راستی و پاکی ئەوئالاّ ئاینیانەی هەڵیان گرتووەو روانینیان بەرامبەر ئەوەی لە گەڵیان نیەو کۆنو نوێ دەمە تەقێ زۆری لەسەر کراوە .(١٠)

لەم شتانەش بەخشینی ئەو ئاینداریە کە هەڵە ئەکاتو ئەم بەخشینەش وەنەبێ هەڵوێستی ئەوشوراتانە بووبێ کەبوونە بەردی

بناغەی شورات یاخود هەموو شوراتەکان بوبێ بەڵکو ئەم هەڵوێستە هی ئەو تاقمەو شکەیە کە لە شوراتەکان جیابوونەوەو مەبەستم لێرەشدا (مەرجەئەیە) . کە هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو باوەرهێنەرەی هەڵەی گەورەی کردووە ئەوەیە کە ئەبێ لەم دنیایە ببەخشرێ‌و حوکمی بەسەردا نەدرێ‌و بێ‌پرسینەوەی هەڵەکەی بخرێتە رۆژی قیامەت‌و هەر ئەم هەڵوێستەشیانە کە ناویان بە (مەرجەئە) ببەن و ئەم ناوەش وەك مێژوو نوسان (١١) بۆی چوون دوو مەبەست ئەگەیەنێ یەکەمیان دواخستنی حوکمدانەکەیەو دووەمیشیان بەخشینی ئەوەیە کە هەڵەکەی کردووەو لای (مەرجە ئەکانیش) لەرووی عەقڵی‌یەوە ئەم دوو مەبەستە بەیەکتری ئەگەنەوە وەك :

حوکم بەسەر هەڵەکاردا بخرێتە رۆژی حساب و مەبەستیش لەم کارە ئەوەیە کەنیاز پێش کردەوە بکەوێ .

ئەوی تریشیان واتە (خراپە لەگەڵ ئایندا بێ‌زیانە هەروەك چۆن کفرکردن خودا پەرستنیشی لە گەڵدابێ کەڵکی نیە . ) واتە کەسێ بروای بەخودا وپێغەمبەرو قورئان هەبێ ئەم هەڵەیەی لە ئاینەکەی بێ بەشی ناکات‌و کافرێکیش تەنیا خوا پەرستنێك نایباتە ریزی ئەوانەی کە باوەریان هەیە .

هەروەك لە سەرەتا پیشان دراکارەساتەکانی شەری جمل وصفین بوون بوونە هۆی درووست بوونی گیروگرفت‌و ئەم گیرو گرفتەش ئەوانە ئەگرێتەوە کە پێ‌یان ئەوتن بایەخداران بەهەڵەی گەورەو ئەمانەش ئەوانەبوون هەردوو لای شەری صفین‌یان بەکافرداناو لەم رایەیانا جیاوازیان لە نێوان گەورەو بچووکدانە کردووە و ئەم هەڵوێستەشیان لەناو خۆشیان‌و دەستەکانی دوای خوشیانا دابووە بیرێکی سیاسی دیارو بەلاٌم لە دنیای زانیاریدا کەوتە گێژەنگی مێژووە وە وبێ‌سەرو بەرمایەوە .

مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە بەراوردی ئەو هەڵوێستانەی شوراتە کەسەبارەت مافی سیاسی مرۆڤ بوویانە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی کە لەبەریتانیا دوای ئەوان سەری هەڵدا .

گەلی بەریتانیایی سەدەی حەڤدەهەم وای بۆ روون بوو بووەوە کەمەلێك شارلی یەکەم تاوانی ئەوەی کردووە دەستی بۆ مافی خەڵکی بەریتانیا درێژ کردووە . . لەسەر ئەمە لێ‌ی راپەرین‌و داوای لەسێدارەدانیان کردوو لە سێدارەشیاندا . . لە مێژووی بیری ئینگلیزیدا دوو فەیلەسوفی سەبارەت بەم حوکمدانە بەسەر شارلی یەکەمدا راست بوونەوە . . یەکێکیان بەرگری کردن بوو لەو مافەی کەمەلیك هەیەتی‌و مەلیك بۆی هەیە چۆنی بۆبلوێ وارەفتار بکات‌و فەیلەسوفەکەی تریشیان بەرگری کردن بوو لەگەلی بەریتانیاو گەل ئەبێ هەمیشە ئاگاداری کردەوەکانی مەلیك بێت‌و ئەگەر مەلیك هەڵەی کرد بۆی هەیە دایگرێ‌و لەسەر تەخت لایبەرێ .

فەیلەسوفی یەکەمیان (ترماس هوبز) بوو وتی : لەبەر ئەوەی مەلیك لەلایەن گەلەوە هەڵبژێرراوە مەلێك بۆی هەیە چۆنی ئارەزووکرداوا رەفتار لە موڵکی خۆیدا بکات . . ( مەبەستمان لە قسەکان ئەوەیە کەمەلیك هەڵەی کردووە چونکە هەڵە بەسەنگی شوراتی‌یەکان لەکاردا بکێشرێ کە حوکمی لەسەر بدەین . . ئەی ئەو سەنگە لە کوێ دەس ئەکەوێ کە مەلیك ئەوەندە دەسەلاٌتی بالاٌبێ دەسەلاٌتێك لەسەرووی ئەوەوە نەبێ‌و بارای خەڵکیش هەر چی‌یەك بێ ئەو بەپێ‌ی ئەو یاسانموونەیانەی خوی هەیەتی قسە ئەکات‌و ئەجووڵێتەوە) .

**فەیلەسووفی دووەمیان (جون لوك) شتی زۆر وت‌و ئەوەشی روون کردەوە . . مەلیك ئەبێ نوێنەری خواست‌و قازانجەکانی گەل بێت‌و ئەشێ واله قەڵەم بدرێ کەلەلایەن ئەوانەوە هەڵبژێرراوە لەبەر ئەوە ئەگەر مەلیك هات لەرێ‌ی راست لایدا گەل مافی ئەوەی هەیە لەسەر تەخت لایباتو یەکێکی تری لەجێگە دانێ .**

ئەم نموونە هێنانەوەیەمان بەراوردێك بوو لە نێوان بیروڕای فەیلەسووفەکانی بەریتانیاو ئەو بیرورایەی کەشوارتەکان بەرامبەر بەهەڵەی گەورە بوویانە (١٢) چونکە دەستەکانی شورات بەکافر دانانی ئەوانەی لە شەری صفین‌دا حکمیان پەسەندکرد بەکافردانانی هەموو ئەوانەی بە حوکمەکە قایل بوون لەبنەرەتا ئەو هەڵوێستەی (جون‌لوك) ئەگرێتەوە کەوتی سەردار ئەگەر هات لەرێ‌ی راست لایدا مافی گەلە کەلای بەرێ‌و بۆشی هەیە کە لەناو خۆیدا یەکی هەڵبژێرێ شایستەی باوەر پی‌کردن بێ .

شوراتەکان لە گەرمەی کاریاندا بۆوە دێهینانی ئەو ئامانجانەی هەیانە . . ئەم گەرم بەپیرەوە چوونەیان تووشی هەڵەی کردن‌و هەڵەکانیشیان زیانیان بەبیروباوەرەکانیان گەیاند‌و سەرهەڵدانی ئەم هەلانەشیان لەوکەلێنەوەسەریان هەڵدا کەپێ‌ی ئەلێن تەسکی ووشکی بیرو باوەری ئاینی . (١٣)

لە نووسینی (فجر اليقظة القومية) دا دەرکەوتنی شورات‌و ئەو شورشانەی کە سەردەمی ئەمەوی عەباسی‌یەکان یەك بەدوای یەکدا کردوویانەو ئەوباری ئابوری‌یەی کەبووەو ئەوستەمکاری‌یەی کە بەرامبەریان کراوە بەدوورو درێژی شی کراونەتەوە ، لێرەدا لادانێك لەوبیرو باوەرە سەرەتای‌یەی پێغەمبەر(د .خ) هاتە پێشی کە بۆیەکسانی موسوڵمانەکان بەچاو پۆشین لەنەژادیان پێکی هێنابوو ، هەروەها ئەوەشی شی‌کردۆتەوە کە شوراتەکان سەرەتای سەردارانی بەر هەڵستکارانی

عەرەبن و والی وکارگێرەکانی دەوڵەت جەوروستەمیان بەرامبەر کردوون و بە بەراوردکردنیان لەگەڵ پارتەکانی تری موسوڵمانان لە مافیان کەم کراوەتەوەو لەگەڵ ئەوەشدا کە قوربانی زور گەورەیان داوە بەلاّم بەزەبری ئەو دەسەلاّتەی کە ئەو سەردەمانە هەبوون کە شوراتەکان شورشیان دژ ئەکردن مێژووکەشیان تەفروتوونا کراوە ولەناوبراوە .

دیسان لە نووسینی ناو براودا ئەوە ئەلێ کەوەك پارتێکی سیاسی رێکخراو شیعە هەبوو . . ئەودەمە دژی کاز بەدەستان بوو . .

ئەم پارتەش دوای کوشتنی علی کوری ابی طالب دەرکەوت و بەلاّم ئەم درووست بوونەیان نەك هەر لەخواستەکانی بزوتنەوەی شۆرشگێری یەکەمجاریان دووری خستنەوە بەڵکو هەندێ جار ئەو تاق کردنەوانەشیان بەتەواوی ئەشێوان کە لەوەوپێش دەرسیان لێوەرگرتبوو . . جاوەك نووسینەکە ئەیگێرێتەوە پێش ئەم پارتە سیاسی‌یە ی شیعەو پێش کوشتنی علی هەبوو . . ئەم پارتە کۆنە لەویژدانی کۆمەڵی عەرەبدا ئەژیاو بۆرخاندنی کار بەدەستانی ئەو سەردەمە جا ئایا ئەوکار بەدەستە ئەمەوی بوایە یاخود عەباسی تێ ئەکۆشان و مەبەستیان زیندووکردنەوەی دەسەلاّتی گەل و ئەو تاق کردنەوەوا نەبوو کە رژێمی دەربەگایەتی سەردەمی ئەو دەسەلاّتدارانە گۆرەو شاریان دابوون ودەستیان نابووەبینیان و ئەو پارتە سیاسیەش پارتی شورات بوو .(١٤)

ئەو گۆرانە سیاسیانەی کە ئیمپراتوریەتی موسوڵمانان بەخۆیەوەیینی ، شوراتەکانیش وەك پارتێکی سیاسی سەر بە خۆو خاوەن سەردارو چەکدارو دەوڵەتدار وخاوەنی رژێمی سیاسی و کۆمەلایەتیان بەخۆیانەوە بینی . . خەیاتیشیان دژی ئەو رژێمە ئەرستۆکراتی‌یەتە بوو کە هەموو نیازێکی پەرەپێدانی رژێمی دەرەبەگایەتی بوو پووچ کردنەوەی ئەوقسانە بوو کە بەناوی پێغەمبەرەوە (د.خ) کرابوون و نەشیان ئەویست کە قوریشی‌یەکان کاری موسوڵمانەکان بەرێو بەرن و بیروباوەری دیموکراتی‌یەکاینشیان ئەوەبوو کە خەلیفە ئەبێ بەپێی لێهاتوویی هەڵبژێررێ وخەلافەت نابێ بەپێی تیرەگەرێتی بێ و پشتاو پشت بوی بێتە خواری و هەموو موسوڵمانێکیش بوی هەیە خۆی بۆ ئەو شوێنی خەلیفەیەی کە مەبەستە پالاّوتە بکات . .(١٥) دروشمێکیشی بەرز کردەوە کە ئەبێ ئەوانەی بەپێست و بەنەژاد لەیەکتری جیان و موسوڵمانن بەیەك چاو تەماشا بکرێن و جیاوازیان لە نێواندا نەکرێ و ئەبێ لەرووی ئابووری‌یەوە (مافی خودایی) یەکسان بن و ئەم بیرو باوەرەشیان ل مێژووی موسوڵمانێتی پێش خۆیان و سەردەمی خۆشیاندا کە لە رژێمێکی کۆماری ئەچێت نەبووە .

شوراتەکان یەکەم بزوتنەوەی سیاسی عەرەب بوون و بە چاوی جیاوازی‌یەوە تەمەشای ئەوموسوڵمانانەیان نەئەکرد کە لە نەتەوەکانی تری غەیری عەرەب بوون و سوپاکەشیان لەعەرەب ولەنەتەوەکانی ترو کۆیلە پێکهاتبوو بێ جیاوازی وەك یەك لەش دژی دوژمنەکانیان ئەجەنگان و لەوانە نەبوون تەنیا هەر بۆشەر پێویستیان بەکویلە هەبێ و یاخود دڵخوشیان بدەنەوەو بەجەنگاوەری پلەی دووەم تەماشایان بکەن و بخانخەتە دوای سووپاوە .

بێجگە لەم شتانەی کە لەبیروباوەرکەیاندا بوون لە بزوتنەوەکەیاندا نەك ئافرەت تەنیا هەر دەوری بووە بەڵکو وەك پێویست و هاندەر جەنگاوەر بوو مەیدانی جەنگی ئەبینی و خاوەنی هەموو مافێکی خۆی بوو وچۆن پیاوەکانی شورات لەلایەن کارگێرەکانی ئەمەوی و عەباسی‌یەوە تووشی چەرمەسەری ئەهاتن و نموونەی ئازایەتیان ئیستاش باسی ئەکرێ . . ئافرەتەکانیشیان بەو پێیە تووشی چەرمەسەری و ناخۆشی ئەهاتن .

(عبد اللەی کوری زیاد) کارگێرێکی دەوڵەتی ئەمەوی بوو لە عیراقداو والی‌یەکی دەرکەوتووبوو ، ئافرەتێکی شوراتی گرت ودوای ئازاردانێکی زۆر هەردوو دەست و هەردوو قاچی بریەوەو لەبازاردا فرێی دا(١٦) .

سروشتی دیموکراتی کە پێکهێنەری بنەرەتی رەفتاری بزوتنەوەی عەرەبەشێوەی ئاشکرای ئەم دیموکراتی‌یەمان لای شوراتەکان دەست ئەکەوێ و ئەوهۆزانەش وەك تەمیم و حەنیفەو رەبیعە کە بەلای شوراتەکاندا لایاندا پێش پەیدابوونی موسوڵمان خاوەنی مێژوویەکن کەپریەتی لەشەیدا بوونی سەربەستی و ئەو دیموکراتی‌یە یەکە ئاینی موسوڵمانی لەسەر پێکهێنرا .

زیادی کوری باوکی خۆی (باوکی نەزانراوەکی‌یە) بەرامبەر بە شوراتەکان ئەڵێ : ئاگروپووشوو بۆسووتان چەند لەیەکتر نزیکن قسەی ئەم شوراتانەش لە دڵ لەوەش نزیکترە .

لە مێژووی شۆرشگێری .موسوڵماناندا ئەوەی کە بزوتنەوەکانی شوراتیان پایەدار کردوو .ئەو هەموو شەوقەیان بە بیروباوەر کەیان داو ئەونەمری‌یە مەزنەی بۆشەهیدەکانیان هێنایەکایە . . هی ئەوەیان نەبووە کە خاوەنی بیروباوەر بوون یا خود خۆیان بەبەردەوام بووی تاق کردنەوەکانی موسوڵمانی ئەزانی و یاخود بیروباوەرەکەیان دوو دەوڵەتی شوراتی پێکهێنابێ کە یەکێکیان شوراتی ئەزارقە بوو لە ئەحوازو دووەمیان دەوڵەتی شوراتی (النجدات) بوو لە دوورگەی عەرەب .

بگرە لەبەر ئەوە بوو کە تەنانەت لای دوژمنەکانیشیان خوشەویست بن چونکە لەگەڵ هەموو بزوتنەوەیەکی شۆرشگێری تری عەرەبدا جیاوازی ئەوەیان هەبوو کە ئەمان واتە شوراتەکان هەمیشە ئەیانویست ئەو بیروباوەرەی هەیانە بلاّوی بکەیەوەو ئەودەوڵەتە دەرەبەگایەتی‌یەی

کەبووە لە ناوی بیەنو لەشەرەکانیشیاندا کە دژی دەوڵەتی ئەمەوی یاخود عەباسی کردوویانە ناوبانگی ئازایەتیو سڵ‌ەکردنەوەیان دەرکردووەو بە (شێرەکانی عەرەب) ناوبراون و نەیان ئەویست ئەو بیروباوەرەی هەیانە ئاشکرای نەکەنو بیشارنەوە(١٥) .

سەرداری شوراتەکان (ولیدی کوری صریف) لەوشەرەیداکە دژی عەباسی‌یەکان سەردەمی خەلافەتی هارونە رەشید لەخاکی جزیرەدا کردی ئەڵێ :

أنا الولید ابن طریف الشاری قسوره لایصــــطلی بــــناری
جورکم أخرجنی من داری

هەروەها مەرداسی کوری ئەدیە کە یەك یەکێکە لە پاڵەوانەکانی شوراتو یەکێکە لەو کەسانەی کەمەردایەتیو شەهید بوونیان گەورەترین شوێنەواریان لەدەروونی خەڵکیدا جی‌هێشتی .

کاتێك زیاد کوری باوکی خۆی والی ئەمەوی‌یەکان بوو لە عیراق وتارەرەشە پرستەمکاری‌یەکەی خوێندەوەو وتی : (بی‌تاوانیان ئەبێ تاوانبارو چاکەکەیان ئەبێ خراپ بکەم) ابو بلال بەرەنگاری وەستاو ئایە تێکی قورئانی خوێندەوە کە ئەفەرموێ (وابراهیم الذی وفی . الا تزر وازرة وزر الأخری . وان لیس للأنسان الا ماسعی) وبە پی‌ی ئەم ئایاتە نکولی لەوەکرد کە سیاسەتو حوکمدارێتی راست‌هەبێ .

أبو بلال یەکێك بوو لەو کەسانەی کە پاڵەوانو ئافرەتانی دلێری شوراتەکان لەبەردەمیا بکوژن دەنگ نەکات و چاودانەخات ، لەبەر ئەوە ئالأی شۆرشی دژی ئەمەوی‌یەکال هەڵگرتو بەرامبەری لەشکری ئەمەوی راوەستاو لە شەری (ئاسك) داشکاندنی .

بەلأم سەرکردەکانی دەوڵەتی ئەمەوی ئەوانەی کە بەجەنگ نەیانتوانی ابی بلال بشکێنن . . لەکاتی دابەستنی نوێژداکاتی‌کە ابو بلال ولایەنگیرەکانی بەرەورووی خودا لە کرنۆشدابوون لە لایەن سوپای ئەمەوی‌یەوە هێرشیان کرایەسەروو هەموویان کوژران .

ئەم کارەپیرۆزەی ابی بلال مرداس کوری ئەدیەکە لەسەری کوژراو لەبەر ئەوەشی کە لەسەر راستی شەهید بووەو لە پێناوی ئامانجو بیروباوەرەکانیدا دلێرانە تێکۆشاوە وای لەلایەنەکانی تری ناشوراتیش کردووەکە بەیەکی لە خۆیانی دابنێنو موعتەزە لە وای دائەنی کەلەوانەو گەڵی رەفتاری پاڵەوانێتی وسالاری ئەگێرنەوە .

ئەوەی کە لێرەدایە خەمان بگرێو هانمان بدات بپرسین ئەگەر بوونی شورات بریتی بێ لەوەی کە پارتێکی دادوەرو کۆماری‌و ری‌ی ئەوەدا کە مرۆڤ باوەری پی‌هێناوە کسان بی‌و باوەری راستی سەرەتاو سەردەمی موسوڵمانی بن بەرامبەریان ئەبی‌بۆ شێواندنو ئاڵۆزکاری هەبێ کە بەشی زۆری مێژوونووسانو پشکنکارانی کۆنی عەرەب کردوویانە ؟

ئێمە بەلامانەوە وایە وەرگرتنی ئەم هەڵوێستە نازانیاری و بێ ویژدانانە بەزۆری لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بوون .

١ – مێژووی شوراتەکان ئەومێژوو نوسانە ئەیاننووسی کە خۆیان پیاوی دەوڵەتی ئەمەوی عەباسی بوون و دیارە ئەبێ کەدووژمنی شوراتەکان بن ، شوراتەکانیش خۆیان چونکە هەمیشە ئەیانویست پەرە بەبزوتنەوەکەیان بدەن و لەبەر ئەوەش کە هەمووکات سەرقاڵی شەرو شۆرش بوون ماوەی ئەوەیان نەبووە کە مێژووی بزوتنەوەو مەبەستەکانی خۆیان بنووسینەوە . . لەگەڵ ئەمانەشدا ئەومێژوو نووسانە بەزەبری ئەوشەرو شۆرش‌و گەمارۆ دانەو ئەوژیانە سەرەتای‌یەی کە شوراتەکان ئەیانکردوو بەرپایان ئەکردوو هەیانبوو نەیانتوانی دان بەوەدا نەنێن کەشوراتەکان تەقەللایەکی زۆریان داوە کە ئامانجەکانیان وەدی بهێنن . . دیسانەوە لەو شیعرانەشیان کە کەمێکی دەست کەوتووە . . یاخود بڵێین نووسراوەتەوە پلەی زانیاری‌و شارستانی‌بەتیەك کە ئەوسەردەمە بووە بۆمان دەرئەخەن .

٢ – ئەوتوندو تیژی‌یەی کە لەلایەن دەوڵەتو ئەو قەلاچۆ کردنە بە کۆمەڵەی کە لەلایەن علی کوری ابی طالب و کاربەدەستانی بە نی‌ئومەیە یاخود عەباسی‌یەکانەوە بەرامبەر بەشوراتەکان ئەکران ئەمانەگشت زیاتر رقی شوراتەکانیان هەڵسان و خستنیانە نارەحەتیەوەو کەوتنە سەرئەو رێگەیەی کە پی‌ی ئەڵێن تۆڵەسەندن و ئەمەش وای لی‌کردن تووشی هەڵەبن‌و لەو بیروباوەرەی کە هەیانبوو چەندە دەستەیەکی لی‌جیابنەوەو لە ئەهوازو خاکی نیمچە دوورگەی عەرەب‌و باکووری ئەفەریقاو چیاکانی جەزائر چەند دەوڵەتێك پێکبهێنن . (١٨) .

ئەم هەڵانەش کە ئەنجامی ئەوشتانەی لێیان دواین کە تووشی شوراتەکان هات بەلایەن مێژوونووسانی ئەوسەردەمەوە باشترین هەل بووە کەدەستیان کەوتووە بۆ ئەوەی هەزار ئەوەندەی تری پێوەنێن‌و لەبەرچاوی موسوڵمانە ساوێلکەکانیان بخەنو مەبەستیشیان لەمەدا لێدانی بیروباوەرەکەیانو ئەو دەورە دلێری‌و شۆرشانەبوو کە لەپێناوی بزوتنەوە بیری‌یەکەیاندا پی‌ی هەستابوون .

سەرچاوەیەك(١٩) ئەوەمان بۆ ئەگێرێتەوە کە رەفتارو ئازایەتی‌و پاکی شوراتەکان کارێکیان کردووە بنە جی‌ی رێزو شانازی گەلێ ناودارو کەسانی ئاینی زانیارو سەردارەکانیشیان وەك ابو عبیدەی کوری معمر کوری مثنی‌و خلیلی کوری احمد فەراهیدی کارێکی ئەو تۆیان کردووە کە خەڵکی بەتەواوی باوەریان پی‌بکەنو لە دڵیاندا جێگەی

خۆشەویستی‌و ڕێزیان بۆ بکەنەوەو ئەڵێ :

وەك بۆمان دەرکەوتووە پارتی شورات لەرەگەوە بزوتنەوەیەکی میللی بووەو ئەبێ لاش نەدەین لەوەی کە ئەم بزوتنەوەیە خاوەنی فەلسەفەو بیروڕای کی عەقلانی بووە بەلاّم بۆ سەرفراز کردنی ئەو بیروڕایەو بۆ ئەم مەبەستەش زۆر توند دەستیان بەم بیرو باوەڕەوە ئەگرت . . ئەم بیروباوەڕانەی شورات وەك هەموو بیرو باوەڕێکی تر کە لەولاّتانی تردا هەبوو ئەمیش توانی زۆر لە ڕۆشنبیران بەلای خۆیارا بکێشی‌و زۆر لە زانیارو ئەدیبی سەردەمی عەباسی‌یەکانیش لایەنیان گرتوون‌و لەگەڵیاندابوون . . بەلاّم نەیانئەتوانی کە لە سنووری ئەوڕۆشنبیری‌یەی کە دەورەی دابوون بچنەدەرێ چونکە هەروەك لە ناخەوە بەرهەلستکاری دەوڵەتی عەباسی بوون بەلاّم نان خۆری دیوەخانی خەلیفەبوون و سۆزی خەلیفە ئەیگرتنەرە .

هەروەك سەرچاوەیەك دەری خستووە (١٦) کە بەناوبانگترین مژدەدەری شوراتەکان فەیلەسووفی ناسراوو زمان رەوانی بەناوبانگ أبو عبیدەی معمری کوری مثنی بووە . ئەم سەرچاوەیە پەنجە بۆ بەرێز (المرتضی) رائەکێشی‌و ئەڵێ .

«أبو حاتم پێ‌ راگەیاندین‌و وتی : أبو عبیدەی معمری کوری مثنی لەسەر رای شوراتەکان بوو بەلاّم ئەیشاردەوەو دەری نەدەخست» و (ثوری)یش وتی ئەگەر بمویستایە تۆزێ دڵی أبو عبیدە کەیف خۆش بکەم باسی شوراتەکانم بۆ ئەگێرایەوە . . ڕۆژێك لەحەوشەی مزگەوت دانیشتبوو چومەلای . . چاوی لەزەوی‌یەکەی بەردەمی خۆی بڕیبوو . . سلاّوم لێ‌کرد کەچی هیچ وەلاّمی نەدامەوە . . منیش ئەم شیعرەم خوێندەوە .

ومـا لـلـمـرأ خير فى الحيـاة      اذ مـا عـد من سقـط المتـاع

(ئەم شیعرەش هی قطری کوری فجائەی سەرکردەی بە ناوبانگی شوراتە – نووسەر) . گە گوێی لە شیعرەکە بووسەرنجێکی دام وتی : باشە ئەزانی ئەو شیعرە هی کێ‌یە ؟ وتم : شیعری قطری‌یەوتی : دەك زمانت لال بێ ئەی بۆنەت وت أبو نعامە (نازناوی قطری بوو – نووسەر) .

پاشان میری باوەر هێنەران أبو عبیدە پێ‌ی وتم : ئەم قسەیە لای کەس مەدرکێنە . . منیش بەڵێنم دایەکە ئەبێ هەر گڵ لێم بییە .

ئەوەی کە جێ‌ی سەرنجە ئەوخاڵە گرنگەیە کە ئەو دەستە ئاینیانەی کە لە ناو ئاینی موسوڵماندا پەیدابوون پاشماوەی‌یان تا ئەمڕۆش هەرماوە .

بەلاّم هەندێکی تریان پاش ئەوەی کە ئەومەبەستە بنەرەتی‌یەی هەیانبوو بە هۆی توند دەست بە بیروباوەڕ گرتن‌و زۆر ڕۆشتنەوە نەماو خۆشیان پووکانەوەو بەرەونەمان چوون ، لەمانەش معتزە لەو ئەشاعرەو ظاهریە بوون . . ئەوانی کەشیان کەمانەوە شیعەیە بە هەرسێ لقەکەیەوەو ئیمامی‌و زەیدی‌و ئیسماعیلی‌و هەندێ تیرەی کەبوون کەچوونە باکووری ئەفەریقاو باشووری ڕۆژهەلاّتی عەرەبی‌و کەمێ دوورکەوتنەوەو . . ئەوەشی کەبیەوێ بەدوای ئەم دابڕانەیان لەیەکتری بگەرێ . . ئەبێ ئەم دابڕانەیان لەیەکتری بەسەرنجی ڕاستی‌و مەبەست وەربگرێ وئاگاداری ئەوەبێ تیرەکانی ئیستاو ڕوگە بنەرەتی‌یەکانیان بێ تێکەڵاویان نەکات چونکە ئەم دوورکەوتنەوەیە لەیەکتری بە پێ‌ی دۆخ‌و ئایدۆلۆژی‌و ئامانجی ئەم دەستانەبووە[٢٠]

پەراویزەکان

١ – نووسەرێکی نەناسراو تأريخ الخلفاء (دەستنووس) ل – (١٠٦)
٢ – الشهرستانی الملك والمنحل ل (١٩٩)
٣ – نووسەرێکی نەناسراو هەر ئەو سەرچاوەیە
٤ – طه حسين الفتنه الكبرى
٥ – نووسەر
٦ – ستودارد ، لوثرپ حاضر العالم الأسلامی – بەرگی ٣ ، ٤ ل (٣٢٦)
٧ – ستودارد ، لوثرپ هەر ئەو سەرچاوەیە
٨ – ناجى حسن الخوارج بين البداوة والتحضر ل (٣٠٩)
٩ – زكى نجيب محمود المعقول واللامعقول في تراثنا الفكرى – القاهرة . دار الشروق ل (٤٨ ، ٥٠)
١٠ – زکی نجيب محمود هەر ئەوسەرچاوەیە ل (٥٠)
١١ – زکی نجيب محمود هەر ئەو سەرچاوەیە
١٣ – زکی نجيب محمود هەر ئەو سەرچاوەیە
١٤ – محمد عمارە فجر اليقظة القومية – القاهرة – القاهرة للثقافة العربية ل (١٣٧ ، ١٣٨)
١٥ – محمد عمارە هەر ئەو سەرچاوەیە ل (١٣٩ ، ١٤٠)
١٦ – محمد عمارە هەر ئەو سەرچاوەیە ل (١٤٠ ، ١٤١)
١٧ – محمد عمارە هەر ئەو سەرچاوەیە ل (١٤١ ، ١٤٢)
١٨ – محمد عمارە هەر ئەو سەرچاوەیە ، ل (١٤٦ ، ١٤٧)
١٩ – دائرة المعارف الأسلامية بەرگی هەشتەم – مادە الخوارج ، ل (٤١٤ ، ٤٧٦)
٢٠ – هادى العلوى التراث الأسلامي (مناقشات مع مستشرق معاصر) گۆڤاری العلوم ژمارە (٢) ساڵی سیازدەی ١٩٦٨ ل (١٥)

# قەڵاکەی هەولێر

خالد رسول

ئاشکرایە کە قەلاّکەی هەولێر کەلەپورێکی بەنرخ‌و پڕ شانازیی ئێمەیە ، ئەو بڕیارەی کە لەم دوایی یانەدا درا بۆ دەست هێنان بەم قەلاّیەدا لە خۆیدا هەولێکی پیرۆز و پڕ دڵسۆزی‌یە . . لێپرسراوانی ئەم ئەرکە تا ئێستا هەندی ئیشیان تیا کردوەو خۆیان لەگەلّ ماندوکردوە جا لێرەدا کە هێشتا ماوەی ئیش تیا کردنی ماوە حەزم‌کرد ئەم ووتارە بەنرخەی گۆڤاری «ئەرخیتوکتورا – المعمار»ی پۆلّندی بخەمە بەرچاو کە ئەندازیاری شارەزا (هنریك چڤیتسکی) نووسیویەتی وە لە باسەکەی‌دا «شیرین احسان شێرزاد» یارمەتی داوە ، وە باسەکە تەرخان کراوە بۆ ژیاندنەوەی قەلاّی هەولێر وەکو مەلّبەندێکی گەشت‌گوزاری‌و کەلەپورێکی رۆشنبیری . مەبەستی من لە خستنە پێش‌چاوی ئەم ووتارە ئەوەیە کە زۆر تێبینی‌و بۆچوونی ووردو بەنرخی تیا دەست‌نیشان‌کراوە کە لێپرسراوان ئەتوانن ئەمڕۆ بۆ ژیاندنەوەی قەلاّکە سوودی لیّ وەربگرن جگە لەوەی ئەم باسە لە خۆی‌دا شتێکی معماری‌و هونەری نەتەوەکەمانە .

(ئەرخیتکتورا) گۆڤارێکی مانگانەی پۆلّندی‌یە وە (هنریك چڤیتسکی) پێشان مامۆستایەکی شارەزا بوو لە دانشگەی ئەندازیاری بەغدا ، ووتارە دوورو درێژەکەی لە سەرەتادا باسی (خانووبەرە) لە عێراق‌دا ئەکات‌و ئەلّیّ : ئەو کێشانەی بەستراوە بەو گۆڕان‌و رۆشنبیری‌یانەوە بەگشتی‌و بە خانووبەرەوە بەتایبەتی مایەی بایەخ‌پێدان و سەرنج ڕاکێشانە ، ئەم گۆڕانانە بەستراوە بە رووداوی کۆمەلاّیەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌یەوە ، هەروەها پێویستی گونجاندنی شێوەی فێرکردنی (معماریەکان) لەپێناوی گونجاندنیان‌دا لەگەلّ ئەم گۆڕانانەدا .

ئنجا لە پرۆژەیەکی تایبەتی‌دا «کە ئەم وێنەیەی لەگەلّدا بلاّوکراوەتەوە» دێتە سەر باسی هەولێرو ئەلّیّ : بەم شارە ووتراوە (شاری چوار خوا) – أربا ئەیلو) کە بە کۆنترین شار ئەژمێرریّ لە جیهاندا کە نیشتەجیّی خەلّك بووە لە کاتێکا کە (نینوی) و (نمرود) دوو دیّی بچووك بوون‌و لە سالّی ٤٠٠ پ . ز دا لەناوچوون . هەولێر بە شارێکی بەهێزو دەولّەمەند ناسراوەو لەویۆە (ئەسکەندەری مەکدۆنی لە سالّی ٣٣٣ پ . ز دا هێرشی بردۆتە سەر بابل‌و وولاّتی فارس .

شاری هەولێر گەیشتە ئەوپەری پێشکەوتن لە چاخی عباسی‌یەکاندا کاتیّ کە مزگەوت‌و بازاری تیا دروست‌کرا . هەولێری ئێستاش ئەکەوێتە دەشتێکی پان‌و بەرینەوە کە (قەلاّ) کەوتۆتە ناوجەرگەیەوەو بەرزی‌یەکەی (٢٥) مەتر ئەبێت کە لە شێوەی دەوری‌یەکدایە .

کێشەی زیندوکردنەوەی قەلاّی هەولێر کێشەیەکی جیاوازە گیروگرفتی سەرەکی کە تووشی معماری‌یەکان‌و ئەندازیارەکان ئەبێت ئەوەیە کە بە چ رێگەیەك بتوانریّ زیندو بکرێتەوەو بەشێوەیەك کە یەکێتی و شێوازەکەی تێك نەچێت وەکو شێوازێکی شارستانی کۆن ، ئەو ڕایانەش کە (شیرین) دەری بڕیوە بۆ نووسەر چەند بیرورایەکی پەسەندی تیایە لەوانە :

١ – گەڕاندنەوەی بیناکردن بە ڕژێمی (خشت لەدوای خشت) بەبیّ گۆڕینی بەرزی (جۆری ناوەند – نوعیة الوسط) بەگشتی وە (جۆری بینین – النوعیة البصریة) .

٢ – چاودێری ئەوەی کە پارێزگاری‌کردنی بەشێوەیەکی هەلّبژێراو بێت وە ریّی هەبێت بۆ گۆڕین .

٣ – چەند کاروبارێکی نویّی بخرێتە ناو بۆ دروست‌کردنی حەستەیەکی زیندوو وە دیاری‌کراو کە پەیوەندی هەبێت لەگەلّ



شارەکەو ناوچەکە .

٤ – کەمکردنەوەی هاتووچۆی (سەیارە) تیایدا تا ئەوپەڕی توانا .

ئەو نرخە سەرەکی‌یەی کە ڕەچاوکراوە لە کاتی دانانی نەخشەکەی (تصمیم) دا دیمەنی شارەکەیە لەناو قەلاّکەوە کە بە توخمێکی سەرەکی ئەژمێرریّ بۆ دیمەنێکی کراوە وە بۆ دیمەنی شارە پی‌گەیشتوەکە لە دەوری قەلاّکە ، ـوە لەدانانی نەخشەکەی‌دا ئەمانەش ڕەچاوکراوە : .

– هێشتنەوەی شێوەی پتەوو جیای قەلاّکە کە لە ئەنجامی پەرەپێدانی پلە بە پلەی بەستراو بە ڕژێمی تایبەتی‌یەوە .

– هێشتنەوەی توخمە ڕەسەنەکانو ناوچەیی‌یەکانی وە پەیوەندی‌یان بە ناو خۆیەوە .

• – خۆ بەستنەوەیەکی توند بە یاسای (تسویە) وە بۆ شی‌کردنەوەی باری ئێستای .

– چاودێری‌کردنی هێڵی دروست‌کردن .

– ئامادەکردنی بەرنامەیەکی پەیوەندی‌دار [پەیوەندی شەقامو دەرگاکان بە دیوارەکانەوە وە سەربانی ڕەق بە نەرمەوە وە سەوزایی بە ڕووبەری گشتی‌یەوە] .

دیسان نووسەر دەست‌نیشانی هەندیّ خانووبەرەی پێویستی کردوە لە نەخشەکەی دا لەوانە مەڵبەندی رۆشنبیریو هۆڵی پیشان‌دانی هونەریو موەزەخانەی ئەتنۆگرافیو هۆڵی محاضراتو کتێبخانەو شانۆو خانەی خزمەتگوزاری گەشت‌گوزاریو دوکانو بازاڕو ورشەو میوانخانەو مەڵبەندی تەندروستیو قوتابخانە وە پۆلیس‌خانە .

مامۆستا چفیتسکی ووتارەکەی کۆتایی پیّ هێناوە بە چەند تێبینی‌یەکی گشتی لەبارەی کەلەپووری خانووبەرەی ئیسلامی کە لە باسەکەی‌دا هاتووە بۆ دوو پرۆژەی خانووبەرە کە تیا داوای دروست‌کردنی معمار لە ناوخۆدا کە جوانیو ڕێك‌وپێکی تیا بێت لەنێوان یاساکانی ڕژێمی جیّو شوێنو منطق کە لە پێویستی‌یەکانی ناخی مرۆڤەوە هەڵقولاّبێت .

# زانستی کۆمەڵگا

وەرگێرانی : د. کاوس قفطان

## زانستی کۆمەڵگا ناسین قوتابیانو کۆمەڵگا .

یەکێك لەو دیاردانەی لەم ماوەی دووایەیەدا سەرنجی مامۆستایانی دانشگای زاکێشاوە . ئەوەیە قوتابیان سەریان کردۆتە سەر خوێندن و لێکۆڵینەوەی زانستە کۆمەلگاییەکان . بەتایبەتی زانستی کۆمەلگا ناسین .

ئەمەش هەر ئەو قوتابیانە ناگرێتەوە کە پسپۆری لەم یان لەو لقی زانستەکانی کۆمەڵگا ناسیندا پەیدا ئەکەن . بەڵکو قوتابیانی زانستەکانی تریش ئەگرێتەوە . وەکو زانستی پزیشکیو ئەندازەیاری . چونکە گرنگێتی گورانە کۆمەلآیەتیەکان خۆی لە دۆخی تەندروستیو نەخۆشیو چەند پرۆژەیەکی ئەندازەیاریشدا چەسپاندووە . بگرە لێکوڵینەوەی کومەڵگا ناسین بووەتە بنکەیەکی بنەرەتی لە چوارچێوە فراوانەکەی نەخشە دانانو پێگەیاندندا . ئەوی راستی بێت ئەم دیاردەیە تەنیا لە وولآتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکاندا نی یە . بەڵکو ژمارەیەکی زۆری قوتابیانی دەولەتە ساوا تازەپێگەیوەکا نیش روویان کردۆتە ئەم زانستە .

لەبەر ئەمە پێویستە بەرپرساوانی نەخشەدانانی خوێندنی دانشگایی‌و خوێندنی بەرز لەم وولآتانە ئاورێکی تەواو لەمە بدەنەوە . بە جۆرێك سوودێکی باشترو زۆرتر لەم توانا لاوە ببینن لەرێی پێگەیاندنێکی پێکەلی ئابووریو کۆمەلآیەتی . کارکەرانی زانستە کۆمەڵگاییەکان بە شێوەیەکی هەمەجۆری هاتن بە دەنگ ئەم دیاردەیەوە . لەوانە گوێدان وئاوردانەوەیەکی تەواو لە دانانی کتێبی خوێندنو لیکۆڵینەوە کە بەم جۆر یان بەو جۆر ناوەرۆکو کێشە هەرە گرنگەکانی زانستی کۆمەڵگا ناسین بخاتە بەردەمو لە هەمان کاتیشد تینوێتی قوتابیان بۆ ئەم زانستە بشکێنێ . ئەم کتێبەی بەردەمیشمان یەکێکە لەو نموونانە کە پێویستی ئەو داخوازییە ئەخاتە بەردەم رەنگە ئەو شتەی لەم کتێبەکەدا نوێ بێت ، ئەوەبێ نووسەر قوتابیانی بەشی

زانستی کۆمەڵگا ناسی لەم پلانەیەو لە دانانی ئەم کتێبەیدا نەخستبێتە پشتگوێ ، ئەمەش بە ئاشکرا لەو نازناوە دا دیارە کە بۆ ئەم کتێبەی داناوە : « زانستی کۆمەڵگا ناسین . قوتابیانو کۆمەڵگا» . بەو نیازەی پێویستی بەیەکەوە بەستنی زانستو زانستخوازو کۆمەڵگا دەستنیشان بکات ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەمانە بەردی بناغەی زانسی کومەڵگا ناسینو لەهەمان کاتیشدا ئەنجامەکەیەتی . (جیرۆم رابۆی) نووسەر لە نووسینەوەی ئەم کتێبەیدا سوودی لە تاقیکردنەوەکانی خۆی لەکاتی دەرس ووتنەوەی زانستی کۆمەڵگا ناسین دا دیوە . ئەندامی دەستەی مامۆستایان بووە لە دانشگای کالیفورنیا لە شاری لوس ئەنجیلوس ، لەبەر ئەوە گومان نییە ئەم لیکۆڵینەوەیە ، بریتییە لە تیشك دانەوەی گیروگرفتە بنکەییەکانی زانستی کومەڵگا ناسینو گوێدانو ئاوردانەوەی قوتابیان لەم زانستە ، لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دا . بەلام ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە ئەم ، کتێبە یان کتێبی تر سوودی لە وولاتە عەرەبەکاندا ، بۆ ووتنەوەی ئەم زانستە نەبێت . بە تایبەتی ژمارەیەکی زۆری قوتابیان روویان کردۆتە ئەم زانستەو هەر لەبەر ئەمەش گورجییەکی تەواو هاتۆتە کایەوە بە نیازی دانانی کتێبی لێکۆڵینەوە لە زانستی کۆمەڵگا ناسیندا .

پێش هەموو شتێك نووسەر ، باسی ئەو هۆیانە ئەکات کە بوونەتە هاندەریو پاڵیان پێوە ناوە بۆ دانانو نووسینەوەی ئەم کتێبە . لەم رووەوە لەوە ئەدوێ کە دە ساڵ پێش دانانی ئەم کتێبە زانستی کۆمەڵگا ناسین لە ئەمەریکا جموجۆڵێکی گەورەی تێ کەوتبوو بەرادەیەك دیاردەیەکی نوێی خستە بەردەم ، کە بریتی بوو لەوەی ، لە توانادا نییە بەیەك جۆر شێواز ئەم زانستەی پێ بخرێتە بەردەم قوتابیانی نوێ ، بەتایبەتی ئەم قوتابیانە چاویان لەوەوەیە ، ئەو شتانەی دەربارەی کۆمەڵگاو دەوروبەرەکەیان فێری ئەبن راستیو پاکێتی تێدا بێت . بەرای من ئەم ئاوردانەوەو گوێدانەی قوتابیان بەم زانستە بەشدارییەکی گەورەبوو بۆ پەیدابوونی رێبازێکی نوێو جیاواز لە ووتنەوەی ئەم زانستە داو بەشداری بوونێکیش بوو بۆ رێ پاك کردنەوە بۆ ئەوەی رێبازێکی نوێ لە دانانو نووسینەوەی ئەم زانستەدا بێتەکایەوە .

بەلام هۆی تریش هەن دەستیان هەبوو بۆ ئەوەی لەم چەند ساڵەی دوواییدا کتێبی خوێندنو فێرکردنی زانستی کومەڵگا ناسین بەم ژمارە زۆرە پەیدا ببن . لەمانە پەرەسەندنی ژمارەی ئەو کەسانەی بەم زانستەوە خەریکن جا لە چوارچێوەی تیوریابێت یان پراکتیکدا . جگە لەوەی ژمارەی قوتابیانی ئەم زانستە تەواو پەرەی سەند . ئەوەی خەڵکیش بەم جۆرە بەرەو ئەم زانستە رائەکێشا ئەوەیە ئەم زانستە راستەوخۆ لە دۆخی ژیانی کۆمەلایەتی ئەکۆڵێتەوە . جا لەبەر ئەوەی ژیانی کۆمەلایەتی ی هاوچەرخ ، لەچەند لایەن روویەکەوە کەم کووریو لەچەند لایەنو روویەکی تریشەوەبۆشیو بێناوەرۆکی پێوە دیارە ، لەبەر ئەمە ، ئەوانەی لە چوارچێوەی ئەم زانستەدا کار ئەکەن ناچار ئەبن هەوڵو کۆششی خۆیان ئاراستەی ئەوە بکەن ، نموونەیەکی پاراوەی تەواوی کۆمەڵگاو بەشەکانی تری کۆمەڵگا بخەنە بەر دەمیانو راستو رەوان شییان بکەنەوە .

کەواتە ئەم کتێبە ، هەر وەکو خاوەنەکەی ئەیبینێ . هەوڵدانێکە لەبەر تیشکی زانستی کۆمەڵگا ناسین بۆ لێکۆڵینەوەی کێشە هەرە گرنگو پێویستەکانی ئەم چەرخەی تیا ئەژین . لەبەر ئەمە بەردی بناغەی لێکولینەوەکە بریتییە لە رێکخستنی کۆمەلایەتی .

جگە لەمەش لێکۆڵینەوەی زانستی کۆمەڵگا ناسین لە وانەیە یارمەتی قوتابیان بدات هەموو ئەو شتانە گەلاڵەبکەن کە بەلایانەوە گرنگەو ئاوری لێ ئەدەنەوە بگرە وایان لێ بکات جارێکی تر ئەو ئاوردانەوە وشت نرخاندنەیان دابرژێننەوە . ئەوانەی لە چوارچێوەی ئەم زانستەدا کار ئەکەن تەنیا گوێ نادەنە وەسفو شی کردنەوەو تێگەیشتنی کردارەکانی ژیانی کۆمەلایەتی . یان چۆن رێکخستنە کۆمەلایەتیەکان لە رێیانەوە پێ ئەگەن ، ئەنجود چۆن برە کۆمەلایەتیەکان پێك دێن ، یان ئەو هۆیانە چین وائەکەن ئەم برانە پەرش بینەوە . راستە بەشێکی زۆری لێکۆڵینەوە کۆمەلایەتیەکان ، دەربارەی ئەو دیاردانە ئەدوێن کە بەپەیوەندی نێوان خەڵکانەوە بەستراوەو هەرچەندە ئەم دیاردانە بەشێکی گرنگی لێکۆڵینەوەی رێکخستنی کۆمەلایەتین . بەلام جێگای ئەم لێکۆڵینەوەیە ناگرێتەوە . لەبەر ئەمە دەسەلات نەبوو ، ئەبووایە لێکۆڵینەوەی تاكو لێکۆڵینەوەی رێکخستنی کۆمەلایەتی لەیەك جیابکرێنەوەو ئەو راستییە دەربخرێت چۆن ریکخستنی کۆمەلایەتی ئەتوانێ یارمەتی شیکردنەوەو تێگەیشتنی ژیانی کۆمەلایەتی بدات نووسەر لەم چوارچێوەیە دا رای خۆی ئەخاتە بەردەم کە بریتییە لە زانستی کۆمەڵگا ناسین بریتییە لە لیکولینەوەی رێکخستنی کۆمەلایەتی .

ئەوی راستی بێت ئەمە شتێکی تەواو تازە نی یە لە زانستی کومەڵگا ناسیندا ، پێش ئەو چەند زانایەکی کۆمەڵگا ناسین باسیان کردووە . لەبەر ئەمە هەر لە سەرەتاوە نووسەر دەست پێشکەری ئەکاتو لەوە ئەدوێ کە ئەم رایە لادان نی یە لەو بیرە سوسیۆلۆجی یەی لە کۆنەوە هەبووە . بەس ئەوەیە ئەم رایە یارمەتی داوە ، ئەو ئەنجامانە هەڵبژێرێت کە لەکتێبەکەدا هەیە . کتێبەکە لە کتێبەکانی تر ناکات . لەو جۆرە کتێبانەیە ، کە بریتی یە لە کۆمەڵێك ووتارو لێکۆڵینەوە کە نووسەر خۆی هەڵی بژاردوونو یەکی خستوونو پێشەکی بۆ نووسیونو یەکە یەکەش باسیان ئەکاتو لەسەریان ئەدوێ . لە چوارچێوەیەکدا لەگەڵ نیازو خواستو رای خۆی بگونجێتو بەو جۆرەش کە ئەیەوەێ بە قوتابیانی بگەیێنێت . ئەو پلانەی نووسەر ، بۆ دانانی ئەم کتێبە لەسەری رۆشتووە ، بریتی یە لەوەی ، بەرهەمێکی زۆری ئەوانەی لە زانستی کۆمەڵگا ناسین بەتایبەتیو لەوانەی لە زانستە کۆمەلأیەتیەکاندا بەگشتی خەریك بوون ، کۆکردۆتەوەو دووایی کەرەستەی ئەم کتێبەی لە ناویان هەلبژاردووە پاش ئەوە چوار لێکۆڵینەوەی بنەرەتی ئەگرێتو ئەیانخاتە پێش چاوو لیٚ یان ئەدوێ . ئەو چوار باسەش ئەمانەن :

١ – پێشەکیەك دەربارەی ناوەرۆکە بنەرەتییەکانی زانستی کومەڵگا ناسین .

٢ – وێنەی مرۆڤو کۆمەڵگا

٣ – جۆرەکانی رێکخستنی کۆمەلأیەتی .

٤ – پاشەڵەکانی کۆمەڵگای هاوچەرخ .

لە چوارچێوەی ئەم باسە بنەرەتیانە ، کتێبەکە ئەبێتە پانزە فەسل هەموو فەسلێك بەپێشەکی یەك دەست پیٚ دەکات ، هەموو ئەو راو بیروباوەرانە شی ئەکاتەوە کە پەیوەندیان بەهەموو رووخسارەکانی رێکخستنی کۆمەلأیەتیەوە هەیە . شان بەشانی ئەمەش هەموو ئەو لێکوڵینەوەو باسانە ئەخاتە بەردەم کە خۆی هەڵی بژاردوون ، بە نیازی روون کردنەوەی ئەو رایانەی خراونەتە پێش چاو . نووسەر ئەوەشی لەیاد نەکردووە ، ئەو باسانە لەوانە بن نوێنەری کۆنو هەروەها نوێنەری نوێش بن . ئەمەش بۆ ئەوەی جۆرە پارسەنگێك دروست بکاتو چاو لە را مێژوویەکەی زانستی کۆمەڵگا ناسین نەپۆشێت . لەبەر ئەمە کتێبەکە چلو حەوت باسو لێکۆڵینەوەی تێدایە ، هەموو باسو لێکوڵینەوە بناغەییەکانو لقەکانیان دائەپۆشێت کە کتێبەکەیان پێك هێناوە ، ئەو کتێبەی بریتی یە لە شەش سەدو نەوەدوو حەوت پەرەو لە ساڵی ١٩٧٢ دا بلأوکراوەتەوە . ئێستەش بیرورای هەرەگرنگو بنەرەتی ئەخەینە بەرچاو .

یەکەم : پێشەکیەك دەربارەی چەمکە بنەرەتیەکان :

پێشەکی یەکە گرنگترین کێشەکانی لێکوڵینەوەی کۆمەلأیەتی ئەخاتە بەردەم باسی ئامانجەکانی زانستی کۆمەڵگا ناسین ئەکات وجۆری ، بەکارهێنانیان ، هەروەها لە شی‌کردنەوەی سوسیولوجی‌و ، لە رووی رادەکانی ئەم شی‌کردنەوەیە ئەدوێت ، لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی ئەو هۆیانەی دەرەوە کە کار ئەکەنە کۆمەڵەکانو بەیەکیانەوە ئەبەستێت . نووسەر پێش ئەوەی بچێتە هیچ جۆرێکی درێژە پیٚ‌دان ، چەند کێشەیەك لە بەرگی پرسیار دا ئەخاتە بەردەم :

١ – ئامانجەکانی سەرەتای قۆناغی دانشگایی چین ؟

٢ – سەربەستی ئەکادیمی چی‌یە ؟

٣ – ئایا ئەوانەی لە چوارچێوەی زانستە کۆمەلأیەتیەکاندا ئیش دەکەن ، ئەتوانن دەورێکی گورجانەیان لە سیاسەتدا هەبێت ؟

٤ – ئەتوانن لە پێناوی گۆریندا ئیش بکەن ؟

٥ – زانستی کومەڵگا ناسین چۆن سوود بەخش ئەبیٚ بۆت ؟

باسەکە لەم چوارچێوەیەدا دەربارەی نیازو خواستی زانستی کۆمەڵگا ناسینو جۆری بەکارهێنانی ئەدوێت . هەروەها لە رۆلی ئەوانەی خەریکی ئەم زانستەنو جۆری پەیوەندیان لەگەڵ کۆمەڵگادا ئەدوێت !

زانینە زانستەکان کە لە شی کردنەوەی سوسیولوجی‌یەوە هاتوون ، ئەو تواناو ئامێرانە بە قوتابی ، بگرە بە هاونیشتمانێکی سادە لە کۆمەڵگادا ئەدات ، تا لە رێیانەوە بتوانێت ، دۆخە بووەکانی کۆمەڵگا بچەسپێنیٚ یان دەستی گۆرینیان بەسەردا بهێنیٚ . ئەوی راستی بێت زانایانی کۆمەڵگا ناسین سەری خۆیان بە پیشاندانو شی‌کردنەوەی رووداوە کۆمەلأیە تیەکانەوە کاڵ کردووە زیاتر لەوە گویٚ بدەنە گۆرینی رووداوەکان . بەلأم زانستی کۆمەڵگا ناسین ، رووی‌کردۆتە جۆری ژیانی کۆمەلأیەتیو درووست بوونی رووداوە کۆمەلأیەتی‌یەکان بەمەش چوارچێوەیەك ئەدات بەو هێزانەی گۆرین دروست ئەکەن ، لێرەدا زانستی کۆمەڵگا ناسین لە توانایا هەیە هەموو ئەو هێزو توانایانە بخاتە روو کە سروشتو مرۆڤایەتی هەیەتی ، هەروەها

ئەوەش لە تواناادا هەیە ، لایەنە سەرکەوتوو سەرنەکەوتووەکانی هەوڵە هەردوو لایەکانی مرۆڤیش دەربخات . ئەوەشی لە توانا دا هەیە هەستی پەیوەندی قوتابی لەگەڵ خەڵکانی تردا قووڵ بکاتەوە . کەچی سەرەڕای ئەم سوودانەی باسمان کرد ، گفتوگۆ دەربارەی کێشەی ئاور دانەوەو گوێدان بە باری تیۆریو پراکتیکی زانستی کۆمەڵگا ناسین وەستانی بۆنیە .

**چوارچێوەی تیۆریی زانستی کۆمەڵگا ناسین :**

باو وابوو بە جۆرێك سەیری زانستی کۆمەڵگا ناسین بکرێت بریتی بێ لەو زانستەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ بکۆڵێتەوە بەڵام چەند زانستێکی کۆمەڵگا ناسینی تریش ئاور لە مرۆڤو دیاردەکانی رەوشتی ئەداتەوە ، وەکو زانستی دەروونو زانستی ئابووریو ئە نثرۆپۆلومیاو زانستە سیاسی یەکان . کەواتە ئەو خاسیەتانە چین کە رای زانستی کومەڵگا ناسینو لێکۆڵینەوەکانی لەیەك جیا ئەکاتەوە . ئەبێ قوتابی چ سوودێك لە خوێندنی ئەم زانستە ببینێ . وەلامی ئەم پرسیارانە بەستراوە بە سروشتی شیکردنەوەی زانستیی هەموو لقێکی زانستەکانی کۆمەڵگا ناسین . لێرەدا نووسەر چوار شێوەی لێکۆڵینەوەی زانستیی دەست نیشان ئەکاتو ناوی (رادەکانی شیی کردنەوەیان) لێ ئەنێت . لەسەر ئەو بناغەیەی گوایە هەریەکێك لە مانە پیشەوکاری شیی کردنەوەی رەوشتی مرۆڤە ، لەو سووچە تایبەتیەوە کە بەراستی دائەنێت . لەبەر ئەمە دەسەڵات نییە ئەبێ لەیەك جیابکرێتەوە ، بۆ ئەوەی خاسیەتی چوارچێوەی تیۆریی زانستی کۆمەڵگا ناسین بناسرێت . ئەو رادانەش ئەمانەن : رادەی زگماکی ، دەروونی ، کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری . شیی کردنەوەی زگماکی بەجورێ سەیری مرۆڤ ئەکات وەك زندەوەرێکی ژیاوبێت . ئەمەش لایەنە ئەکادیمیەکان ئەگرێتەوە ، وەکو زانستی زندەوەرو پزیشکی . هەرچی رادەی دەروونی یە ئەوە سەیری مرۆڤ ئەکات وەك شەخسییەتێك بێت . ئەمەش زانستی دەروونو شیی کردنەوەی دەروونی ئەگرێتەوە . رادەی کۆمەڵایەتیش بەو جۆرە سەیری مرۆڤ ئەکات وەك لایەکی پەیوەندی کۆمەلایەتی بێت . زانستی کۆمەڵگا ناسین لەم رایەیدا لەگەڵ زانستییە سیاسییەکانو ئەنثرۆپۆلۆجیای کۆمەڵایەتی دا یەك ئەگرێتەوە . دووایش رادەی رۆشنبیری دێت کە چەند باسێك ئەگرێتەوە ، وەکو ، فەلسەفەو یاساو ئەدەبو زمان ، ئەمانەش هەموویان بەو جۆرە سەیری مروڤ ئەکەن وەکو هەڵگری بیروڕای رۆشنبیری هاوبەش بێت . هەرچەندە بەسەرزاری ئەم رادانە لەوە ئەچن تێکەڵ بن بەڵام هەتا ئەمرۆ هەر یەکێك لەوانە خاوەنی ناوەرۆکو سنووری تایبەتی خۆیەتی .

کەواتە چۆن لە زانستی کۆمەڵگا ناسین بگەینو لە زانستە کۆمەڵایەتیەکانی تر جیای بکەینەوە ؟ بەلایەوە زانستی کومەڵگا ناسین ، بریتییە لەو زانستەی پیشەی لێکۆڵینەوەی مرۆڤە لەسەر بناغەی دیارکردنی ئەو یاساو بنەرەتیانەی دەست بەسەر ژیانی کۆمەڵدا ئەگرن . کەواتە ئەو شتەی ئەم زانستە واتە زانستی کۆمەڵگا ناسین لەزانستە کۆمەڵایەتیەکانی تر جیا ئەکاتەوە ، ئەو بیرورا فراوانو گشتیەیە کە هەیەتی . ئەم زانستە بەتەنیا سەیری ئەم جۆر یان ئەو جۆری رەوشتی مرۆڤایەتی ناکات ، بەڵکو بە چاوێکی فراوانو بە شێوەیەکی گشتی سەیری ژیانو کۆمەڵ ئەکاتو لێیان ئەکۆڵێتەوە . بەم جۆرە کۆمەڵ ئەبێتە ئەو مەیانو پارچەیەی لێکۆڵینەوەی ئاراستە ئەکرێت ، ئەمەش لەبەر ئەوەی کیانێکی سەربەخۆیەو جیایە لە خاسیەتی ئەو ئەندامانەی پێکیان هێناوە ، جا خاسیەتی زگماکی بێت یان خۆیی بێت .

کەواتە ، کۆمەڵەکان ئەو بەشانەن لە زانستی کۆمەڵگا ناسیندا کە شیئەکرێتەوەو لێیان ئەکۆڵنەوە . کۆمەڵەکانیش بەمانە جیائەکرێتەوە :

– ئەو بەشانەن کە لە تواناادا هەیە شیکردنەوەو لیکوڵینەوەیان دەربارە بکرێ .
٢ – ئەو بەشانەن کە خاوەنی خاسیەتی کۆمەڵایەتی جیاوازن .
٣ – خاسیەتی ئەم بەشانە بە شێوەیەکی رێکخراو بە خاسیەتەکانی ترەوە بەستراوە .
٤ – خاسیەتی کۆمەڵ کار ئەکاتە سەر ئەندامەکانی ، کار ئەکاتە سەر بیروراو هەستو سەواو معامەلەی ناو خۆیاندا .

نووسەر لەرێی دوو لیکۆڵینەوەوە ئەم رایانە روون ئەکاتەوە . ئەم دوو لێکۆڵینەوەیە لەسەر بناغەیەکی تاقیکردنەوە بووە یەکێکیان لەرێی جۆری پەیوەندیو کارکردنە سەر کردەوەی کۆمەڵ بوو ئەوی ترشیان لە رێی شیکردنەوەی پەیوەندی نێوان سەرکردایەتیو کۆمەڵ بووە .

ئەگەر کۆمەڵ پارچەی شیکردنەوەی زانستی کومەڵگا ناسین بێت بە جورێك لەرێی باسکردنو شیکردنەوەی

خاسیەتی ئەو کەسانەی پێکیان هێناوە تێ ی بگەین ، کەواتە ئەبێ ئەوە لەیاد نەکەین کە کۆمەڵانو ڕێکخراوە کومەلأیەتیەکان لە بۆشاییدا کارناکەنو ناجووڵێنەوە . ئەم ڕێکخراوانە هەموو بەیەکەوە لەیەك شوێنو لەیەك زەمانی دانراودان ، جگە لەمەش هۆی وەها کاریان تێ ئەکات کە پەیوەندی یان بە خاسیەتی کۆمەڵو کەسانەوە نی یە . گرنگترین ئەم هۆیانە سێیانن : دانیشتووان ، دەورووبەر ، تەکنەلۆجیا .

جا ئەگەر خاسیەتەکانی دانیشتووان گرنگی یەکی تایبەتی هەبێت لە ڕووی کارکردنە سەر ڕێکخستنی کۆمەلأیەتی هەموو کۆمەڵەکان ، ئەوە دەوروبەریش دەستێکی بالأی لەو کارتێ کردنەدا هەیە . بێگومان ئەو بیروراو تیوریە جوگرافیە کۆنانە وەکو جاران نەماونو زانایانی کۆمەڵگا ناسین ئاوریان لێ نادەنەوە .

لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئەوەی لە توانادایە دەست بەسەر دەورووبەرەکەی خۆیدا بگرێت . بەلأم ئەوەش لە دەسەلأتتدا نی یە چاو لەهەموو ئەو کێشە نوێیانە بپۆشرێت کە ئەمڕۆ لەبەردەم کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا پەیدا بووە ، وەکو پیس بوونی بێوەستانی دەورووبەر ، لە هەوادا ، لە ئاودا ، لەسەر زەوری دا بە جۆرێك ئەو ڕاستی یە دەرئەخات کە دانیشتووانو کۆمەڵەکان پشتیان تەواو بە دەورووبەرەو چاویان لەوە بەلأم ئەمەش ڕێگای ئەوە ناگرێت لەوە بدوێین کە هەڵوێستی کۆمەلأن بەدەورووبەرەوە تا ڕادەیەکی زۆر بە پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتو هەلوێستی بەرامبەری وەستاوە .

واتە مرۆڤ دەست بەسەراگری سرووشتە یان بە پێچەوانەوە ژێردەستو کلکلێتی . ئەمەش لەبەراورد کردنی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان لەگەل کۆمەڵگاکانی تردا روون ئەبێتەوە . بەلأم ئەو دەست بەسەرا گرتنەی کومەڵگا ڕۆژ ئاواییەکان بەسەر سرووشتدا هەمووی ڕاستو باش نی یە . چونکە بووە هۆی تێك دانو وێرانکردنی سرووشت بە جۆرێك وای کرد ڕێکخراوی کۆمەلأیەتی وا پەیدا ببێت داوای ئەوە بکات مرۆڤ رەوشتی خۆی بەرامبەر بە سروشتو بەرهەمە سرووشتی یەکان بگۆڕێت .

ئەوە ماوە باسی هۆی سێهەمیان واتە تەکنەلوجیا بکەین ، کە گرنگی یەکی تایبەتی لە کۆمەڵگا پیشەسازی یە خوێ یەکاندا هەیەو بووەتە هۆیەکی سەرەکی گەورە لە گۆرانە کۆمەلأیەتی یەکانو ئەو جۆری ژیانەی لێوەی پەیدا ئەبێت .

نووسینە یەکەمەکانی کارل‌مارکس پەیوەندی نێوان جۆری تەکنەلۆجیاو ناوەرۆکی پەیوەندی کۆمەلأیەتی لە پیشەسازیدا دەرئەبرێت ، بەهۆی ئەم تەکنەلوجیا نوێیە بووەتە هۆی زیان بۆ کرێکاران .

یەکێکیش لە لێکولینەوە نوێیەکان بەجۆرێك لەم دیاردەنە ژیان بەخشە ئەدوێت گوایە ئەو ژیانە بۆ هەموو کارێك وەکو یەك نی یە . بەلأم گومان لەوەدا نی یە تەکنەلۆجیای نوێ یەکێکە لە کارەساتە گەورەکانی کۆمەڵگای مرۆڤی هاوچەرخ .

**دووهەم : وێنەی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا .**

پێشەکی یە گشتی یەکە باسی چەمکە بنەرەتیەکانو دەوری زانایانی کۆمەڵگا ناسینو ئەو چوارچێوەیەی کۆمەڵەکانو ڕێکخراوە کۆمەلأیەتیەکان کاری تیا ئەکەن ئەکات . دووایی کتێبەکە دێتە سەر لێکۆڵینەوەی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا . ئەمەش لەڕێ ی سێ دیاردەی بنەرەتیەوە دێتەدی کە مرۆڤ بەشداریان ئەکاتو کاری تێ ئەکەن . ئەم دیاردانەش بریتین لە : ڕۆشنبیریو کارلێكو پێ گەیاندنی کۆمەلأیەتی .

**رۆشنبیری :**

لەبەر ئەوەی تەکنەلۆجیا یەکێکە لەو هۆ بنەرەتیانەی گۆڕینو وکارتێ کەری ڕێکخستنی کۆمەلأیەتی ، لەبەر ئەمە بەشێکە لە دیاردەیەکی فراوان تر ، واتە ڕۆشنبیری . هەرچەند ڕۆشنبیری بەدەیەها جۆرە شێوە باس کراوەو ناو براوە ، بەلأم گرنگترین روخسارو شێوەی بریتی یە لەوەی : دیاردەیەکە پەیوەندی بە هەموو کەسێکەوە هەیە . ئەمەش لەبەر ئەوەی شتێکە خەڵکی لە کۆمەڵگا دا دەستی دەخات . دەستی ئەخات لەبەر ئەوەی ئەندامی ئەم یان ئەو کۆمەڵگایە .

ڕۆشنبیری لەسەر بناغەیەکی بایەلۆجی مرۆڤ دەست ئەخرێت . فیردکیش ڕادەی بۆ نی یە . بەلأم مرۆڤ سەرشۆرێکی تەواوی سریشتەکانی نی یە . هەر لەبەر ئەمەش ئەم وێنە جیاوازانە لە ژیانی مرۆڤدا بەدی ئەکرێت . نموونەش بۆ ئەمە ، هەلوێستی کۆمەڵگا مرۆڤی یەکان بەرامبەر بە ژن خواستن . ئەوەیە هەندیکیان دان بە هێنانی چەند ژنێکدا ئەنێ ، هی تریشیان هەیە دان تەنیا بەهێنانی یەك ژن ئەنێ . بگرە خواستنی خزمان لەهەموو کۆمەڵگایەکدا وەکو یەك نی یە . ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی دیاردەی نیسبی ڕۆشنبیری واتە

هۆی جیاوازی نێوان جۆرەکانی رۆشنبیری ئەگەڕێتەوە سەر سروشتی نەرمی مرۆڤ. کەواتە بۆچی زانایانی کۆمەڵگا ناسین بەم جۆرە روو ئەکەنە رۆشنبیری؟ وەلامی ئەمە پەیوەندی بەو شیکردنەوە رۆشنبیری‌یەوە هەیە کە لەوەو پێش باسمان کرد. راستە رۆشنبیری لەگەڵ کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا پێ ئەگات، بەلام دووایی لە ئەندامانو بەشدارانی ئەو کۆمەڵە جیا ئەبێتەوە، بگرە هەتا لە کۆمەڵەکە خۆشی جیا ئەبێتەوەو سەربەخۆیی تایبەتی خۆی ئەهێنێتە دی. خۆکە لەگەڵ رادەی کۆمەلایەتیدا تیکەلاو دەبێت ئەوسا ئەبێتە – واتە رۆشنبیری – کارێکی دینامیکی و کار ئەکاتە سەر ئەندامانی کۆمەڵو کردەوەکانیان. لەبەر ئەمە رێکخراوە کۆمەلایەتیەکان ناتوانن بەبێ رۆشنبیری پێ بگەنو پەروبسێن. لە رێی سێ ووتارەوە ئەم بیرو رایانە روون‌کراونەتەوە. یەکێکیان لە نیسبەتی رۆشنبیری ئەدوێت، ئەوی تریان دەربارەی زندووکردنەوەی رۆشنبیری‌یە لە گەرەکەکانی قولەرەشەکانی واشنتۆنی پایتەختی ئەمەریکایە، سێهەمیشیان لێکۆڵینەوەی یەکێك لە زاناکانی زانستی کۆمەڵگا ناسینە دەربارەی یەکێك یەکێك لە هێڵە سەرەتاییەکانی ژووروی ئەمەریکایە.

**کارلێك :**

ئەگەر رۆشنبیری بریتی بێت لەو چاوەروانی‌یە گشتی‌یانەو قیەمە بلاوامەی ناو کۆمەلان، ئەوە کارلێك بریتی‌یە لە هەڵبژاردنی کەسانو رەوشتیانو ئەو کارانەی ئەیکەن. کارلێك، ئەو کارە دەست‌نیشان ئەکات چۆن کەسان کار ئەکەنە یەکتری. کارێکە، کەسان لەرێ‌یەوە رەوشتی خۆیان بەرەولا ناکەنو ئەوەش لەیاد ناکەن کاری خەڵکی ترو بیروڕایانو نیازو ئامانجیان پشت‌گوێ بخەن. کارلێکی کۆمەلایەتی‌یەك جار روو ئەداتو ئیتر لەو رادەیەدا ئەوەستێت. بەلام بە جۆرێکی بێ‌ناوبری دووبارە ئەبێتەوە ئەمەش ئەبێتە هۆی پەیدابوونی پەیوەندی‌یەکی کۆمەلایەتی. چونکە زۆر جار پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتیەکان کارلێکی تێدایە. بەم جۆرە کارلێك ئەبێتە بنچینەی پەیوەندی.

جا لەبەر ئەوەی پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتیەکان شتێکی پێویستن بۆ پەرەسەندنی رێکخستنی کۆمەلایەتی‌و لەبەر ئەوەی کارلێکی کۆمەلایەتی کەم‌و زۆر کارێکی نەوەستاوە، واتە مادام پەیوەندی کۆمەلایەتی کۆمەڵەکان هەن ئەویش هەیە، ئەوسا خۆمان لەئاست ئەو دیاردەیەدا ئەبینین چۆن کارلێك‌و پەیوەندی‌و رێکخستن‌و کارکردنە سەریەك ئاڵ‌و گۆڕ ئەبێت. کاتێك ناوەرۆکی پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتیەکان (ئاڵ‌و گۆڕی کار لەیەك کردن) تێکەڵ بە مانا رۆشنبیری‌یەکان ئەبێت، ئەوسا رێکخستنی کۆمەلایەتی خۆی دەر ئەخات. کۆمەڵ یان رێکخستنی کۆمەلایەکی بە رادەی هاریکاری نێوان ئەندامەکان لە پەیوەندی جیائەکرێتەوە، هەروەها لەرێ‌ی هەستی ئەندامێتی لای ئەو ئەندامانەو رادەی توانایان لە پاراستنی کۆمەڵدا دژی دەوروو بەری دەرەوە. نووسەر لەرێ‌ی سێ ووتارەوە هەوڵی داوە ئەم بیروڕایانە روون بکاتەوە ئەم ووتارانەش دەربارەی کارلێکن لە هەڵوێستی جیاوازدا وەکو چۆن پارێزەرێك لەگەڵ یەکێك لە مەعمیلەکانیدا ئەدوێ. یان کۆبوونەوەیەك لە نێوان شیکەرەوەیەکی دەروونی‌و مەعمیلەکەی. هەروەها وێنەیەکی تایبەتی پەیوەندی‌و کارلێك لە نێوان کچێك نەخۆشی شیزوفرینای هەبێت‌و بنەماڵەکەی‌و پزیشکە چاك‌کەرەوەکەو لە نێوان ئەوو نەخۆشانی تردا، ئەمانە هەموویان لە ماوەی سێ ساڵی پڕ لە ئەرکدا لە یەکێك لە خەستنەخانەکانی ووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دووایی نووسەر لە یەکێك لە ووتارەکانیدا وێنەیەك لە پەیوەندی‌یە هەرە ئاڵۆزاوەکانی ژیانمان (واتە خۆشەویستی) پیشان ئەدات.

**پێگەیاندن :**

**ئەگەر رۆشنبیری چوارچێوەی گشتی فێربوونو کارلێك پێك بهێنێ، ئەوە کرداری فێربوون خۆی لە خۆیا بیروراری کۆمەڵ فێر ئەکات. بەپێی ئەمەش تاك ئەبێتە ئەندامی کۆمەڵ. ئەم کردارەش ناوی پێگەیاندنی لێ ئەنرێت.**

**کەواتە پێگەیاندن بریتی‌یە لەوەی ئەندامە نوێ‌یەکە فێری بنکەکانی رۆشنبیری بکرێت، ئەو کردارەی لەرێ‌یەوە چاوەروانی‌یەکانی کۆمەڵ ئەگاتە تاکەکان.**

**ئەمەش لەرێ‌ی زمانەوە بەووتن یان بە نووسین دێتەدی. نەك هەر ئەمە بگرە لەرێ‌ی جوولانەوەشەوە دێتەدی. واتە پێگەیاندن ئەوە ئەهێنێتە دی، زندەوەری ژیاو رادەی زکماکی خۆی بگۆڕێت‌و بیکاتە شەخسیەتێك. شەخسیەتەکەش بکاتە یەکێکی کۆمەڵ خواز، (کۆمەڵی). ئەو تاکەی ئەتوانێ رەوشتی خۆی بە جۆرێك بەکاربهێنێ لەهەڵ چاوەروانی‌یەکانی خۆی‌و خەڵکی تریشدا بلکێت.**

لەلای کۆمەلگاشەوە پێگەیاندن ئەبێتە ئەو کارلێکەی لەرێیەوە رۆشنبیری کۆمەلگا ئەگاتە تاکە نوێیەکان بەهۆ نیازەی ئەو شێوازە تێبگەن کە کومەڵگا دانی پیاناوە . ئەمەش بەلای تاکەوە ئەو رێگایەیە شەخسیەتی خۆی تیا پێئەگەینێ . ئەمەش ئەبێتە هۆپێگەیاندنی داوەرەکانو پێوانەکانو تواناو خواستەکانی ، ئەمانەی هەموو بەیەکەوە شەخسیەت دروست ئەکەن .

بەلام پێگەیاندن ئەوە ناگەینێ تاك کوێرانە سەر بۆ فەرمانەکانی کۆمەلو شێوازی ژیانی کۆمەلی شۆڕ بکات . بیرورای کۆنی لە باو بەرامبەر پێگەیشتنو دەوری گورجو داهێنەری منالو هەرزەکارانی ئەخستە پشتگوێ . ئەوی راستی بێت شت زانینی نوێ ، کاریکە بەدرێژایی لەگەل مرۆڤدا ئەروات . ئەوەیە هەر ئەوەندەی یەکێك لە گەرەکێکەوە ئەچێت بۆ گەرەکێکی‌تر . یان پیشەو کارەکەی ئەگورێت ئەچێتە قۆناخێکی نوێوەو خۆی لە ئاست رووداوی نوێو جیاوازدا ئەبینێ ، ئەمانە لە کاتی ژن خواستنیشدا روو ئەدات ، ئەمەش جارێکی تر لەرێی توانەوەو تێگەیشتنەوە دووبارە ئەبێتەوە کاتێك نرخەکانو حوکمەکانی کۆمەل وەرئەگرێت بێئەوەی هێزێکی دەرەوە دەستی تێبخات . ئەمەش ئەوە ناگەینێ کە تواونەوەی تاك تەنیا لەسەر هەزم کردنی رۆشنبیریو پێوانەکان وەستاوە . چونکە رادەی تێگەیشتنی منال یان هەرزەکار لەسەر رادەی زیرەکێتی وەستاوە . ئاشکرایە زیرەکی دیاردەیەکی وەستاو نییە بەڵکو بەپێی تەمەنو تاقیکردنەوەی ژیان ئەگورێت . هەرچۆنێك بێت پێگەیاندن کارێکی گرنگە بۆ ئەوەی وا لە تاك بکات لەگەل خەلکی تردا بگونجێ ولەرێی خەلکی ترەوە سەیری خۆی بکات . جگە لەمەش پێگەیاندن دەستێکی بالای لە مەیانی ریکخستنو ئیش بەریوەبردندا لەناو پارچە کومەلایەتیەکاندا هەیە ، ئەوەش لە رێی دابەش‌کردنی چەقەکانو رۆلە کۆمەلایەتیەکان لە نێوان ئەندامەکاندا . چونکە رەوشت لە هەموو پارچەیەکی کۆمەلایەتیدا لەسەر ئەو چەقو پلەیە وەستاوە هەر کەسێگ لە کۆمەلا هەیەتی . لەبەر ئەوە نابێ چاوەروانی ئەوەبین رەوشتی هەمووان وەکو یەگ بێت . چونکە هەموو چەقێگ مافو ئیلیتزاماتەکان بۆ ئەو کەسە دەست‌نیشان ئەکات . لەبەر ئەمەش هەموو کەسێگ بەو جۆرە ئەجوولێنەوە کە چەقەکەی لە رێکخستنی کومەلایەتیدا بۆی داناوە . دووایی لێکۆڵینەوەی پێگەیاندنو زات بەم خەمل لێدانانە کۆتایی دێت :

لە بەدەنگ چووین

١ – وێنەی زات خەلکی ترەوە دێت .
٢ – چەند بنکەیەکی رێکخەری رەوشتی خەلکی لەهەمە جۆر دەوردا ، دەست بەسەر خەلکیدا ئەگرن لە لە بەدەنگ چوون بەدەم زاتەوە .
٣ – زات دەوری‌هەیە ، ئەو دەورانە ئەدات بەخەلکی کاتێگ زات دێتەدی کە خەلکی بە دەنگی‌یەوە بچن .
٤ – پێگەیاندن هاندان دروست ئەکات بۆ ئەوەی هەموو دەورێگ رەوشتێکی خۆی هەبێت .

نووسەر ئاوری لە پێگەیاندنی ئافرەت داوەتەوە ، بەتایبەتی لە کومەلگای وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا . چونکە هەستی بەوەکردووە کە زۆر شوێنو لایەنی ژیان بەیەکسانی سەیری مافی ئافرەتان ناکەن ئەمەش بەلای ئەوەوە پێویستی بە تێگەیشتنو لێکولینەوە هەیە ، چونکە سەربەستیو سەرفرازی ئافرەت سەربەستی نێرانو مێیان وەکو یەگ بەهێز ئەکات .

**سیهەم : جۆرەکانی رێکخستنی کۆمەلایەتی :**

باسەکەی پێشو لەو شوێنو رێگایانە دووا چۆن پێگەیشتن لەرێی کارلێکەوە ئەتوانێت بابەتە رۆشنبیری‌یەکانی کومەل بەهێز بکاتو گەشەیان پێبکات لەبەر ئەمە پێویستە لەم بابەتانە بدوێن لەبەر ئەوەی ژیانی رێکخراوی کۆمەلی مرۆڤایەتی لەهەموو شوێنێکدا هەیە ، پیویستە بیری رێکخستنی کۆمەلایەتیش بخرێتە بەردەم واتە چی‌یەو شیوەکانی چین؟ نووسەر رێکخستنی کۆمەلایەتی بەوە پێناس ئەکات ، کەئەو دیاردەیە دەست نیشان ئەکات کە ئەتوانێ خەلکیو ئەو دەورو بەرەی تیا ئەژین لەگەل یەکدا بگونجێنێ بەوەی یارمەتیان ئەدات ئەو هەولەیان یەگ بخات کە دانراوە بۆ هێنانەدی نیازێکی هەردوولایی . لەبەر ئەمەش رێکخستنی کۆمەلایەتی بەلای خەلکی‌یەوە لەیەك قەواردا نی‌یە ، بەلکو قەوارەکانی جیاوازنو ، قەوارەی هەیە هی دەستەیەکی بچووکە قەوارەش هەیە هی کۆمەلگایەکی گەورەیە . کەواتە لەهەر شونێگ جموجۆلێکی کۆمەلی هەبێت ، رێکخستنی کۆمەلایەتیش هەیە . لەهەر شونێگ خەلکی هەبێت پەیوەندیان بەیەکەوە بێتو لەسەر کارێك لەناو خۆیانا پێش‌برکێ بکەن ، رێکخستنی کۆمەلایەتی هەیە . رێکخستنی

کۆمەڵایەتی لە هەموو شیوەکانی پەیوەندی ئاڵو گۆڕ کراوو هەموو ئەو لەیەک جۆشانەی تاکەکان بە کۆمەڵەوە ئەبەستن‌و ڕێگا پاک ئەکەنەوە بگەنە ئامانجە تەنیایی‌و کۆمەڵایەتی‌یەکاندا هەیەو بەدی ئەکرێت .

لەبەر ئەوەی کۆمەڵەکان لەیەک ناکەن‌و جیاوازن ، بە تایبەتی لە ڕادەی توانای مانەوەو بەردەوام بووندا ، لەبەر ئەمە دەسەڵات نی‌یەو ئەبێ ئەو پرسیارە بکرێت . ئەو پێوانانە چین کە لەتوانادا بێت بۆ نرخاندنی ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیەکان بەکاربێن ؟ ئەمەش گرنگی‌یەکی تایبەتی هەیە . چونکە بەلای نووسەرەوەوە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیەکان شان بەشانی هۆیە کەسانی‌یەکان ژیانێکیان هەیە لە ژیانی ئەو کەسانە تێ‌ئەپەڕێت کە دروستیان کردوون بۆ پێگەیشتنی هەموو ڕیکخراوێک‌و ژیان‌و مانەوەی‌و بەردەوامی لیرەشدا نووسەر دەست بۆ ئەوە درێژ ئەکات کە بۆ نەگبەتی زانینمان دەربارە ئەو هویانەی بەشداری سەرکەوتنی ڕێکخستنە کۆمەڵایەنیەکان یان سەرنەکەوتنیان ئەکەن زۆر کەمە . چونکە ئەو لێکۆڵینەوانەی خۆیان لەم باسە داوە خۆیان زۆر کەمن . بەڵام ئەمە ئەو ڕاستی‌یە ناشارێتەوە کە پارچە کۆمەڵایەتیەکان ئەو مقەوماتە پیویستیانەیان بۆ ژیان‌و مانەوە هەیە . ئەوەیە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتی‌یەکان بۆ یان هەیە سەرکەوتن بهێننە دی ، لەوەشدایە سەرنەکەون .

بگرە لەناو خۆشیانا ئەچن بەگژ بەیەکدا . بەڵام حوکم دان بەسەر کۆمەڵێکی ڕێکخراودا بەوەی بەردەوام ئەبێت ، یان کۆتایی دێت ، یان بەسەر هی‌تردا سەر ئەکەوێت یان بەپێچەوانەوە ئەبێتە ژێردەستەی کومەڵێکی تر ، ئەمانە یەکێکن لە کێشە بیری‌یەکان کە بەرای نووسەر لەبەر ڕۆشنایی سێ پێوانەدا ئەتوانین لی‌یان بگەین . ئەو پێوانانەش ئەمانەن : دامەزراندن ، گورج‌وگۆڵی ، پێکەڵی . جا لەرێی بەکارهێنانی ئەم سێ پێوانەیەوە لە توانادایە هەموو ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی ، لەبنەماڵەوە بگرە هەتا کۆمەڵگا ، بنرخێنین .

نیازی لە دامەزراندن ئەوەیە ، تاچ ڕادەیەک ڕێکخستن ئەو هێزو کێشی‌یەی هەیە یارمەتی بدات بمێنێتەوەو لە زەماندا بەردەوام بێت . هەرچی گورج‌و گۆڵی‌یە ، ئەوە بریتی‌یە لە توانای ڕێکخستن چۆن ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی خۆی یان ئامانجی ئەو بەشانە ئەهێنێتە دی کەلی‌یان پێک‌هاتووە ؟ هەرچی پێکەڵی‌یە ئەوە بریتی‌یە لە هاوریز کردنێکی باش لە نێوان ئەو بەشانەی ڕێکخستنیان پێک‌هێناوەو ئەو یەکگرتن‌و هاریکاری‌یەی لە ئەنجامی ئەمەدا لەناو بەشەکاندا پەیدا ئەبێت .

**دەستدارێی بۆ کۆمەڵ :**

دیارترین خاسیەتی کۆمەڵە ڕیکخراوەکان ئەو جۆرە دەستدراییانەیە کە کەسان بەیەکەوە و دووایی بەکۆمەڵەوە ئەیابنە ستێت . دەستدایی بۆ کۆمەڵ لەسەر ڕادەی ڕاکێشانی کۆمەڵ‌و پتەوی نێوان بەشەکانی وەستاوە ، کەمەنکێش کۆمەڵ لەسەر زۆر شت وەستاوە لەوانە ئامانج‌و ڕادەی قەوارەی‌و شوێنی لە کۆمەڵگادا . هەرچی پتەوی‌یە ئەوە بریتی‌یە لەو جۆری پەیوەندیانەی وا ئەکات کەسان لە کۆمەڵدا بمیننەوە ، دووای ئەوەی ڕائەکێشرێنە تاوی‌یەوە . پتەوی لەسەر جۆری ڕاکێشانی ئەو ڕێگایانە ئەوەستێ کە کۆمەڵ بۆ کەسەکانی بەکاریان ئەهێنێ . هەروەها لەسەر جوری هاوریز کردنی نێوان هەوڵدانی ئەو ئەندامانە ئەوەستێ . ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیە بەیەکەوە چەسپاوەکان ئەوانەن ئەندامەکانیان بەیەکەوە هەوڵ ئەدەن ئامانجەکانی کۆمەڵ بهێننە دی‌وبەر پەرسیاری خۆیان لەگورج‌و گۆڵی کۆمەڵدا ئەخەنە ئەستۆ . ئەم کۆمەڵانە هەر بەوەوە ناوەستن کەسەکانیان فێری دەستدایی‌و سەرشۆڕی بۆ بنەرەتیەکانی بکات ، بەڵکو لەرێی ئاهەنگ‌و نەریت‌و پەیرەوە جیاوازەکانەوە ئەو پەیوەندیانە توندو چەسپاو بکات کە بەیەکیانەوە ئەبەستێت . بەڵام چەند کۆمەڵێک ناتوانێ نیازو خواستی ئەندامەکانی بهێنێتەدی ، لەبەر ئەوە ڕوو ئەکەنە کۆمەڵانی تر هەتا ببنە ئەندامی . ئەمەش ژمارەیەکی زۆری دەستدایی پەیدا ئەکات‌و ئەبێتە هوی پەیدابوونی کێشەو گیروگرفت بۆ ڕیکخستن یان بۆ پەیدابوونیان لەناو ڕێکخستنەکە دا . ئیتر ئەوە ماوە بڵێین کە لەوانەیە کۆمەڵ زۆران بازی لەناو بەشەکانیدا بەدی‌بکات . ئەم زوران بازی‌یەش دژواری پتەوی‌یە ، بەڵام مەرج نی‌یە وەهاش بێت . چونکە ڕوو ئەدات زورانبازی کومەڵ زیاتر یەک ئەخات‌و بەیەکەوەی ئەبەستێ .

**ئاڵ‌وگۆڕی‌ی کۆمەڵایەتی :**

نووسەر خاسیەتە بنەرەتیەکانی کۆمەڵە ڕێکخراوەکان ئەخاتە بەردەم ، وای دائەنێ‌و بۆی ئەچێ کە ئاڵووگۆڕی لە نێوان ئەو بەشانەی کۆمەڵیان پێک هێناوە ، یاخود لە نێوان کۆمەڵگاکاندا گرنگی‌یەکی گەورەی هەیە ، بەرادەیەک لە گرنگێتی دەستدایی بۆ کۆمەڵ کەمتر نی‌یە ، جا ئەگەر ئەندامەکان لەرێی

دەستداییەوە بەیەکەوە ئەبەسترێن ، ئەوە بابەتی ئاڵ‌وگۆڕی کۆمەلأیەتی یارمەتی ئەوە ئەدات کەم‌و زۆر ئەو دەستداییە بێتە دی . ئەمەش ئەوە ئەگەیێنێ تا چ‌رادەیەک ئەم بابەتانە بەیەکەوە لکاون بە نیازی یارمەتی‌دانی کۆمەڵەوە .

ئاڵگۆڕ لەسەر بناغەیەکی پتەوی پەیوەندی‌یە کۆمەلأیەتیەکان وەستاوە ، کە بریتی‌یە لە پێویستی هەمیشەیی تاک بۆ خەڵکانی‌تر بەنیازی تێرکردنی پیویستی‌یەکانی ، ئاڵوگۆڕ ئەبێتە هوی ئاسان کردنی پەیوەندی نێوان خەڵکان بۆ تێرکردنی پێویستی‌یەکانیان . بەم جۆرە ئاڵ‌وگۆڕ ئەبێتە هۆی هاتوچۆی کەل‌و پەل‌و ئیش وهەست بیروباوەر لە نێوان پارچە کۆمەلأیەتیەکان‌و لە نێوان ئەندامەکانی ئەم پارچانەدا . لە هەمان کاتیشدا ئاڵوگۆڕ ئەبێتە هوی دابەش کردنی کار کە بەردی بناغەی راستەقینەی هەموو ڕێکخراوە کۆمەلأیتیەکانە . هەر لەبەر ئەمەش کاریەکێکە لە خاسیەتەکانی کۆمەڵ ، پەیوەندی لە نێوان ئەوو دابەش‌کردنی کاردا پەیدا ئەبێت . ناوەڕۆکی دابەش‌کردنی کار باس هەمەجۆری ئەو دەوررو پایانە ئەکات کە کەسان لە کۆمەڵدا هەیانە . ئەم هەمە جۆری‌یە لە کۆمەڵگا سادەکاندا لەسەر بناغەی تەمەن یان نێرو مێی‌و هێزو توانای لەش وەستاوە . ئەوی راستی‌بێت جیاکردنەوەی دەورو پایە لەسەر بناغەی تەمەن‌و نێرو مێی لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەیە ، واتە لە کۆمەڵگایەکی سادەوە بگرە تا کۆمەڵگایەکی تێکەڵاو . بەلأم بۆ ئەوەی کۆمەڵگا بگاتە پلەیەکی بەرزی هەمە جۆری وەزیفی ، پێویستی بە پێگەیشتنی تەکنەلوجیا هەیە ، لەگەل رژێمێکی ئابووری وەهادا بتوانێت کەل‌و بەلێکی زور بۆ ژیانی پسپورەکان بەرهەم‌بهێنێ .

بەم جورە تەکنەلوجیای پێگەیشتوو ئەتوانێ بەرهەمێکی زیاد بدات تا کۆمەڵگا بتوانێ پسپۆرەکانی مەیانی کۆمەلأیەتی‌و ئاینی‌و رۆشنبیری بژێنێ . ئەوانەی بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری بەرهەم‌هێنان ئەکەن .

**جڵەوگرتنی کۆمەلأیەتی :**

ئەوی راستی بێت ڕێکخستنی کۆمەلأیەتی لە بنەرەتدا لە یەکگرتنی سێ بابەتەوە دروست‌بووە ، واتە : دەستدایی ، ئاڵ‌وگۆڕ ، جڵەوگرتنی کۆمەلأیەتی ، بەم جۆرە جلەوگرتنی کۆمەلأیەتی ئەبێتە بابەتی سیهەم ، ئەو بابەتەی لەرێی بنکە فەرمانیەکانێوە ئەتوانێ کاربکاتە سەر کەسان ، ئەو بنکانەی تواناو مافی سزا دانی هەیە . راستی‌یەکەی ئەوەیە هێز لەهەموو پەیوەندی‌یە کۆمەلأیەتیەکانداو سزاش لەهەموو دەورە کۆمەلأیەتیەکاندا هەن . بەم جۆرە هێز ئەبێتە دیاردەیەکی مەقبوول بگرە ئەبێتە دیاردەیەکی مەشروعیش . لەبەر ئەمە بوونی ئامێرەکانی جلەوگرتنی کۆمەلأیەتی وەکو هێزی چولیس ، رووخسارێکە بۆ ئەوەی لەم کۆمەڵگا مرۆڤی‌یە نویێ یەدا شەرعیەت بدات بە هێز . بەلأم هەمووان بەیەک جۆرو بەیەک چاو سەیری بنکە فەرمانیەکان ناکەن کە لغاوی رەوشتی خەڵکی ئەکات . ئەگەر هاتوو ئەم بنکانە بلأوبوونەوەو خەڵکی دانیان پیامانا ، بە جۆرێك بیبێتە بەشێك لە بوونی کەسان ، ئەوە ئەبێتە ئەو شتەی نووسەر ناوی ( رژێمی پێوانە )ی لیێ ئەنێ ، .

ئەم رژێمە ئەو بنکەو یاساو حوکمانە کۆنەکاتەوە کەرێ پیشانی رەوشتی ئەو کەسانە ئەدات کە چەند پایەیەکی جیاوازیان هەیەوەدەوری جیاواز لەناو کۆنەمەڵدا ئەبینن .

**چوارەم : باکگراوندی « پاشەڵی » کۆمەڵگای هاوچەرخ :**

ئەگەر سێ بەشی یەکەمی کتیبەکە بە زۆری بۆ ئەوە تەرخان کرابێت لەو چەمکە سەرەکیانە بدوێت کە زانایانی کۆمەڵگا ناسین بۆ لێکۆڵینەوە وشی کردنەوەی ژیانی کۆمەلأیەتی ڕیکخراو هەموو ئەو بابەتانەی تیایەتی وهەموو ئەو کردارانەی تیایا روو ئەدات ، دانابێت ، بێ ئەوەی چاو ببر نەچەرخێکی مێژوویی دەست‌نیشان‌کراو ، ئەوە بەشی دوایی کتیبەکە کەبەباك‌گراوندی کومەڵگای هاوچەرخ ئەودوێت هەوڵدانێکە بۆ ئەوەی لێکۆلینەوەیەکی وەسنی گشتی باك‌گراوندی مێژوویی کومەڵگای نویێ بدرێت بە قوتابیان ، لەسەر یئەو بناغەیەی گوایە ناسینی کۆمەڵگای کۆنەکان‌و هەموو ئەو گورینانەی بە سەریانا هاتووە ، بۆ قوولێ بوونەوەو تێگەیشتنی ژیانی هاوچەرخ‌و مرۆڤی نویێ پیویستە . لە سەرەتادا بەوە دەست پی‌ئەکات ، ڕێبازە سەرەکی‌یەکانی شی‌کردنەوەی ئەو گۆرینانە ئەخاتە بەردەم کە بەسەر کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکاندا هاتووە دووای ئەوە دێنە سەر وەسنی ڕێکخستنی کۆمەلأیەتی زنجیرەیەك لە شێوە کۆمەلأیەتیەکان کە گورنییان بەسەردا هاتووە ، ئەوەش بەم جۆرەیە : کۆمەڵگا میللی‌یەکان ، دەرەبەگی ، پێش پیشەسازی ، شارستانی کشتوکاڵی . لیرەدا نووسەر بە کورتی باسی تیوریەکەی سیرهنری مین (١٨٥٤) ئەکات کە دەربارەی ئەو کۆمەڵگایانەیە کە لەسەر پایە یان شوێن بەرزی دامەزراون‌و دووایی پیشکەوتوون‌و بوونەتە کۆمەڵگایەك لەسەر رێك‌کەوتن دامەزرابێت ، هەروەها تیوریای فەردیناند تونیس (١٨٨٧) کە دەربارەی ئەو کۆمەڵگایانە ئەدوێت لەسەر پەیوەندی خزمایەتی‌و

پەرژەوەندی گشتی دامەزراون‌و دووایی ئەبنە کۆمەڵگایەگ لەسەر پەیوەندی نێوان بازارو پەرژەوەندی خۆیی دامەزرابێت . هەروەها تیوریای دورکیم دەربارەی هاریکاری ئامێری‌و هاریکاری زگ‌ماکی‌و تیوریای شارل‌کولی دەربارەی پەیوەندی‌یە سەرەتاییەکان . هەموو ئەم تیوریانە لە بیروارایەکی سەرەکی ئەدوێن ئەوەش ئەوەیە کە کۆمەڵگا لە شیوەیەکەوە ئەگورێت بۆ شێوەیەکی تر ، وئەوەش ئەخاتە بەردەم کە تا چ رادەیەگ زانایان ئاوریان لەم کێشەیە داوەتەوە وبەلایانەوە گرنگ بووە . جا بۆ تێگەیشتنی هەموو لایەکی ئەم گۆرینە پیویستە لیکۆڵینەوەیەکی بەشی کۆمەڵگای پێش پیشەسازی‌و خاسیەتەکانی رێکخستنی کۆمەلاَیەتی لەناویدا بەم جۆرەی باسی ئەکەین بکرێت :

**رێکخستنی کۆمەلاَیەتی کۆمەڵگای میللی :**

رێکخستنی کومەلاَیەتی لەم کۆمەڵگایەدا تارادەیەکی زۆر بەرز پتەوو یەکگرتوو خاوەن دەستدایە . ئەمەش بەهۆی هاورێکی ئەندامەکانی‌یەوەیە . جگە لەمەش باوو نەریتی هاوبەشی‌و پەیوەندی خزمایەتی ئەبێتە هۆی هێنانەدی پلەیەکی بەرزی جلەوگرتنی کۆمەلاَیەتی .

ئەمە لەکاتێکدا هیچ جۆرە ئامێرێکی‌میری‌و هیچ جۆرە شێوەیەکی دیموکراتی سەرەتایی تیا بەدی ناکرێت ، هەموو کەسێك لەم کۆمەڵدا بە چاوێکی بەرێزە سەیری باوو نەریتەکان ئەکەن ، کە دەورێکی بالاَیان لە ژیانی خەڵکیدا هەیە . روبرت ردفیلدی ئەنثروپولوجی ووتارێکی نووسیوە وێنەیەکی نموونەیی دەربارەی ئەم کۆمەڵگایە پیشان داوە . ( ووتارەکە لە شوێنێکی‌تری ئەم کتیبەدایە) . هەر چەندە رەخنەیەکی زۆر لەم کتیبە گیرا بەلاَم توانیویتی گرنگ‌ترین خاسیەتەکانی کومەڵگا سەرەتاییەکان پیشان بداتو ، کە خۆی لە خۆیا جۆرە بارمەتیەکە بۆ تێگەیشتنی کومەڵگا تێکەلاَوەکان .

**شار پێش پیشەسازی :**

بەرای ردفیلد شارستانێتی دەورێکی هەرە گرنگی هەبوو بۆ ئەو گۆرینەی بەسەر کومەڵگای میللی دا هات . بەلاَم چریون سوبرج لەو ووتارەیدا کە بە ناوی ( شاری ، پێش پیشەسازی ) دژی ئەم رایە ئەوەستێت . بەرای ئەم سەرتای ژیانی شارستانێتی خاوەنی خاسیەتی باوی بوو ، ئەمەش وای کرد پیشەوازی‌و نەك شارستانێتی بێتە هۆی گەورەی ئەم گۆرینە . ئەوی راستی بێت ئێمە ناتوانین پیشەوازی‌و شارستانێتی لەیەك جیا بکەینەوە . لەبەر ئەوەی کارو کردەوەی هەر دووکیان بە زۆری بەیەکەوەن ، چونکە ئەبینن چۆن کۆمەڵگا پیشەسازی‌یەکان لە هەمان‌کاتدا کۆمەڵگای شارستانیشن .

پلەی پیشەوازی هەرچەند پەرەبسێنێ ، ئەوەندەش رەنگ ئەداتەوە سەر دیاردەی شارستانێتی لە کۆمەڵدا .

**کۆمەڵگای شارستانێتی کشتوکاڵی :**

شارەکانی پێش پیشەسازی ، ئەگەرچی بە گوند دەوردرابوون و وەکو ردفیلد ئەڵێ لە کومەڵگای میلی‌یەوە نزیك بوو بەلاَم لەزۆر رووشەوە لێ‌ی جیا بوو ، بەهۆی ئەو پەیوەندی‌یە بازرگانیانەی لەنێوان‌ئەوان‌و شارەکاندا پەیدا بووبوون . ئەم پەیوەندیانە بوونە سەرچاوەی کۆرینێکی بێ‌وەستان ، ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی شێوەیەکی کومەلاَیەتی نوێ ، واتە کومەڵگای شارستانیتی کشتوکاڵی . لیرەشەوە بە سەرنجێکی ئەقڵی‌یەوە سەیری کارو ئیش‌کردن ئەکات . زنجیرەیەگ دەوری نوێ پەیدا بوو گوندو شارەکانی بەیەکەوە ئەبەست ، ئەوسا ئەو رژێمی دەرەبەگایەتی‌یە کەوتە پەیدابوون کە بریتی بوون لە ژمارەیەکی پرش‌و بلاَوی شاری پێش پیشەسازی بە گوند دەوردراو .

**کۆمەڵگای نوێ :**

بەشی دووایی کتێبەکە دەبارەی لێکۆڵینەوەی مرۆڤە لە کۆمەڵگای نوێ‌دا . هەوڵدانێکە بەو نیازەی هێزە سەرەکی‌یەکانی ئەم کومەڵگایە دەست نیشان بکات ، لەگەلّ وەسف‌کردنی ئەم هێزانە لە چوارچێوەی رێکخستنی کۆمەلاَیەتیدا .

بەم بۆنەیەوە سێ دیاردە پیشان ئەدات کە خۆیان بەسەر کۆمەڵگا نوێ‌یەکاندا ئەسەپێنن‌و برتیین لەمانە : دیاردە بیرۆکراتیەکان ، کۆمەڵگای جەماوەری‌و بزووتنەوەی کۆمەلاَیەتی :

**بیرۆکراتیەت :**

هەرچەند قەوارەی کۆمەڵگای نوێ زیاد بکات ، پرۆژەکانیش گەورە تر ئەبن وقوتابخانەو خەستەخانەو دەستگا سوپاییەکانی‌و شتی تر بلاَو تر ئەبن‌و ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کەسان‌و بەشە کۆمەلاَیەتی‌یە بچووکەکان لەلایەن رێکخراوە

گەورەکانەوە قووت بدرێن . هەر چەندە مەرج نیەو پێویستیش نی‌یە ئەم رێکخراوانە ببنە رێکخراوی بیرۆکراتی بەلاٌم وا رۆشتووە روو بکەنە جۆرو شێوەی بیرۆکراتی لە خۆرێکخستنی کۆمەلاٌیەتی‌کاندا بەلای ماکس فیرەوە بیرۆکراتیەت لەهەموو جۆرەکانی تری رێکخستنەوە بەتواناو گورج ترە . بەلای ئەوەوە بیروکراتیەت بریتی‌یە لە بەکارهێنانی دەسەلاٌتێکی مەشرۆع لەرێی دەستگایەکی بەرێوەبەرایەتی کارکەرانەوە فیر ، دە مەرج وپێوانە بۆ بیرۆکراتیەت دائەنێت ، ئەگەر هەموو ئەو دە پێوانەو مەرجانەی تێدا بێت ئەوە رێکخستنێکی نموونەیی بیرۆکراتیەت دێتە دی .

لەم رێکخستنەدا دەسەلاٌت بە خەلکی‌یەوە نەبەستراوە بەلاٌم بەشێکە لە رژێم خۆی . هەر ئەمەشە کە بووەتە هۆی بناغەیی کارامەیی ئەم رژێمە . چونکە دەسەلاٌت لە خەلکی جیائەکاتەوە ، ئەو دەسەلاٌتی خەلکی لە پێناوی دەست خستنیدا شەری لەسەر ئەکەن . شتێکی ئاشکرایە رەخنەیەکی زۆر لەم شی‌کردنەوەی ماکس فیر گیرا ، بەتایبەتی لەسەر رۆشنایی لێکۆلینەوە نویەکانی رێکخراوە کۆمەلاٌیەتیەکان . رەنگە گرنگترین ئەو رەخنانە ئەوەبێت کە دەربارەی پشت‌گوێ خستنی دەوری رێکخستنی نارەسمی لە پشتگیرکردنی ریکخستنی رەسمی‌دا ئەدوێت ، یان پێچەوانەوە رێ‌لی‌گرتنی بەرادەیەک ریکخراوەکە نەتوانێ بەو توانایەو بەپێی ئەو مەرجانە بجوولێتەوە کە فیر بۆی داناوە . ئەمە جگە لە چەند دیاردەیەکی نەخۆشاوی تر کە چەند لێولینەوەیەکی نوێ دەربارەی رێکخستن ئاشکرایان کردووە . یەکێک لەو لێکۆلینەوانە هینەکەی پیتەر بلۆیە دەربارەی پەیوەندی نێوان منافسە بەربەرەکێشی‌و بەرهەمهێنان ولێکۆلینەوەکەی ئەدوارد جریز دەربارەی ئەوەی چۆن بیروکراتیەت ئەتوانێ لە دەسەلاٌتدا بمێنێتەوە .

**کۆمەلگای جەماوەری‌و کۆمەلگای زۆرداری : ویسپۆت .**

ئەم پەرەسەندنە زۆرەی پارچە کۆمەلاٌیەتیەکان‌و توانەوەی کەسان لەناو دەستگا بیرۆکراتیەکانداو ئەو باوەرە بلاٌوەی گوایە لە هەموو شوێنێکدا بیرۆکراتیەت بووەتە هۆی ئەوەی بەو چاوە سەیری کۆمەلگای نوێ بکرێت ، وەك کۆمەلگایەکی جەماوەری بێت ، ئەم چەمکەش دووایی خراپ بەکراهێنرا وەکو چۆن بۆ بیرۆکراتیەت خۆی بەکارهێنرا . هەندێك ئەوەی تیا بەدی ئەکات کە بریتی‌یە لەوەی رۆتین‌و پەیوەندی ناشەخسی دەستی بەسەردا گرتووە . هەندیکی تریش ئەوەی تیا ئەبینێ کە بریتی‌یە لەوەی دەستگا ئابووری‌یە گەورەکان لە سەر شانی موستەسمیرە بچووکەکان هەتابێت‌و بێ‌وەستان گەورە تر ئەبێت . بگرە هەیە لەو رایەدایە کە بەبێ بەشدار بوون لەم یان لەو رێکخراودا کەس ناتوانێ لە کۆمەلگای نوێدا بژی . سەیر ئەوەیە یەکێك لە زانا کۆمەلگا ناسەکان لەم رووەوە ئەدوێت‌و ئەوە دەست نیشان ئەکات کە تاك (لە کۆمەلگای رۆژئاوادا) لە دەستگایەکدا لە دایك ئەبێت‌و لە دەستگایەکیشدا ئیش ئەکات و لە دەستگایەکدا یاری ئەکات‌و هەتا کە ئەشمرێت ئەبێ میری رێگای ناشتنی بدات . میریش وەکو ئاشکرایە دەستگای هەرەگەورەیە .

ئەوی راستی بێت ، تێگەیشتنی کۆمەلگای جەماوەری پیویستی بە تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان دەستەی هەلبژاردەو جەماوەردا هەیە . لەبەر ئەمە ، ئەم کۆمەلگایە بەوە ناو ئەبرێت کە بریتی یە لەو پارچەکۆمەلاٌیەتیەی جەماوەر لەناویا ئەتوانێ کار بکاتە سەر هەلبژاردە ، بێگومان ئەوەش لە توانادایە دەستەی هەلبژاردە ئەوەی بۆ هەیە سەرباز لە جەماوەر بگرێت‌و بۆکاری خۆی بەکاری بهێنێ . لەبەر ئەمە لە کۆمەلگای زۆردارا نماوکردنی جەماوەر ئاسانە ، چونکە لە توانادا نی‌یە بگاتە دەستە هەلبژاردە ، لەبەر ئەوەی هەموو وەسیلەکانی دەم‌کوت کردن‌و رێ پیشان دان‌و بەرهەمی زانستی‌و هونەری بەدەست ئەوەوەیە . جگە لەوەش جەماوەر ئەو تواناو چەکە کۆمەلاٌیەتیانەی بە دەستەوە نی‌یە تابتوانێ بو بەرهەلستی کردنی دەستەی هەلبژاردە پشتیان پێ ببەستێ . ئەمەس لەرێی دوو ووتارەوە روون کراوەتەوە . یەکێکیان باسی دیاردەی سەرپەری‌و نارەزایی دەربرین ئەکات وەك رەوشتێك بێت لە چوارچێوەی کردەوە سیاس‌یە مەشروعەکانەوە هاتبێت .

ئەوی تریشیان بزووتنەوە کۆمەلاٌیەتیە پان‌و فراوانەکەی سالاٌنی شەست‌و حەفتا شی ئەکاتەوەو بەدیارترین دیاردەکانی کۆمەلگای هاو چەرخیان دائەنێت .

بزووتنەوەی کۆمەلاٌیەتی :

ئەمەش باسی ئەوە ئەکات چۆن لەکۆمەلگادا خەلکی ، تاك بێ یان کۆمەل لە شوێنێکەوە ئەچێت بۆ شوێنێکی تر . ئەمەش ئەبێتە هۆی گۆرینی بینای چینایەتی کومەلگا . جا ئەو

بزووتنەوەیە کۆڵەکی یان ئاسوێنی بێت‌و لە ژیانی کەساندا بێتەدی ، یان لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر بروات . بزووتنەوە چەمکێکی دیموکراتی‌و بینائیە ، هەمە جۆری ڕەوشتی تێدایەو بەرمەتی تێگەیشتنی کۆمەڵگا ئەدات .

ئەو هۆیە بناییانەی کارئەکەنە سەر بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی . ئەوە نووسەر لە چوارچێوەی کۆمەڵگای ئەمەریکادا لی‌یان ئەدوێت . ئەمەش ئەگەڕێتەوە سەر سێ هۆی سەرەکی : گۆڕینی بێوەستان لەو پلەو وەزیفانەدا کە پیویستسان بە پڕکردنەوەیە . گوڕینی ڕای کومەڵگا بەرامبەر هەمە جۆری پایەو مەرکەزو ڕادەی منالْ بوون لە هەموو چینێکدا . دووایی نووسەر دێتە سەر ئەوەی دیارترین خاسیەتەکانی کۆمەڵگای پیشەسازی نوێ کورت بکاتەوە وبیخاتە بەر دەم کە بریتین لە : بیروکراتیەت‌و چینایەتی‌و ئەو بزووتنەوەیەی لەسەر کارامەیی وەستاوە . لەگەڵ ڕێکخستنی پیشەسازی بۆ کارکردن ، هەروەها چەند سرشتێکی تر کە بۆی هەیە پەیوەندی‌یە باوەکان لەناو خەڵکیدا لەناو بەرێت .

**ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی‌و جۆری ژیان :**

لەکۆتاییدا نووسەر ئەیەوێ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی وەك باسێکی زانستی کۆمەڵگا ناسین بێ ، لەگەڵ جۆری ئەو ژیانەی خەڵکی لە کۆمەڵگای هاو چەرخدا تیا ئەژی ، بەیەکەوە ببەستێت . لێرەشدا ئەو بیرە دێتە کایەوە کە بریتی‌یە لەوەی ، سیفەتی مرۆڤایەتی داوای بەشداربوونی ژیانی کۆمەڵان بە جۆرێکی ڕێکخراو هاورێکی ئەکات . لەگەڵ دووپات کردنەوەی ئەوەی کە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیەکان بوونێکی خۆیی سەربەخۆیان هەیە ، واتە سەربەخۆیە لە نیازو خواستی ئەو کەسانەی پێکیان هێناون . لێرەدا پەیوەندی نێوان ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی‌و جۆری ژیان قایم ئەبێت . جۆری ژیانیش ئەمانگەڕێنێتەوە بۆ ڕادەکانی ئەو چوار شی‌کردنەوانەی لە سەرەتای ئەم باسەدا بەم جۆرەی خوارەوە دەست نیشانمان کردن :

أ – ڕادەی زگ‌ماکی : ئەمەش بریتی‌یە لەوەی هەموو ئەو شتانەی پێگەیشتنیکی تەواو بۆ مرۆڤ دەست ئەخات ، وەکو خواردەمەنی باش‌و هەوای پاك‌و ئاوی خواردنەوەی بێ‌گەردو شوێنی ژیان‌و ئاوڕلی‌دانەوەی پزیشکێتی .

ب – ڕادەی سایکۆلۆجی : بریتی‌یە لە ڕژێمێکی فێرکردن منالْ پەروەردە ئەکات لەگەڵ پێویستی‌یەکانی تەندروستی دەروونی . ئاسایش ونەترسان لە ژیان ، ئەو ژیانە خۆشەی پێویستە کۆمەڵگا بۆ کەسانی خۆی ئامادە بکات .

جـ – ڕادەی کۆمەڵایەتی : بریتی‌یە لە ڕێکخستنی ڕێگاکانی بەرهەم هێنان ، لەگەڵ نا مەرکەزیەت‌و ڕێگاکانی جڵەوگرتن . هەروەها دەوری دەستە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکان لە کردەوە سیاسی یەکاندا .

د – ڕادەی ڕۆشنبیری : ئەمەش بریتی یە لە یارمەتی دان‌و پاڵ پشتی‌کردنی دەوڵەت بۆ شانۆو سینەماو تەلەفیزیۆنی فێرکردن‌و هونەری پلاستیکی .

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕادانەدا نووسەر ئەو ڕاستی‌یە ئەخاتە بەرچاو کە جۆری ژیان لە ئەمەریکا (کە لێکوڵینەوەکە بەتایبەتی لەسەر ئەوە) لە ساڵانی حەفتادا بەرەو خووار ئەبێتەوە . هەرچەندە بیرورا بەرامبەر ئەم کێشەیە جیاوازە ، بەڵام دووایی دەسەڵات نی‌یەو ئەو پرسیارە گرنگە دێتە کایەوەو خۆی ئەسەپێنێ . ئەو پرسیارەی دەربارەی دۆخی تاکە لە کۆمەڵگادا . ئەپرسێ . ڕێکخراوی وە ها چەسپاو هەیە کەسان بەشداری بکات بەو نیازەی خۆی‌و بەرژەوەندی‌یەکانی بپارێزێت ؟ ئایا کەس لەو ڕایەدایە . لەتووانادا بێت جۆری ژیان بۆ ئەوو بۆ کەسانی تر باشتر بکرێت ؟ ئەوی ڕاستی بێت ، جۆرە ڕەش‌بینی یەك لە کۆتاییدا تووشی نووسەر ئەبێت‌و چەند کێشەیەك ئەخاتە بەردەم کەبەتەواوەتی هەقی خۆی نەداونەتێ ، چ لە ڕووی لێکۆڵینەوە یان لە ڕووی گفتوگۆوە . ئەمەش لەبەر ئەوەیە کتێبەکە ئەیەوێت ژمارەیەکی زۆری بیرورا کۆبکاتەوەو یەکیان بخات . ئەمەش بێ‌گومان کارێکی گرانە . بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا . کتیبەکە ئەمەندە باسی هێناوەتە کایەوە ، ئەوەندە لیکوڵینەوەی خستۆتە بەردەم ، ئەمانە بەسەریەکەوە وا ئەکەن ئەم کتێبە ببێتە کتێبێکی لێکوڵینەوەی باش لە زانستی کومەڵگا ناسیندا .

گورینی : د . کاوس قەفتان
لەگۆڤاری « جیهانی بیر»
ئەیلولی ١٩٨١
بەغدا

# «قوتابخانە شانۆییەکەی ئەلکساندەر تایرۆف»

نووسینی : کمال عبد
وەرگێرانی : یاسین قادر بەرزنجی

پێشەکی :-

بەدوای سەرنەکەوتنەکەی شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥ لە ڕووسیای غەیسەریدا ڕەشبینی و بیراوڕەی تەسك لەئەدەبکانی ڕووسەکاندا دەنگی دایەوە ئەوەبوو ڕەشبینییەکە لەهونەرەکەیاندا بەگشتی و لەشانۆکەیاندا بەتایبەتی دەبیزا ، لەم کاتەدا دەوری هۆشیاو چاپووکی « ستانسلافسکی »ی دەرهێنەر دیارە کەهەوڵی دا شانۆکەیان ڕووەو شێوازێکی تر مل بنێ ، ئەوەبوو ئەم شێوە نوێیەیان ناونا «قووڵایی بە هونەرییەکان» . . ئەم شانۆیە کاری زانستە دەروونییەکانی لەسەر شانۆی نوێ فەرامۆش نەکرد . هەروەها بایەخی بەڕێگاکانی دەربڕینی ئەکتەر دا ، بێجگە لەوانەش پاڵپشتەکانی دەوروبەرو پێوەندیی هێڵە تێکگیراوەکان و بارە ئاڵۆزەکان بەو ژیانەی دەورە شانۆییەکە دەیخولقێنێ ڕەچاوکرا ، هەربۆیەو لەبەر ڕۆشنایی ئەو خاڵە هونەرییانەی زەمینەکەی بەماوەیەکی دوورودرێژ خۆش کرا شانۆی نوێ توانی دەستوورێکی هونەریی ئەوتۆ دیاری بکات کەتا ئەمڕۆ پێوەی ناسراو دیاربێ ئەوەبوو قوتابخانە شانۆییەکەی ستانسلافسکی دامەزراو بەدوایدا دوو قوتابخانەی تری دژ ستانسلافسکی لەلایەن (مایرهۆلد Mayerhold و تایرۆف Tairov ١٨٨٥ – ١٩٥٠)وە دامەزرێنران ، ئەمەش ڕەسەنی هونەرەکەو بەها جەوهەرییەکانی دەسەلمێنێ .

ئەم قوتابخانەیەی دوایی یان هەوڵی دا کە لە شانۆدا نواندن و دەرهێنان ببنە قوتابخانەی پێشڕەو . . . مایرهۆلدو تایرۆف لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کەخاڵی دەستپێکردنیان لە دژ وەستاندنەوەوە بێ ، بەڵکو هەندێ جاریش بەتەواوی بنچینەو بنەماکانی قوتابخانەکەی ستانسلافسکیان ڕەت دەکردەوە ، ئەوەبوو مایرهولد بۆئەوە دژ وەستانەکەی خۆی بسەلمێنێ شانۆکەی ناونا نامەقوولێ یان نامەنتیق Absurd هەرچی یەکی پێشکەش دەکرد دژبەواقیع و هۆشی مرۆڤ بوو ، « تایرۆف »یش هەرچەندە لەبیردۆزەکانی مایرهۆلد کەسەبارەت بە «هەڵچوون»ن نزیك بوو ، هەوڵی دا لەلایەنی پێکهێنانی هونەرییەوە بیردۆزەی نوێ بخاتەڕوو ، قوتابخانەکانی هەردووکیان لەبنەماکانی هونەری ئەکتەرەوە نزیك بوون لەیەکەوە بەڵام لەشێوەی دەرەوەدا لەیەکتر دوور دەکەوتنەوە . .

بۆ دڵنیابوون لەو خاڵە چەند ڕایەکی تایرۆف خۆیەتی کە لەژمارەیەکی گۆڤاری « شانۆ »دا ساڵی ١٩٠٨ دەری بڕیون و دەڵێ :-

١ – هونەری ئەکتەر پێویستی بەشێوەیەکی نوێیە لەنواندندا ، شێوەیەك دووربێ لە لەراندنەوەی درۆزنانەی دەنگ و شەپۆلەکانی ، دووربێ لەگۆڕینی دەنگ بەگریان و نووزەنووز کەهەندێك لەئەکتەرەکان وادەزانن بەوە دەنگیان خۆش دەبێ .

٢ – بادەنگی ئەکتەر گشتی کات لەدرێژبوونەوەدا بێ و ئاشکرا ببیسترێ ،، ئەبێ وەك ئەو دڵۆپە ئاوە دەنگی بێ کە لەبەلووعەیەکەوە دەکەوێتە ناو بیرێکی قووڵەوە .

٣ – کەمکردنەوەی لەرینەوەی بێسەروشوێنی دەنگ ، ئەم خاڵە دەربڕینی ئەکتەر بەهێز دەکاو لەهەموو دڵ ڕەقی یەك دووری دەخاتەوە و نواندنەکەی جوان و پەسەند دەکات ، هەروەها دەبێ ئەکتەر ئاگای لەجوڵانەوەی دەستەکانی بێ و زۆر بەسنگ و زگ و لەشی خۆیدا نەکێشێ ، گرنگ هەڵچوون – انفعال –ی ناوەوەیەو بەرجەستەکردنی هەستپێکردنی ئەو هەڵچوونە زۆر پێویستە ، بێگومان ئەوەش بەهۆی چاوو لێوو پلەی دەنگەوە دێتەدی .

٤ – دەربڕین و درکاندنی ووشەی لەدەمەوە دەبێ بەجۆرێك بێ ڕەنگدانەوەی هێمنی دەرەوەی ئەکتەرو بورکانی ناوەوەی دەربخات .

٤ - چوونەناو چوارچێوەی دەورەکەو دەرخستنی هەڵچوونەکانی ئەمەش پێوەندییەکی تونلوتۆڵی بەناوەرۆکە ئەدەبیو هونەرییەکەی شانۆگەرییەوە هەیە» .

٥ - ڕێك‌وپێکی لەدەربڕیندا و پەلەنەکردن لەکاتی قسەکردندا . . نەبێ مرۆڤ زاڵ بێ بەسەر دەورەکەیداو لەکاتی نواندندا دەبینێت . . چونکە نواندنی شپرزەو شێواو تەنها بۆ چەند دەورێکی دانسقەی وەکو شێت‌و مرۆڤی نائاسایی دەست‌دەدات .

٦ - گرنگی‌دان بەو دەورانەی تایبەتێتی خۆیان هەیەو «شاذ»ن ، وەك ئەو پاڵەوانە درامی‌یەی دەم‌وچاوی پێکەنیناوی بێ .

لەهەموو ئەو ڕێنومایی کردنانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەکتەر لای تایروف هونەرمەندی خوڵقێنەری شانۆیە . . . هەر لەبەر ئەوەش‌بوو کە ساڵی ١٩١٠ شانۆکانی ڕووسیا بوونە سێ‌بەشەوە :-

أ - شانۆی نووسەر :- ستانسلافسکی لەشانۆی هونەردا سەرۆکایەتی دەکرد .

ب - شانۆی دەرهێنەر :- بەسەرۆکایەتی مایرهۆلد .

ج - شانۆی ئەکتەر :- لەشانۆی تایرۆڤی بچکۆلەدا تایرۆڤ سەرۆکی بوو .

**ژیانی تایرۆڤ** :

ئەلکساندەر کۆفلافیچ تایرۆڤ ساڵی ١٨٨٥ لەئۆکرانیا لەدایك‌بووە باوکی مامۆستا بووەو خستوویە بەرخوێندن ، بەچاکی فێری زمانی ئەڵمانیو فەرەنسایی بووە ، بەباشی فێری مۆسیقاش بووەو ڕووی‌کردووەتە جیهانە فراوانەکەی هونەر ، کەچووەتە زانکۆ لەوێ لەگەڵ تیپی نواندنداکاری‌کردووە ، هەر لەم‌کاتەدا بووە کە هاوڕێیەتی لەگەڵ « فاختانکەف »ی دەرهێنەردا پەیداکردووە ، ساڵی ١٩٠٥ کەچووەتە تیپی شانۆی کۆمیسارچافسکی هەر لەوکاتەدا چووەتە کۆلێجی یاساو ساڵی ١٩١٣ دبلۆمی تیاوەرگرتووە .

ساڵی ١٩٠٥ سەرتای ئەزموونی هونەریی تایرۆڤە ، پاشان چووەتە ڕیزی « شانۆی گەڕۆك » و تاساڵی ١٩٠٩ شانۆگەریی بۆ دەرهێناون ، سەرۆکی ئەم شانۆی گەڕۆکە « بافیل جایجابوروف »ی قوتابیی ستانسلافسکی بووەو لەڕاو بۆچووندا لەگەڵ تایرۆڤی تازەپێگەیشتوودا یەکیان . نەگرتووەتەوە ، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی ماوەیەك تایرۆڤ واز لەشانۆ بهێنێ . . دوایی بەشێوەیەکی پچڕپچڕ بەشداری نواندنو دەرهێنانی کردووەو ساڵی ١٩١٣ لەشانۆی « مۆسکۆی ئازاد »دا بەدەرهێنەر دامەزراوە لەسەر ڕێگاکەی خۆی ڕۆیشت‌و دەستبەرداری بۆچوونو بیروراکانی نەبوو ، وای لێ‌هات دەستەیەك لەهونەرمەندان بەدەوریدا کۆبوونەوەو ساڵی ١٩١٤ لەمۆسکۆ شانۆی بچکۆلەی دامەزراند یەکەم ڕاگەیاندنی لەشانۆ بچکۆلەکەیدا خۆنەبەستنەوە بوو بەدەقی شانۆنامەوە ، کە ئەم خاڵە لای ستانسلافسکی گەلێك پیرۆزبووە لای تایرۆڤ دەستی شانۆنامە تەنیا کەرەستەیەکی خاوەو ماویە بگات‌و بخولقێ ، لای ئەو کەرەستەیەك بوو کە پێویستی بەتێپەڕبوون بوو بەچەند قۆناغێکی ترداو ئەوجا پێش‌کەش بکرێ ، لای ئەو ئەرکی دەرهێنەر گەڕان‌بوو بەشوێن دۆزینەوەی داهێنانی نوێ لەهونەری نواندندا ، گەڕان بەشوێل فێڵی شانۆیی لەپێناوی ئەکتەردا ، هەرچی دیکۆرو جل‌وبەرگیشە ئەوا هەردەبێ لەخزمەتی ئەکتەردا بێو هەموو ئەو خاڵانە لەخولقاندنی ئەکتەری سەربەرزو سەرکەوتوودان . .

لا تایرۆڤ دیکۆر دەبێ لەخزمەتی نواندندا بێو دەبێ بەچاکی مەیانی ڕووداوەکان دەرخات‌و بەدروستی‌کردنی جێگای دیمەنەکان تین‌وتاو بداتە دەرخستنی ڕووداوەکان کەساڵی ١٩١٧ شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەرپا کرا گشت لایەنە سیاسیو ئەدەبیو هونەرییەکان لەرووسیادا « یەکێتی سۆڤیەت » گۆڕانیان بەسەرداهات ، شانۆگەرییەکانی سەرەتای سەدەی بیست‌و دوای ئۆکتۆبەر سەرچاوەکەیان لەگەلەوە هەڵدەقوولا . . .

ئەوەبوو ڕۆمانو شانۆ لەو ڕێرەوەوە کەوتنەرێو بوونە خزمەتکاری میللەت . هەرلەم کاتەدا بوو کە تایرۆڤ ژمارەیەك شانۆنامەی دەرهێناو شێوازە نوێیەکەی خۆی پێ پتەوکردن . . . « فیدرا »ی لەساڵی ١٩٢١ پێش‌کەش‌کرد ، بەدوای ئەودا ساڵی ١٩٢٢ ئۆپەرێتی « جیرۆفلا »ی دابەزاند . . ساڵی ١٩٢٤ ڕووی‌کردە کلاسی‌یەکانی ڕووسیو شانۆنامەی ئەسترۆفسکی»ی نووسەری بەناوبانگی دەرهێنا پاشان . . . ساڵی ١٩٢٧ دەرهێنانی شانۆنامە بەناوبانگەکەی ئۆنیل « حەزێك » گرتە ئەستۆی خۆی . . . لە ١٩٢٩ دا « قوولەرەش »ی دەرهێنا ساڵی ١٩٣٠ش ڕووی‌کردە « برێختی »ی مەزنو « ئۆپرای سواڵەرەکان یال » ئۆپرای سێ پوولەکە»ی دەرهێنا .

بەهۆی ئەم شانۆنامانەی سەرەوەوە بەرچاوی زیاتر ڕۆشن‌بووەو لەگەیشتنی بەمەبەستەکانی خۆیەوە نزیکتربۆوە بۆیە دەبینین ، بەردەوام هەوڵی پتەوکردنی هونەری نواندن دەدات . . ساڵی ١٩٣٣ ئەوکاتەی شانۆنامە بەناوبانگەکەی فیسنیافسکی « کلۆڵی گەشبینی » دەرهێناوە گەیبوەتە لووتکەی مەرامو نیازی خۆی .

شتێکی ئاسایی‌یە کە بەهۆی سەکەوتنەکانی‌یەوە دەیان دوژمنی لێ‌ڕاستبووەتەوە ، لەوانەی کە لەکاری هونەری‌دا برادەری بوون ، بەلاَم هەرگیزاوهەرگیز تایرۆف لەبیروڕای خۆی پاشگەز نەبووەتەوەو نکوولی لەتەنها ڕایەکی خۆی نەکردووە هەربەو شێوەیەش ماوەتەوە . . تاساڵی ١٩٥٠ کە کۆچی دوایی‌کردووە .

**ئەکتەرو هونەری نواندن :-**

تایرۆف ئەڵێ : ( ئەگەر یەکێك لێم‌بپرسێ گرانترین بەشی هونەر کامەیە پی‌ی دەڵێم : نواندن ، خۆ ئەگەر پرسیارێکی تر سەبارەت بەئاسانترین بەشی هونەر کرا ئەوا دووبارە دەڵێم نواندن) .

ئەم قسەیەی تایرۆف ئەوە دەسەلمێنێ کەلەتونادا نی‌یە چوارچێوە بۆ هونەری نواندن دابتاشرێ ، هەروەها بەئاسانی بنەماکانی ناخرێتەروو . . لەهەمان کاتدا هونەری ئەکتەر پێویستی بەخۆناسانلون بەخەڵکی‌و دەبێ بەهاو جوهەری دەربخرێ بۆ پتەوکردنی ڕاکەشم پەنادەبەمەبەر یەکێك لەووتەکانی گۆردل گریج»ی گەورەی دەرهێنەران کەووتوویە : - ( شانۆ گشتی‌کات لەبەرەوپێش‌چوونو گۆڕاندایە ، گۆڕانەکانی خێراو تیژرەون ، بەلاَم هونەری نواندنەکەی پێویستی بەکاتی زۆرترەو چەند ساڵێکی دەوێ تا بەرەوپێشتر ئەڕوا) .

هەربۆیە ، ئەکتەر بۆئەوەی بگاتە مەرام دەبێ هەوڵی زور بداتو ئارەقی زۆر بڕێژێت . . . کەچاومان بەپیانۆژەنێکی سەرەتایی دەکەوێ هەست‌دەکەین جاریَ زۆری ماوەو پێویستی بەمەشقێکی زۆرە تا مۆسیقاژەنێکی هەڵکەوتووی لێ‌پەیدابێ ، خۆ ڕەنگە کابرا تەنها وەك حەزێك مۆسیقا لێ‌بداتو خۆی دانەنابێ بۆ ئەوەی بگاتە تیپێکی ئۆرکسترای گەورە . . ڕەنگە تەنها کاتی بێ‌ئیشیی خۆی پی‌پڕبکاتەوە ، باشە لەمەوەو لەم نەبوونەیەوە دەبێ چۆن ئەکتەرو هونەرەکەی ببینینەوە ؟ . . دەبێ بڕیارمان دەربارەی ئەو ئەکتەرە چی‌بێ کەسەری لەلەرینەوەی دەنگ دەرناچی‌و نازانێ گۆڕانێ بخاتە دەنگییەوەو فری‌بەسەر مەشق‌کردنی هەناسەدانەوە نی‌یە ؟ . . دەبێ چی بەو ئەکتەرە بووترێ کەئیقاعی هەڵچوونەکانی بۆرێك‌ناخرێ‌و بزووتنەوەکانی بێ‌حیساب‌ر خواروخێچە ؟ . .

کەواتە لەبەر ڕۆشنایی ئەو خالاَنەی سەرەوە نواندن هونەرێکی قورس‌و گرانە بۆیە پشت‌بەستن بەو ڕۆیتنە باوەی ئەکتەر دەترسێنێ گرنگە ، چونکە ئەو ڕۆتینە وای لێ‌دەکات بەهونەرەکەیدا بنووسی‌و هەولێ دۆزینەوەی گشت بنەماکانی نواندن دەدات لەهەمان کاتدا نواندن لای ئەکتەری هۆشیارو ڕاستەقینە هونەرێکی سووك‌و ئاسانە .

ئەکتەر بەهۆی نواندنەکەیەوە ڕووداوەکان دەخاتەڕوو و دیمەنەکان دەگەیێنێ شانۆی قایل‌کەریش ئەو شانۆیەیە کەگشت هۆیەکانی قایل‌بوونی لەهەگبەکەی‌دا حەشاردابێ ، ئەکتەر لەشانۆی تایرۆفدا بەووریاترین‌و بەئاگاترین کەس دانراوە ، چونکە ئەرکەکەی گرانەو خولقێنەری یەکەمینی شانۆگەری‌یەکەیە .

تایرۆف دەڵێ : - (ئەکتەر کاراکتەر بەخەڵکی ئاشنادەکاو وەسیلەی گەیاندنی شانۆنامەکەیە) لەمەوە دەری‌خستووە کەنواندن پابەندی ئەکتەرە . . لێرەدا وای بەچاك دەبینین کەنموونەیەکی تر لەجۆرەکانی هونەر بهێنینەوە ئەویش نیگارکێشە نیگارکێش هونەرمەندە ، کەرەستەکانی بریتین لە ڕەنگ‌و پارچەو پارچە قووماشێك وەسیلەش بۆ بەئەنجام‌گەیاندنی بەرهەمەکەی فلچەی دەستێتی ، ئاکامی هونەرەکەشی بریتی‌یە لەو بابەتەی نیگارکێشە هونەرمەندەکە بەبیریداهاتووە ، ڕەنگە بەرهەمەکەی لەدیمەنێکی سروشتی بەربلاَوەوە هەڵقوولابێ‌و ڕەنگیشە ژوورێکی داخراوی کپ‌ومات خولقێنەری بێت . . هەر ئەم نموونەیە لای ئەکتەر جۆرێکی‌تر ، ئەوەتا تایرۆف وای‌بۆچووە : (ئەکتەر هونەرمەندێکە کەرەستە خاوەکەی بریتی‌یە لە لەش‌و دەستەکانی‌و هەردووقۆڵی‌و سەری‌و قاچەکانی‌و چاوی‌ودەنگ‌و دەم‌و قسەی ، وەسیلەش بۆ بەئەنجام‌گەیاندنی کارەکەی مێشك‌و ماسوولکەکانێتی ، بۆیەئاکام گەیشتنی پەنادەباتەبەر کاراکتەرێکی دیاری‌کراوو بەهۆی چۆنێتی هەڵس‌وکەوتی دەورەکەیەوەو بەگوێرەی پێوەندی بەکاراکتەرەکانی ترەوە ئەوکەسەمان پی‌دەناسێنێ) . واتە هەمووشتێك هەر ئەکتەرەو هەر ئەکتەر بەتەنیاو بەس هونەرمەندی تەشکیلی بۆ بەرهەمەکەی قووماش یان مەرمەڕ یان

زیو یاخود برۆنز بەکاردێنێ ، بەڵام هەڵبژاردن بۆ هونەرمەندی تەختەی شانۆ نی یە ، بەستراوەتەوە بەشێوەی دەورەکەی و بەوگەشەسەندنە دراماییەی کاری تێدەکاو لەئەنجامدا لەناخی دا کاردانەوەکە دروست دەبێ . . هەندێك یاخود بابڵێین زۆرجار چۆنێتی دەورەکە لەگەڵ راو بۆچوونی ئەکتەردا دژبەیەکن لێرەدا ئەکتەر هەوڵدەدات لەروانگەی خۆیەوە تەماشای دەورەکە بکات و دەیەوێ بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆی هەڵس وکەوتی لەگەڵدابکات ، بێگومان ، لەم هەڵس وکەوت کردنەدا جۆری دەورەکەو تواناو هۆشی ئەکتەرەکە دەوردەبینێ ، ئەکتەر کارەکەی بەچەند قۆناغێکدا رەت دەکات و دواتا کامیش چۆنێتی و چەندێتی ئەکتەرمان بۆ دەردەخات .

لەشانۆی دێرینی هیندی یەکاندا کار بەجۆرێکی تر رۆیشتووە ، ئەوان ئەکتەریان بەگوێرەی هەڵکەوتنی لەش ولار هەڵبژاردووە ، تەنیا حیسابیان بۆ لێوی ئاڵ و چاوی کاڵ و ددانی درەوشاوەی جوان و ملی کەڵەگەت و گەردنی پان کردووەو خانەدانی ی ئەکتەرەکەشیان لامەبەس بووەو بەهیچ جۆرێك لەبەهرەی چاکی هونەری یان نەپرسیوەتەوە ، کەواتە بەوپێیە شانۆی هیندستانی کۆن دژ بەئەکتەر و هونەری نواندن بووە لای تایرۆف ئەو ئەکتەرەی نەتوانێ خۆی و دەورەکەی لەیەك جیابکاتەوە ، واتە گەر نەتوانێ لەنێوان شەخسیەتی خۆی لەژیانداو ئەو دەورەی پێی سپێرراوە دیوارێك دانێ ، ئەوا گیروگرفتی هەمەجۆر بۆخۆی دروست دەکات ، ئەمەش لەئەنجامی ئەوەوەیە کەزانیاری سەبارەت بەدەورەکەی کەمەو بەباشی لێی نەکۆڵیوەتەوە ، ئامادەبوونیش بۆ بنیاتنانی ژیانی ئاسایی جیایە لەئامادەبوون بۆ مەشق کردن و خۆخەریك کردن بەبنیاتنانی شەخسیەتێکی دیاری کراوەوە لەشانۆگەری یەکدا ، چونکە ژیانی ئاسایی ئەکتەرەکەو راهاتنی لەسەر پشوودانی ماڵەوە دوورە لەژیانی دەورێکی تایبەتی ئەکتەر کە دێتە سەرشانۆ کۆمەڵێك شت بەرەورووی دەبنەوە ، لەوانە کاری تیشکی شانۆکە لەسەری و کۆمەڵێ کارتێکردنی تر کەبارێکی دەروونی تایبەتی بۆ دروست دەکەن و شەخسیەتەکەی دەچێتە دۆخێکی ترەوە . . ئەکتەریش کاتێك دەگاتە لووتکەی ئەفراندن (ابداع)و سەرکەوتن کەخوێندنەوەی تێروتەسەلی و هەردەم لەگەڕان و پشکنیندابێ بەشوێن شتی نوێدا ، دەبێ ئاگاداری لایەنە هونەری یەکانی شانۆبێ ، پێویستە بەچاکی لەهەست کردن و بیرەوەری «الذاکرة» حاڵی بێ . . مەرجیش نی یە «ئەکتەر»ە کە ئەو خاڵانەی سەرەوە بەجێبهێنێ و خاوەنی بەهرەو دەیان تاقی کردنەوەبێ و خاوەنی هەوڵ و کۆششی نەبڕاوەبێ کەواتە ئەکتەر جیاوازە لە ئارەزوومەند «الهاوی» ، پێویستە ئەکتەر خۆی بەقوتابخانە زانستی یەکانی هونەری نواندنەوە ببەستێتەوە . . لە ئەوروپا ئەکتەری سەرکەوتوو ناونراوە «ئەکتەری باڵێ» ، ئەمەش لەوەوەیە کەهونەری باڵی هونەرێکی قورسەو بەهەمووکەس پێش کەش ناکرێ ، لێرەدا بارگرانی ی هەردوو هونەری باڵێ و شانۆ دەرخرا ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هونەری باڵی چۆن داوای تەکنیك و بزووتنەوەی تایبەت لەبەشدارەکانی دەکات هەر بەوجۆرەش حیساب بۆ ئەکتەریش کراوە لەسەمای باڵی دا چۆن سەماکە دەکەوێتە نێوان کۆرسی سەماوە لەشانۆشدا کۆرسی ئەکتەرەکان «بەکچ و کوڕ»ەوە لەدەوری پاڵەوانی دراماکەدا کۆدەبنەوە . . لەهەر رێکخستنی بزووتنەوەیەکی شانۆدا چەندان بۆچوون لەناخی ئەکتەردا لەدایك دەبێ . . لەم نێوانەدا ، واتە لەنێوانی کەرەستەی ئەکتەرەکەو وەسیلەی گەیاندنەکەدا دروست بووی دەرەوەو شێوەی دەرەوەی نواندنەکە دەخولقێ . میزاجی ئەکتەر چۆنێتی ی هەڵس وکەوتەکانی دەردەخات ، بۆیە بەتەواوی لەبەرهەمەکە بگاو هەموو رستەیەك و بزووتنەوەیەکی لەشوێنی خۆی دا بخاتەگەڕ ، دەبێ لەئامانجی دەقەکە بەگشتی و لەدەورەکەی خۆی بەتایبەتی حاڵی بێ و حیساب بۆ هەڵچوونەکانی بکات ، کە هاتە سەر شانۆکەش لەگەڵ بزووتنەوەکانیدا یەکیان خات . . بەوانەش ئەکتەرێك دێتەکایەوە هەروەك ئەوەی تەرازووکرابێ . . شەو لەدوای شەو پێش کەش کردنەکە گەرم دەکاتر ئەنجام ئەوکەسەی ئەم دەورەکەی دەبینێ بە گۆشت و خوێنەوە دەگاتە خەڵکەکە .

**تەکنیکی ناوەوە : —**

ئاشکرایە کەشانۆی سروشتی — ناتورال — گەلێك بایەخی بەتەکنیکی ناوەوەی ئەکتەر داوە ، چونکە بۆ ئامادەکردنی ئەکتەرو چوونەناو ناخی دەورەوە ئەوتەکنیکە گەلێك پێویستە . لای تایرۆف شارەزایی مرۆڤەکە لەژیانداو تۆمارکردنی یادگارو رووداوەکان لەژیانی دا دەست نیشانی چۆنێتی ی ناسین و تێگەیشتنی کاراکتەری شانۆگەری دەکات . . ئەگەر ئەکتەر لەدەوربینینەکەیدا راستگۆبوو ئەوا سەرکەوتووە ئەم راستگۆیی یەش بەوەدەبێ کەمرۆڤ لەژیانی ئاسایی دا لەسەری راهاتبێ و درۆ لەگەڵ خۆی دا نەکات ، بێگومان لەگەڵداژیان و

بەسەربردنی هەردەورێك ئەگەر زۆرلەخۆکردنی تێدابوو ئەوا بینەران پێ‌ی رازی‌نابن‌و گلەیی دێتەسەر ئەونەکتەرە کەلی‌ی چاوەروان‌نەکراوە . بینەران کەدێتە هۆڵەکەوە چاوەروانن نواندنی واقیعی‌و ڕێك‌ورەوان جیبن . چونکە پێشتر پێشبینیان‌کردووە . ئەوان چۆن لە زۆرانبازیی گاکەدا چاوەروانی بەزینی گاکە دەکەن هەربەوجۆرەش ئەنجامێکی چاوەروانکراو لە شانۆنامەکە چاوەروان دەکەن دەرهێنەر کە بەردەوام لەگەڵ ئەکتەرەکانی‌دا دەژی . پێویستە ڕێز لەراو بۆچوونەکانیان بگرێت . چونکە ئەکتەر حەزدەکات ڕای خۆی بلی‌و بوونی خۆی لەو ڕایانەدا دەبینێتەوە . . زۆرجار ئەکتەرەکان لەناوخۆیاندا لە بۆچووندا جیاوازن . بەنموونە ئەکتەرێك لەشانۆگەری‌یەکی دیاری‌کراودا وا بەچاك‌دەبینێ کەسەرەتا کە کەبەنواندنی بێ‌دەنگ - بانتۆمایم - بێ . یەکێکی‌تر واهەست دەکات پێویستە بەنواندنێکی خێراوتێژرەوبێ‌و یەکێکی‌تر بەجۆرێکی‌تر هەر هەمووشیان بۆچوونی خۆیان بەڕاست دەزانن .

بۆیە ئەوکاتەی ئەکتەر دەورێکی پی‌دەسپێردرێ هەوڵی ئەوە دەدات لەگشت دەورەکان بگات بۆئەوەی بتوانێ پەی بەپێوەندی نێوان دەورەکان بەرێت . دواجار تەماشاکەران حوکمی سەرکەوتنی ئەکتەر یان ژێرکەوتنی دەدەن‌و بۆیان دەردەکەوێ کەئایا تێگەیشتنی ئەونەکتەرە بەرامبەر بەرهەمەکە لەمەنتیقەوە یان بە پێچەوانەوەیە . . هیوای ئەکتەری سەرکەوتووش ئەوەیە هێندە دڵسۆزبێ هەروەك ئەکتەرەکانی کۆمیدیای «دی‌لارتێ» ئەکتەری دڵسۆز لە ئەنجامی خۆخواردنەوەو ئارامیدا . لەئەنجامی بیرکردنەوەی بەردەوامی‌دا . دوای مەشق‌کردنی تەواو ووردەووردە بەرەو وێستگەکانی سەرکەوتن هەنگاودەنێ . دواجاریش دەگاتە ئەو ئاکامەی بیبکە بەئاکامی نواندنی ئەکتەری ژیرو زیرەك ناونراوە .

**تەکنیکی دەرەوە** :

بێ‌گومان تەنها تەکنیکی ناوەوەی ئەکتەر بەس‌نی‌یە بۆدەرخستنی کاراکتەری شانۆنامە . چونکە تەنها شارەزایی ئەکتەر بەرامبەر کاراکتەرەکەو هەست‌کردنی بە دەورەکەی ناتوانێ کەسێکی نوێ‌ی پێ‌بخاتە سەر تەختەی شانۆ . زووتریش ووتمان کە بڕبڕەی پشتی ئەکتەر بەندە بەهەڵکەوتنی لەش‌و درووست‌بوونی شێوەی‌و هەناسەدانی‌یەوە . ئەوانەش بەهۆی تەکنیکی دەرەوە دەخرێنە کارو سوودیان لێ دەبینرێ .

قوتابخانەکەی تایرۆفیش ئەم هۆیانەی کردووەتە ئامانجی سەرەکی ئەگەر هەڵسوکەوتی ماقووڵ‌و گونجاو لەگەڵ ئەو کەرەستانەدا نەکرێ ئەوا ئەکتەری خواروخێچ‌و ناماقووڵ دەبینرێت .

دیسارت ۱۸۱۱ - ۱۸۷۱ کە یەکێکە لەپسپۆرانی دەنگ‌و دەربرین «الصوت والألقاء» لەفەرەنسا لەبارەی تەکنیکی دەرەوەی ئەکتەرەوە ووتویە - (گرنگ ئەوەیە داواکراوەکە بەپێچەوانەوە نەخرێتە سەر شانۆ . هەندێك‌جار ئەو دیمەنانەی گاڵتەکردن بەخۆیانەوە هەڵناگرن دەبێ نەکرێتە گاڵتەجاری . . کەدەوری مرۆڤێکی عاشق‌و دڵگەرم دەدرێتە ئەکتەرێکی سەرکەوتوو بینەر هەست‌دەکات ئەڤین‌و دڵداری‌یەکی گڕگرتوو بەرێوەتە سەر شانۆکە . بەڵام ئەگەر هەمان دەور بدرێتە ئەکتەرێکی لاوازو کەم‌توانا . دەبینین دیمەنەکان دەبنە مەیانەیەك بۆ پێش‌کەش‌کردنی ڕۆمانتیکیەتێکی بێ‌سەروشوێن . ئەکتەرەکە دەبزرکێنێ‌و دیالۆژەکان نارێك‌وپێك لەدەمی دێنە دەرێ‌و هەردوو قاچی دەلەرزێ . ئیتر بینەران دەکەونە پێکەنین‌و بەهای کارە درامی‌یەکە نامێنێ . لێرەدا بۆمان ساغ‌بووەوە کە بەتەنیا تەکنیکی ناوەوە بەبێ تەکنیکی دەرەوە ئەکتەرو بەرهەمی شانۆیی ناگەیێنێتە ئەنجام . . زۆرجار تەکنیکی ناوەوە لای ئەکتەر بەوێنەی ئاگرێکی بەجۆش گڕو کڵپە دەستێنێ . بەڵام چونکە جووڵانەوەی دەرەوەی ئەکتەرەکە ناتەواوە . با فرمێسك بەخوڕ لەچاوەکانیشی بێنەخوارێ . با بەهەموو هێزیشی دڵی خۆی بگوشێ . بەڵام هەر ناتەواوەو بینەر هەرپێکەنینی پێ‌ی دێ‌و لەگەڵیدا هەڵناچێ . .) .

تایرۆف بەردەوام داوای مەشق‌کردنی لەئەکتەر کردووە . ڕاهاتنی ئەکتەر لەسەر بەکارهێنانی لەش ئامانجی سەرەکی‌یە لای ئەو .

لەسەر بەهای ئەم مەشق‌کردنە نموونەیەك دێنینەوە . ئەویش «ئەنتیوان رۆنشتاین»ە ۱۸۲۹ ۱۸۹٤ . ئەم مۆسیقاژەنە هەڵکەوتووەی ڕووسیا هەرکاتێك بەنیازی سازکردنی ئاهەنگی مۆسیقا گەشتێکی بکردایە بۆ دەرەوەی شارەکەی لی‌ی بوو بوو بەخوو ئامێرە مۆسیقایی‌یەکەی دەرئەهێناو بەدرێژایی ڕێگا مەشقی ئەکرد . ئەوەش لەبەر ئەوەبوو نەوەك رۆژێك لەمەشق‌کردن دوابکەوێ . . هەر بەشێوەی ئەو هونەرمەندە پێویستە ئەکتەرەکانیش بەردەوام مەشق‌بکەن . کە هاتنە سەر شانۆ وەك ئەو چەکە وابن کە تازە لە پاکەتەکەی دەرهێنراوە . وەك یاری زانەکانی ئوکرۆباتیك لەش‌سووك‌و گورج‌وگۆڵ‌بن .

نۆکەسەی بەردەوام مەشق بکات و بەهرەکەی پێش بخات ئەنی ترس دەوری سەرەکی و گرانی پی ئەسپێرێت . هەربەو شێوەیەش لەدەست ئەکتەری بێهێزو تەوەزەل رزگارمان دەبێت ، چونکە ئەکتەری کەم توانا تەنیا لەچەند دەورێکی کۆمبارس و درووست کردنی کۆرسی شانۆدا دەوری خۆیان پی ئەبینێ . خۆ ئەگەر بۆ ئەم جۆرە دەورە بچووکانەش ئەکتەری کارامەو بەتوانا دەست بکەون ئەوا بێ گومان باشترە .

ئەو کاتەی تایرۆف لەشانۆی هاوینەدا کاری کردووە . لەئەنجامی مەشق پی کردنی ئەکتەرەکانیدا ئازارێکی زۆری چەشتووە . بەڵام ئەنجامەکەی بەبەرزەوەندی خۆی شکاوەتەوە . ئەوەتا ئەوکاتەی شانۆگەری (فەرشە سەوزەکە)ی پێش کەش کردووە رەخنەگرێك دەربارەی خاتوو (کۆنان ئەلیین)ی خێزانی تایرۆف وای نووسیووە :

(ئەو ئەکتەرە لەبری نواندنی دەورەکەی ، لەسەر شانۆ سەمای کردووە) . واتە ئەوەندە سەرکەوتوو بووە لەبری ئەوەی وەك ئەکتەرێك ببینرێتەوە زیاتر سەماکەر بووە . بەردەوام تایرۆف داوای جۆش کردنی لەش ولاری لەئەکتەرەکانی کردووە بە (لاوو پیریانەوە) .

جارێکی تریش (کۆکاکی) قسەی لەسەر تایرۆف کردووەو ووتوویە : —

رق لەوجۆرە ئەکتەرانە بووەتەوە کە تەنها دیالۆژیان گەیاندووە . کش ومات و بێ بەکارهێنانی تەکنیکیانەی لەشیان . ئەوانەی وەك ئەوە وابوون کە لەدەوری مێزی نانخواردن کۆبووبنەوە . . ئەوانەشی بەدڵ نەبووە کە لەخۆیانەوەو بەبێ هۆ . ووشەو رستەیان دووبارەکردووەتەوە . . لەگەڵ ئەو جۆرە ئەکتەرەشدا نەبووە کە هەندێك جار بۆ رازی کردنی بینەرەکان زۆریان لەخۆیان کردووە . ماوەیەك لەسەر یەك شێوە قسەیان کردووە لە کۆتایی دیمەنەکەدا بۆ ئەوەی چەپڵەیان بۆ لێدەن دەنگی خۆیان گۆڕیوەو دەستیان کردووەتە هاوارهاوارو شیراندن .

تایرۆف هەردوو هونەرەکەی بالیەو نواندن بەیەك ئەشوبهێنی و لەیەکچوونیان لەمەشق و دەردەسەری فێرکەرو بەهرەو توانای بەشدارەکاندا ئەبینێتەوە . بەڵام جیاوازییان لەوەدا ئەبینێ کە سەماکەرەکان کەمتر موناقەشەی مامۆستاو فێرکەرەکەیان ئەکەن لەو ئەکتەرانەی لەیەکەم رۆژی کارکردنەوە راو بۆچوونیان ئەخەنەروو . موناقەشەی گەرم وگوڕ لەنێوان دەرهێنەرو ئەکتەرەکاندا بەرپائەبێ و پێویستە دەرهێنەر لە دواجاردا رای خۆی فەرزبکات . چونکە لێپرسراوی یەکەمی بەرهەمەکەیە (بەرامبەر ئەم رایە ئەڵێین کە شانۆی نوێ زیاتر بایەخ بەرۆشنبیری ئەکتەر ئەداو ئەمرۆ رێز لە بۆچوون و بیرکردنەوەی ئەکتەر ئەگیرێ — ی . ق . ب) .

ئەبێ لەشانۆدا حەقیقەتی هونەری لەخزمەتی بەرهەمە هونەرییەکەدابێ . بۆیە ئەکتەر بەوێنەی سەماکەرەکە ئەبێ گوێ رایەڵی قسەو فرمانی مامۆستاکەی بێ . گێرسانەوەی دەرهێنەر بە بۆچوونەکانی خۆی و بە مەوزوعیەتی تەکنیکی ئەکتەرەوە لەگەڵ باری سەرنجی ئەکتەردا یەك ئەگرنەوە ، بەڵام لەگۆشەنیگای فراوانترەوە . بانگی دەرهێنەر بڵندەو لەتوانای گەورەوە هەڵقوڵاوە . دەرهێنەر ئەوکاتەی ئامێز بۆ دەقێکی شانۆگەری ئەکاتەوەو ئەبێتە ئاشنای ئەکەوێتە هەڵس وکەوت لەگەڵ کاراکتەرەکانی ئەو دەقەداو دواجار مەسەلەبەرەورووی ئەکتەرەکانی ئەکاتەوە . . لەپێناوی پەرینەوەی خۆی و دەقەکەی و لەپێناوی گەیشتن بەبینەرەکان ئەکتەرەکانی ئەکاتە پرد .

کەسەبارەت بەشانۆ ئەدوێین مانای ئەوەیە سەبارەت بەبزوتنەوە شانۆیی یەکە ئەدوێین . لەسەرووی ئەم لێدوانەشدا ئەکتەر ئەکەینە کلیلی هەمووباسێك . هەربۆیە لەشانۆدا کە حساب بۆ دیالۆژ ئەکەین یەکسەر ئەم حسابکردنە ئەبەستینەوە بەئیقاع و دینامیکیەتەوە و پێویستە دیالۆژ ، شان بەشانی رووداو (حدث) بڕوات کەواتە بەگوێرەی ئیقاعی رووداوەکان نەخشە بۆ دیالۆژ دائەنرێ و بەوپێیەش خاوی یاخود خێرایی دیالۆژەکان دەرئەخرێت بەوەش بینەران بەرهەمێکی یەکجار سروشتی ئەبیننەوەو پێی خۆشحاڵ ئەبن .

دەنگ یاخود ئامێری قسەکردن گرنگترین تەواوکەری ئەو وێنەیەیە کەلەسەر تەختەی شانۆوە ئەخرێتە بەرچاوی بینەران . کۆکالی رووونی کردووەتەوە کە هەرجۆرە دەورە دەنگی تایبەتی خۆی پێویستە . بەم پێیەش زەحمەتە ئەکتەرێك بتوانێ دەنگی خۆی بۆ هەموو جۆرە دەورێك بەکاربهێنێ . بۆ ئەم خاڵەش دیسانەوە مەشقی بەردەوامی ( دەنگ و دەربڕین ) ئەکتەر لەو مەبەسە نزیك ئەخاتەوە . . کە رووبەرووی کاراکتەرێکی جیاوازو تایبەت ئەبێ پێویستە هەوڵی زۆر بدات بۆ ئەوە تۆنەکانی ئەو دەنگە بناسێ و دەنگی خۆی لەسەریان رابهێنێ . لێرەدا توانای گوێیەکان دەوری خۆی ئەبینێ بۆ دۆزینەوەی ئەو دەنگەو بەکارهێنانی لەگەیاندنی کاراکتەرەکەدا .

**دەرهێنەر :-**

تایرۆف ئەڵێ :- (هونەری شانۆ هونەری ڕووداوەکانە) شانۆی زیندووش ئەو شانۆیەیە کە ڕووداوی بەهێز بخاتە سەر تەختی شانۆکە . .

دروست‌کەری ئەم ڕووداوانەو نیشاندەریان دەرهێنەرە . . تەنها ئەوە کە بەهۆی شەخسیەتی خۆیەوە پاشەڕۆژی شانۆ ئەنەخشێنی) .

- ئەبێ کارەکانی دەرهێنەری یەکەم‌و دوا بزوێنەری ئەم شانۆیە چی بن ؟
- لەکارکردنیدا چی پێویستە ؟
- ئایا بێ دەرهێنەر شانۆ ئەڕوات بەرێوە ؟

ئاشکرایە هون ری شانۆ هونەرێکی گەلەکۆمەکی‌یە ، لەبەرهەم‌هێنانیدا ژمارەیەك لەخەڵکی بەشدارن ، وەکو نووسەر ، ئەکتەر ، دانەری مۆسیقا ، ئەندازیاری دیکۆرو نەخشەکێش‌و جێ‌بەجێ‌کەرەکانی ، هونەرمەندی تەشکیلی‌و کرێکاری تیشك ، بەبەرهەمی ئەم هونەرمەندانە هونەری شانۆ لەدایك ئەبێ ، ڕەنجی هەموولایەکیان یەك‌ئەگرێ‌و ئەنجام بەری ڕەنجی گشتیان شانۆگەری لێ‌ئەخولقێ .

لێرەدا بۆئەوەی ڕێکخستن لەنێوان نەخشەی دیکۆرەکەو گونجاندنی ڕەنگە پێویستەکان بەگوێرەی نەخشەی دیکۆرحتەك بێ . . . ئەمە لەلایەك‌و لەلایەکی ترەوە خۆبەستنەوە بەگشتی ووشەیەکی نووسەر یان وەرگێڕەوە . . . بۆ یەکخستنی ڕووداوە درامی‌یەکان‌و بەکارهێنانی مۆسیقا لەبەهێزکردنی ئەو یەکخستنەدا . . لەدانانی تیشکی سەرشانۆکەدا . . لەهەموو ئەم کارە سەرسوڕهێنەرانە ي کێتی‌یەك دروست‌ئەبێ ، بۆ پتەوکردن‌و بەرێوەبردنی ئەم یەکێتی‌یە پێویست بەڕابەرو سەرکردەیەك ئەکات . . ئەم سەرکردەیە لەگشتی ئەوهونەرانەی باسمان‌کرد تابلۆیەك دروست‌ئەکات ، بۆ دانانی چوارچێوەی تابلۆکەی گوێ لەتێ‌بینی نووسەرەکە ئەگرێ‌و لەسەرنجی ئەکتەرەکان ئەکۆڵێتەوە . . . ئەم سەرکردەیە خاوەنی ئەزموونێکی و هایە کەسەری گشتی هونەرە تەشکیلی‌و جوانکاری‌یەکان بەیەکەوە گرێ‌ئەداو ڕۆشنبیری‌یەکی ئەوتۆی هەیە کەبەرامبەر کارە هونەری‌یەکەی ئەبێتە ڕەخنەگرێکی بەسەلیقە . . . هەوڵی ئەوە ئەدات کورت‌ترین ڕێگا بەئامانج گەیشتن بگرێتەبەر ، ئەو ڕێگایەش ڕێگای هونەرە . .

ڕێگای سەرکەوتنەو هونەرمەندی ڕێگابڕیش «دەرهێنەر» . . . ئەوکەسەیە کە گشتی هەڵو مەرجەکانی نواندنی لەلا یەکالآیەو قسەی خۆی لە دروست‌کردنی دیکۆرو دانانی مۆسیقاو دروونی جل‌و بەرگەکاندا ئەکات . . تێبیلی خۆی بە جێ‌بەجێ‌کەری تیشك (الأضاءة) ئەدات . . لەکاتی خۆی‌دا ئەکتەرەکان ئەکات بەژووری ئارایشتدا ، بەتەنگ هێمنی باری سەر تەختەی شانۆکەوە دێ ، چاودێرە بەسەر ئەکتەرەوەو بۆ یەکگرتنەوەی لەگەڵ ناوەوەی‌دا پەۆشە . . ئائەمانە دەوری دەرهێنەری هۆشیارە لەشانۆی ڕاستەقینەدا . . بەهۆی بوونی ئەوەوە تەدەلیەت لەبەرهەمەکەدا ئەبینرێتەوە ، بەهۆی ئەوەوە کاراوانی ئەکتەر ئەکەوێتە ڕەوت‌و دواجار ئەگاتە مەنزڵ .

هەمووجار تایرۆف دووبارەی کردووەتەوە کە ( دەرهێنەر ڕابەری شانۆیە) ، بەتەنها ئەوکەشتی‌یەکە ئەبات بەرێوەو تووشی دەیان تەنگوچەڵمە ئەبێ‌و لەگەڵ (با) دا ئەکەوێتە زۆرانگرتن ، ئەنجام ڕۆخی دڵنیایی ، ڕۆخی‌سەرکەوتن . دژایەتی بەردەوامی لەگەڵ ئەکتەردا وای لێئەکات پشتی قسەکانی ئەکتەر بگرێ‌و دەستبەرداری ڕاکانی خۆشی‌نەبێت . . کە ئەو سووربێ لەسەر قسەی خۆی ئەکتەریش خۆی بە کەلەپچەکراوو بەلدکراو ئەزانێ . . ئەکتەر ئەبەسترێتەوە بە تێبینی‌یەکانی دەرهێنەرەوەو بۆی نی یە هەنگاوێك زیادەڕۆیی بکات . .

لەڕاستیشدا لەکارێکی گەلەکۆمەکی وەك شانۆدا ڕەوا نی‌یە گشت بەشدارێك سەربەحت بێ لەکارکردنا . . بۆیە ئەبێ ئەکتەر لەو دەورە سەرکردەیی‌یەی دەرهێنەرەکەی باش حاڵی بێ‌و لەهەموو جوڵانەوەیەکی‌دا حساب بۆ خۆی‌و ئەو بکات .

تایرۆف سەربەستی ڕێنومایی کردنی داوەتە دەست دەرهێنەر ، چونکە بەتەنها ئەو لێپرساوە لە ئەنجامی سەرکەوتن یان‌سەر نەکەوتنی شانۆگەری یەکە ، بناغەی شانۆی ڕاستەقینەش لەسەر مەوزوعیەت هەڵەستی‌و بڵند ئەبێ . .

پێویستە دەرهێنەر دڵسۆز بێ بەرامبەر شانۆکەی‌و هەموو ڕاستی‌یەك بگەیەنێتە خەڵکی . . ئەبێ ئەم گەیاندنەش کاریگەر بێ لەسەریان‌و ڕاست‌ودرووست دوور لەهەموو فێڵ‌و هەڵخەڵەتاندنێکەوە .

ئەبێ ڕەقابەی دەرهێنەر لەسەر ئەکتەرەکانی ووردبین‌و توندوتیژبێ . . چونکە کارکردنی بڕسەر بینەر بەهۆی ئەکتەرەوەیە ، ئەکتەریش کە ئەچێتە سەر تەختەی شانۆکەو بەتایبەت لەشەوانی سەرەتای پێش‌کەش‌کردندا ، بێ‌ئەوەی بیەوێ هێندە ناوەوەی ئەوروژێ وای لێ‌دێ لەخۆیەوە یەنگ بەرز ئەکاتەوەو زیادەڕۆیی لە جوڵانەوەکانی‌دا ئەکات . .

«ئەمەش ت نیە بۆ هەژهندنی بینەرەکانە» . .

کەواتە بۆ ئەوەی ئەم شتانە روونەدەن پێویستە دەرهێنەر ـەپێش‌کەش‌کردنی بەرهەمەکەدا ئاکادەبێ‌و بستێك ـەئەکتەرەکانی دوورنەکەوێتەوە ، بەوکارەش شانۆ گەری‌یەکی سەرکەوتوو دوور لەهەڵەو ناتەواوی پێش‌کەش‌ئەکرێ .

دەرهێنەر لەناو ئەکتەرەکانیدا سەرکەوتووترینیان هەڵئەبژێرێت ، ئەوسا گشت لەیەنێکی کاراکتەرەکانیان بۆ روونئەکاتەوەو تۆوی بروا بەخۆبوون لەزەمینەی ناخیاندا ئەچێنێت . بێ‌گومان دەرهێنەری سەرکەوتوو : رۆشنبیرە ، کەسێکە توانای سەرکردایەتی ئەم هونەرەی هەیە . پێویستە دوای تەواوبوونی مەشق‌و لەکاتی دیاری‌کراوی خۆی‌دا بەرهەمەکە بگەیەنێتە سەر شانۆ .

**مۆسیقا لەشانۆدا :-**

تایرۆف ئەڵێ :- ( لەناو گشت هونەرەکاندا ، هونەری مۆسیقا نزیکترینیانە لەهونەری شانۆوە ) .

پاش‌ئەوەی کاری دەرهێنەرمان لەقوتابخانە شانۆییەکەی تایرۆفدا روونکردەوە ، پێویستە تۆزێك لەگەڵ ئەو قۆناغەدا بووەستین‌که دەرهێنەر تیایدا وەستاوو دەست بەستراوە . . . ئەو قوناغەش ئەو دەمەیە کە دەرهێنەر هەست‌ئەکات بەرهەمەکەی پێویستی بەمۆسیقایە ، گەر مۆسیقا بەتەواوی شانۆگەری نەگەیەنێتە لووتکەی سەرکەوتن ، ئەوا ئەتوانێت لە بەجەستەکردنی «تجسید» چەند بەشێکی‌دا دەوری خۆی بەباشی ببینێ .

هەربۆیە ، کاتێك تایرۆڤ دەرهێنەر شانۆگەری‌یە شیعری‌یە بەناوبانگەکەی ئۆسکار وایلد «سالومی»ی دەرئەهێنا ، هەستی‌کرد پێویستە موسیقا دەوری خوی چالاکانە تیایدا ببینێ .

رووداوی وا هەیە بەبێ مۆسیقا بەهای دەرناکەوێ ، ئەوەش هەندێك لەدەرهێنەران هەر لەخوێندنەوەی سەرەتای دەقەکەوە بۆیان دەرئەکەوێ ، دیمەنی واش هەیە لەگەڵ مۆسیقاکەدا کۆرسیشی پێویستە ، لەم بوارەدا تایرۆف پەنجە بۆ « فورتی جانریە »ی موسیقاری گەورەی رووس درێژئەکات ، ئەو هونەرمەندەی مۆسیقای بۆ زۆربەی شانۆگ ری‌یەکانی داناوە . .

مۆسیقا لەگەلێك شاکاری گەورەدا دەوری خۆی بینیوە ، لەوانەش شانۆگەری‌یەکانی : ژن‌هێنانی فیگارۆ ، پاشای پێکەنین ، بەرامبیلای شاژن ، لەم دەقانەدا مۆسیقا لەجێگای خۆیاندا بوون ، هیچ کارێکی سەلبی نەبووە بۆ سەر ئەکتەر ، بەڵکو لەخزمەتی ئەو و بابەتەکەدا بوو ، لەخزمەتی هونەری نواندن‌و دەرهێنان‌و سەرانسەری بەرهەمەکەدا بووە ، لەگەڵ ئەو ئیقاعەدا یەکانگیربووەتەوە کە دەرهێنەر دۆزیویەتەوەو ئەکتەر پێرەوی‌کردووە .

• • •

**سەر تەختەی شانۆ :-**

دەرهێنەر پێویستی بەشانۆیەکی ئەوتۆیە کەبتوانێ گشت رازونیازەکانی تیایدا بخاتەکار . . . پێویستە سەر تەختەی شانۆکە گونجاو و ماقووڵ بێت . . چونکە ئەم تەختەیە هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ یەك‌بەیەکی هەناسەکانی کارکردندا ئەژی . .

یەکەم کارتێکردنی ئەم تەختەیە لەسەر ئەکتەر ئەبێ ، ئەوکاتەی دەرهێنەر گشت لایەکی ئەم تەختەیە بەرەگەزە هونەری‌یەکان پڕئەکاتەوە ئەو هەلە بۆ ئەکتەر ئەرەخسێ کەبتوانێ تیایدا نامە هونەری‌یەکەی بگەیەنێ . . ئەو نامەیەی ئەبێتە خزمەتچی راستی‌و هونەرەکە : لەسەردەمی ئەغریقە کۆنەکاندا بەقاڵدرمە ئەم کارتێکردنە بنیات‌ئەنرا . . لەسەدەکانی ناوەندا بۆ خۆش‌کردنی زەمینەی ئەم مەبەسە پلەکانی کاتەردائی بەکارئەهێنرا ، بەڵام تەختەی شانۆکە بەسەو هەربەو دەوری‌بەری گونجاو درووست‌ئەکرێ ، ئەمەش ئەوە ئەسەلمێنێ کە هەرسەردەمە شانۆ بەجۆرێك بووەو بۆ گەیاندنی مەبەسەکانی بەرگی تایبەتی پۆشیوە .

گەر بەچاوی سەرنجەوە بروانینە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی شانۆ ئەبینین کە بەردەوام گۆڕران بەسەر شانۆدا هاتووە ، ئەم گۆڕرانەش بەهۆی رەشنووسی وێنەکێشانی تایبەت بەشانۆوە بووە ، هەموو توانایەکی نیگارکێشی نەخشەکێش لەپێناوی یاریدەدانی دەرهێنەردا بووە . . شانۆی نوێ پشت بە « ماکێت »ی تایبەت بەتەختەی شانۆ ئەبەستێ ، لەسەر ئەو ماکێتە دیکۆرو جولأنەوەی ئەکتەرەکان وێنەئەکێشرێ ، بەڵام لەشانۆی رەمزی‌دا لەبری ئەوەی ماکێت بۆ دیکۆرو جولأنەوەی ئەکتەرەکان بێ تەنها هێمایەکە بۆ هاتوچۆی ئەکتەرکان .

«هۆفمان» لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ووتوویە :- (شێوەیەکی نوێ سەرنجی بینەر زیاتر لە دیکۆرێکی قەبە رائەکێشێ .

ئەبێ شێوەی دیکۆر بینەران بەخۆیەوە خەریك‌نەکاو

لەرووداوەکان دووریان نەخاتەوە ، چونکە رووداو گرنگترین بەشە لەشانۆگەریداو هەرگیز فەرامۆش ناکرێ . . . بەتەنها جێگاو شوێنی دیمەنەکان بینەریان پیٚ رازی ناکرێ و ئەوەندە بەس نی یەکەتەختەی شانۆکە پڕکرێ لەفیلێو تیشك و کاری مۆسیقا ، چونکە شانۆ ئەتلەسی جوغرافیا نی یە ، ئەوەی گرنگە هەرئەوەیە دواجار بینەر بەرامبەر رازی نووسەرو دەرهێنەرو ئەکتەرەکان هیچ لارییەکی نەبێ ، چونکە ئەوانن خاوەنی راستەقینەی شانۆ ، ئەبێ گشتی دەوروبەرو کەرەستەیەکی هونەری لەخزمەتی ئەکتەردا بن ، بۆئەوەی بتوانێ بانگی ئامانجی شانۆگەرییەکە بدات بەگوێی خەڵکە بینەرەکەدا .

**جل‌وبەرگی شانۆیی :-**

تایرۆف ئەڵێ :- (ئەو ڕێگایەی ئەمانگەیێنێتە بەرزکردنەوەی رادەی جل‌وبەرگی شانۆیی گەلێك دوورودرێژە) . . . بەرەوپێشەوەچوونی جل‌وبەرگی شانۆیی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێشکەوتنەی شانۆی سۆڤیەتی وەدەستی‌هێناوە . .

چەند هونەرمەندێك لەم بوارەدا وەك نەخشەکێشی جل‌وبەرگ دەوریان پرشنگدارەو لەوانەش : مامۆستا باکلیست لیون ( ١٨٦٦ - ١٩٢٤ )کە ساڵی ١٩٠٩ چووە فەرەنساو تا کۆچی دوایی‌کرد لەپاریس مایەوە ، سۆجاکین سەرگای ( ١٨٧٨ - ١٩٣٦) ، سابونۆف نیکۆلای ( ١٨٨٠ - ١٩١٢ ( کەوا لەتەك هەردوو کەڵە هونەرمەند کۆمیسار چافسکی‌و مایرهۆڵەدا کاری کردووە ، ئەنیسفلد بوریس کە ساڵی ١٩١٢ چووە ئەمەریکاو هەر (لەوێش) نیشتەجێ‌بوو .

جل‌وبەرگ لەقوتابخانەکەی تایرۆفدا لەخزمەتی ئەکتەردایەو بۆ نیشاندانی چۆنێتی‌و هەڵس‌وکەوتی ئەکتەرو کاراکتەرەکەی بەکەڵك‌و سوودبەخشە ، بەهۆی جل‌وبەرگەوە رۆشنایی ئەچێتەسەر بزوتنەوەکان ، هەر جل‌وبەرگی سەرکەوتووشە شێوەی ئەکتەرەکە ئەدرەوشێنێتەوەو بەهۆی رەنگە جۆراوجۆرەکەنی‌یەوە قورسایی یا ووشکی یاخود پێچەوانەی ئەوانە لەکاراکتەرەکەدا دەرئەکەون ، زۆربەی کات جل‌وبەرگی شانۆیی بەگوێرەی هەڵکەوتنی کاراکتەرەکەو سەردەمەکەی‌و چۆنێتی کۆمەڵەکەیی‌و پلەی شەخسیەتەکەی درووست‌ئەکرێ .

تایرۆف ئەڵێ : ( گەر نەخشەکێشی جل‌وبەرگ وویستی بەرهەمێکی سەرکەوتوو درووست‌بکات ، ئەوا پێویستە هەموو بەهرەیەکی نیگارکێشی‌و بنەماکانی لەبیرخۆی بەرێت و . ئەمرۆ لەشانۆی نوێدا نەخشەکێشی جل‌وبەرگ هەوڵ‌ئەدات لەبیری سەرەکی دەقەکە نزیك‌بێتەوە ، ئەیەوێ بیرکردنەوەی خۆی بەرەو مەوزوعیەت ببات‌و لەگەڵ کاراکتەرەکاندا کۆببێتەوە . .

پێویستە نەخشەکێش شارەزای جۆری هەڵکەوتنی کوڕو کچە ئەکتەرەکان بێ . . دواجاریش ئەڵێین پێویستە جل‌وبەرگ لەخزمەتی ئەکتەر کانیا بێ ، نەك ئەوان ببنە مل‌کەچی جلەکانیان . تایرۆف لەئەنجامی دژوەستاوەی بەرامبەر یەکێ لەراکانی « گۆرن گریچ »ی دەرهێنەر کەووتوویە :- (دەرهێنەر خۆی ئەبێ نەخشە بۆ جل‌وبەرگی بەرهەمەکەی بکێشێ) ووتوویە :- (شانۆ هونەرێکی گەلەکۆمەکی‌یە « جماعي » ، هەربۆیە هەر کەسە لێپراسراوە لەکارەکەی خۆی) .

پێویستە هەموو هونەرمەندەکان بواری شانۆ بەردەوام شوێن‌پێی زانین‌و رۆشنبیریی هەڵگرن‌و بەردەوام مەشق‌بکەن بۆئەوەی داهێنان بخەنە بەرهەمەکانیانەوە .

تایرۆف وای بەچاك ئەزانێ کە کەس دەست نەخاتە کاری کەسی ترەوە ، دەرهێنەر بۆی هەیە ئامۆژگاری‌و رێنومایی هەموو بەشداران بکات ، بەلام ئەبێ رێش بەوە بدات کە خویان کاری خۆیان مەیسەربکەن ، تایرۆف سەبارەت بەمە ئەم نموونەیە دێنێتەوە :- (کە « کۆمیسار چافسکی »ی دەرهێنەر جل‌وبەرگی بۆ شانۆگەریی « گێژەڵووکە » بەدەستی خوی دروستی‌کرد سەرکەوتنێکی چاوەڕواننەکراوی وەدەست‌هێنا .

**بینەر :**

دواجار دێینە سەر باسی بینەری شانۆگەری ، ئەوانەی شانۆ لەپێناویاندا درووست‌بووە ، ئەوانەی لەپێناویاندا ئەکتەرەکان خەو لەچاویان ناکەوێ‌و بەدرێژیی شەو خویان ئەهێنن‌وئەبەن . . . دەرهێنەریش هەربۆ ئەوانە کەخۆی لە ژوورێکدا بەندئەکات‌و بەخوێنەوەو لێکدانەوەو شی‌کردنەوەی دەقەکەیەوە خەریك‌ئەبێ . . . کەچی لەولاشەوە میری بەرژەوەندی خۆی ئەخاتە کارو بۆ سوودوەرگرتن‌و پارە دەست‌کەوتن خۆی ئەکاتە سەرپەرشتی‌کەری شانۆگەرییەکان . . . لەو شانۆیانەی کە ئامانجی پارە پەیاکردنیان هەیە چینێك ئەبنە بازرگان . . . شانو موڵکی ئەوبینەرانەیە کە وەك شاکارێکی پیرۆزو گەورە تێ‌ی‌ئەڕوانن . . . هەرلەپێناوی ئەواندایە کۆڕو دەمەتەقێ سازئەکرێ‌و بلاوکراوەی هونەری چاپ‌ئەکرێن‌و ئەخرێنە بازارەوە . .

نووسەرە رەخنەگرەکانیش لەزووەوە ئەبنە هاوڕێی‌و

...جەرۆشەوە بەرەورووی ئەچن‌و هەڵی‌ئەسەنگێنن . . . منیش هەر لەپێناوی بینەردایە کەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەم بەدەرخستنی ئەو تەرزە ستراتیژی‌یەیان ئەهێنم کەلەگشت کات‌و شوێنێکدا هونەری شانۆیان پێ‌ڕائەپەڕێنرێ .

بینەر مایەی گەورەترین بایەخ‌پێدانی شانۆیە لەجیهاندا ، کە لەسەر کورسی‌یەکە دائەنیشێ گڵۆپە ڕەنگاورەنگەکان لەبەرچاویدا ئەکەونە وازی‌کردن ، لەگەڵ تەختەی شانۆکە نزیك ئەبێتەوەو ویژدانی لەگەڵ دەقەکەو کارەساتەکاندا ئەژی . . . جاری‌وایە بینەر هەست بەجیابوونەوە ئەکات لەگەڵ ئەکتەرەکاندا . . ئەو کاتەی بینەر هەستی‌کرد لەگەڵ ڕووداوەکاندا لەسەر دووریانێکەو خەریکە ڕێ‌یەکی پێچەوانە بگرێتەبەر هۆکەی ئەوەیە بیروڕای نوێ‌ی شانۆی بێ‌هوودە ( عبثی )و ناموقوول‌و لادان (انحراف) لەسەر شانۆ ئەبینێتەوە ، یان ئەبینێ بەرهەمەکە دژبەئاین‌و پیرەوەکانێتی . . ئەو خاڵانە ئەبنە هۆی لێکدابڕانی بینەر لەشانۆگەری‌و ئەکتەرەکان بەڵام لێکدابڕانێکی کاتی .

هەندێك جاریش بەهۆی کارەساتی دانسقەوە « شاذ » کە لەهۆڵی شانۆکاندا ڕووئەدەن بینەر لەشانۆ دوورئەکەوێتەوە ، بۆ نموونەو سەرگوزشتەی ڕووداوەکان کە مەبەسمانە ئەم بەسەرهاتە ئەگێڕینەوە :—

(ساڵی ١٩٠٩ ئەو کاتەی « ولیام بۆتس » ئەکتەری ئەمریکایی ناسراو لە « ئۆتێللۆدا » دەوری «ئیاگۆ»ی بینیووە ، لەو دیمەنەدا کە داو بۆ «دێزدەموونا»ی داوێن پاك‌و بێگەرد ئەنێتەوەو ئەیەوێ لەبەرچاوی ئۆتێللۆی ڕەش‌کات ، لەم‌کاتەدا دەنگی تەقینەوەی چەند فیشەکێك لەهۆڵەکەوە ئەبیسترێ‌و بەدوا ولیام بۆتس ئەکەوێ . . . تەقەکەرەکە ئەفسەرێکی ئەمریکایی‌یە کەهاتووە بۆ بینینی شانۆگەری‌یەکەکە . . کە بەئاگای ئەهێننەوەو ئەزانێ ئەکتەرەکەی کوشتووە لوولەی دەمانچەکەی ئەکاتە سەری‌و خوشی‌ئەکوژێ ، دوای ئەو ڕووداوە ئەمریکایی‌یەکان بڕیاریاندا بەیەکەوە بیانێژن‌و هەردووکیان خستنە گۆڕێکەوەو لەسەر کێلی گۆڕەکەشیان نووسی : ( ئەکتەری خاوەن بیروباوەڕو بینەرێکی خاوەن بیروباوەڕ) .

تایرۆف هەرگیز لەگەڵ ئەو بۆچوونە هەڵەیەدا نەبووە کە ئەڵێ :— (بینەر کارێکی ئەوتۆی بۆسەر شانۆ نی‌یە) ، بەڵگەی قسەکەشی ئەو ئەکتەرانەن کە لەکاتی مەشق‌کردنەکەدا ئاسایین لەنواندنا ، بەڵام کاتی پێش‌کەش‌کردن ئەگەنە لووتکەی ئەفراندن (ابداع) ، منیش بەرگری لەبۆچوونی دووهەمیان ئەکەم ،چونکە دوای تاقی‌کردنەوە بۆم دەرکەوت کەبینەر دەوری گەورەی هەیە لەسەر ئەکتەر ، ئەوەش ئەوکاتە بوو کە شانۆگەریم بۆ تیپی شانوێ « جیب » میسری دەرئەهێنا ، لەو شانۆگەری‌یەدا تووشم‌بوو بەتووشی کچە ئەکتەرەیکەوە ئەوکاتەی بەرلەوەی بەرهەمەکە لەغەم برەخسێ ئەوکچە جوانترین دەوری ئەبینی ، بەڵام کە بەرهەمەکەمان پێش‌کەش‌کرد بینیم تەواو بەپێچەوانەوەبوو . . .

کەواتە ئەکتەری وا هەیە بوونی بینەر بۆی ئەبنە هاندان‌و سەرکەوتن‌و هی‌واش هەیە بەئامادەبوونی ئەوان ئەتەپێ‌و ژێرئەکەوێ . .

لەسەر بینەریش پێویستە ئەوکاتەی ئەڕوانێتە شانۆگەری‌یەك وەك ئەوەوابێت کە لەتەماشاکردنی ڕووداوەکانی ژیانی ڕاستەقینەدا ئەبنە مایەی لێکدانەوەو بڕیاردانی .

* * *

**لەکۆتایی‌دا :—**

قوتابخانەی تایرۆف بەردەوام ڕێبازی خوی کردووەتە بانگەوازو کورتەی بانگەزازەکەش ئەم خاڵانەیە :—

- شانۆ هەریەك شانۆیە .
- هێزی شانۆ لەهێزی ئەو ڕووداوانەدایە کە لەسەر تەختەی شانۆ پێش‌کەش‌ئەکرێن .
- ڕووداو ئەکتەرەکە خۆیەتی ، چونکە هەر ئەو ئەیگەیێنێ .
- توانای ئەکتەر لەبەهرەو ڕۆشنبیری‌و پلەی زانستی دەورەکەو نواندکەیدایە .
- ئەکتەری ڕاستەقینە دروست‌کەری شانۆی سەرکەوتووە .
- گەیشتن بە بنەماکانی شانۆ وەستاوەتە سەر بوونی ڕۆشنبیریی هونەری .
- لەشانۆی نوێ‌دا بایەخ بەئیقاع ئەدرێ .
- دوا ووشە : جارێکی تریش ، شانۆ هەر یەك شانۆیە .

وەرگێڕانی لەعەرەبی‌یەوە
یاسین قادر بەرزنجی

* ئەم باسە لە کتێبی :— دراسات في الأدب والمسرح ، كمال عيد ، يونيو ١٩٦٦ ، الدار المصرية للتأليف والترجمة ، المطبعة العربية وەرگێراوە)

# ئەندرێ جید و بەرهەمەکانی

**جلیل کاکە ویس**

**کردوویە بە کوردی**

لەوانەیە ئەدەبی فەرەنسی یەکێکی وەکوو ئەندرێ جیدی تیا هەڵنەکەوتبێ کە زۆربەی لاوانی جیهان بە هەردوو چیزەوە بە پەرۆشەوە رووبکەنە بەرهەمەکانی ئەو نووسەرەی کە هەشتاو دوو ساڵ ژیاو دڵ و مێشکی هەر لە کاردا بوون تا دوا هەناسەی ژیانی . . ئەندرێ لە ساڵی ١٩٥١ ز دا کۆچی دوایی کرد ، تا ئەم مێژووە رابەری قوتابخانەی (رەهاکردنی رەوشت) Immora Lisme ی لە ویژەی فەرەنسی نوێدا دەکرد .

لە بەرهەمە نوێیەکانیدا بە رووکەشی‌یەکی بێوێنەوە ئاستەنگە دەروونی‌یەکانی لاوانی چارەسەر دەکرد بێ ئەوەی کۆ لە هیچ شتێك بکاتەوە تا لە ئەنجامدا بەرهەمەکانی جێ‌پێی خۆیان کردەوەو پاداشتی نۆبڵی لە ساڵی ١٩٤٧ ز دا وەرگرت .

جید پتر لە نیو سەدە لە کۆری ئەدەبدا خەریك بوو ، هەڵویستی نوێخوازی هەر لە یەکەم کتێبی‌یەوە دڵسۆزی‌و تەوژمی باوەرێکی بێ وێنەی لە ئامێز گرتبوو ، کە لە گۆشە نیگای تازەترین بابەتی نووسینەکانیدا وەدەرکەوت ، چونکە دەست‌پێ‌کردنەکەی بە رۆشنبیری‌یەکی پتەوەوە بوو . . وە ئەو هۆیە جەنجاڵ‌و لێك نەچووانە وەکوو بەهێزی‌و توندی کاری‌گەری کەسێتی‌و جۆری نووسینەکانی بنەمای بیری (جید)یان دروست‌کردو لەوەو دوا پێیان ناسرا ، سەرەرای تەمەن درێژی‌و هێرشی هێرشکاران .

هونەرەکەی جید کێڵگەو تاقیگەیەکی بەپیت بوو بۆ رەخنەگران چونکە لە دەیەها کتێب‌و بە جۆرەها زمان لێکۆڵینەوەو شیکارکاری خۆیان تێدا کرد .

ئەگەر ئەم تۆژینەوانە لە هەندێ رووەوە لە یەك نەچن ئەوا هەموویان لە قووڵی بیرکردنەوەو کاری‌گەری بلیمەتی (جید) دا لە ناخی نەوەی دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا یەکدی گیر دەبن . . ئەو نەوەیەی کە لە بۆتەی تاڵی‌و کارەساتدا توابۆوەو لەو سەری‌یەوە هاتبووەوە .

لە تۆژینەوەیەکی شیکارکاری هونەری (ئەندرێ جید) دا رەخنەگری گەورەی فەرەنسا (بنجامان کریمیو) دەڵێت : (هەر بە تێرامانێك بۆمان دەردەکەوێت کە جید بوونەوەرێکی دوو دڵ‌و ئاڵۆزەو کەسێتی‌یەکی دوورەگی هەیە . . ئەبێتە مرۆیەکی دەگمەنی ناو خەڵك کەچی لەپرێکا هونەرەکەی رەنگی کەسێتی خۆی دەداتەوە) .

لەراستیدا هونەری ئەندرێ‌و بیرۆکەکانی بریتین لە دەنگدانەوەی ئاستەنگی ناخی خۆی‌و کارەساتی ژیانی چونکە لەنێو خێزانێکی ئایینی دوو رەگدا چاوی هەڵێنا ، لە بابێکی پرۆتستانتی‌و لە دایکێکی کاسۆلیکی . . جید پەروەردەیەکی ئایینی سەیر کرا . ئەم پەروەردە کردنە لەتەك هەڵوێست‌و باری تاقی لاوێتی فرە دژ بەیەك بوون‌و ئەنجامێکی دژواریان لە ژیانی مرۆڤانەی (جید) دا دروست‌کرد . وە وایان لە خودی جید کرد ببێتە نێچیری جەنگێکی بێ ئامان لەنێوان جیدی ئایین پەروەری ماکی منداڵی‌و ژنەواری خێزان‌و پەروەردەکردنی‌و جیدی سەرکێش لە دەسەڵاتی ئایین بە هزرو بیری خۆی .

جید لە ساڵی ١٨٦٩ ز دا لەدایك بووە لە هەرەتی جحێڵیدا چێژی لە رێبازی جەفەنگی لە شیعری فەرەنسی‌دا وەرگرت ، کە بە رابەری فرلین‌و رامیۆو ملارمێ بوو ، ئەو چاخە گەشە بەرەو ئاوابوون دەچوو لە چێگای‌دا نەوەی دووەم جێ‌گیر بوو کە فرانسیس جێمس‌و بۆل کلۆدیل‌و بۆل فۆر سەرپەرشتیان دەکرد ، (ئەندرێ جید)یش هاتە ریزیانەوەو رێبازی شیعری جەفەنگی گرتە بەر ، ئەو رێبازەی کە لە دەریای خەیاڵدا مەلەی دەکرد ، لە دوایی‌دا خۆی لە کۆتی شیعریش رزگارکرد بۆ ئەوەی لە جیهانی ئایینی تەنگەبەرەوە هەنگاو بنێ . . وەنەبێ جید تەنها کەوتبێتە ژێر کاری‌گەری جەفەنگی‌یەکان‌و هونەرەکەیانەوە بەڵکو لە ژیانی ئەوانە وەکوو فرلین‌و راسیۆ باشترین پەندی وەرگرت بۆ دەرچوون لە رەووشتی کۆمەڵەکەی‌و توێکڵە کۆمەڵایەتی‌یە کۆنەکەیان ، بەڵام ئەندرێ جید لەم جەفەنگی‌یەدا تەواو سۆزی پێ نەگەیشتبوو ، ئەو لە سۆزدا ساردو لە ئەندێشەدا سڕ بوو بەڵام لە بیرکردنەوەدا قوڵترو لە ئارەزووی پێ‌زانینی خودی خۆی بەهێزترو هەنگاونەرتر بوو لە بابەت پەیوەنداری ژیانی گەش بینی‌یەوە .

لە یەکەم کتێبی‌دا (دەفتەرەکانی ئەندرێ والتەر) ١٨٩١ ز دەبینین ئەم راستی‌یەمان پێ رادەگەیەنێت : (پێویستە بە

چاوێکی گشتی‌و سروشتی‌و ڕەهایانەوە بڕوانینە ژیان ، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ووریایی لە دەست بدەین) .

هەروەها لەو کاتەیدا – واتا تاق لاوێتی جید – فەرەنسا کەوتە بەر شەپۆلی بیرۆکەکانی فەیلەسوفی جەرمەنی (نیتشە)و نووسەری ئیرلەندی (ئۆسکار وایلد) جیدیش کەوتە ژێر کاریگەری ئەمانەو باوەڕی سۆپەرمانی لە یەکەمەوە وەرگرت‌و باوەڕی دەسەلاتی هونەرو مافی ژیانی هونەرمەند لە پەراوێزی نەریت‌و ڕەوشتە ڕەچاوکراوەکاندای لە دووەمەوە وەرگرت .

هەروەها باوەڕی (کەسێتی پەرستن) Le Culter Lu moi ی لە نووسەری فەرەنسی (مۆرێس پاریس)ەوە وەرگرت هەر ئەمیشەوە شێوازی توانج‌تێ‌گرتن فێربوو . دۆستۆفسکی نووسەری ڕووسیش بەشی خۆی کاری تێ‌کردبوو ، بەڵام کارتێ‌کردنی نیتشەو وایلد بەشێوەیەکی زەق لە جیدی لاودا بوو کەچی کارتێ‌کردنی دۆستۆفسکی لە جیدی بەساڵاچوودا بوو .

دەبینین هەموو باوەڕێکی زێدەڕۆیی (تطرف) کاری لە جید کردووە چونکە خۆی دەبێژێ : (هەموو شتێکی زێدەڕۆیی کارم لێ دەکات) .

جید کەوتە بەر شەپۆلی بیری شاعیرە جەفەنگی‌یەکانی فەرەنساو ئۆسکار وایلدی ئیرلەندەو نیتشەی جەرمەنی‌و دۆستۆفسکی ڕووس ، بۆیە دەبینین کارە ئەدەبی‌یەکانی شەقڵی کلاسیکی‌یان تەواو پێوە دیارە . . جید گەرچی کلاسیك خواە بوو بەڵام کوێلەو حەڵقە لەگوێی هیچ کام لەوانە نەبوو کە کاریان تێ‌کردبوو ، کەسێتی‌یە سەربەخۆ بەهێزەکەی خۆی جوڵێنەری هەموو کارە ئەدەبی‌یە بەهێزەکانی بوو . . دەروونی یاخی‌و ئاڵۆز و هەوڵدانی بێ‌ووچانی بۆ خۆ ڕەهاکردن وای لێ دەکەن بەدووی ڕۆشنبیری‌یەکی فراواندا بگەڕێ ، وەکوو خۆی ووتەنی : (هەمیشە چاوەنواری شتێکی نادیارم ، چاوەنواری بابەتێکی نوێی هونەرو بیری تازەم) .

ئەم قیانی شت زانینە پاڵی پێوە نا بۆ فێربوونی زۆر زمانی بیانی بۆئەوەی ئەوانەی سەرنجی ڕادەکێشن بە زمانی زگماکی خۆیان بەرهەمیان بخوێنێتەوە .

کارە سەرەتایی یەکانی جید وەکوو : (دەفتەرەکانی ئەندرێ والتەر)و (پەیمانی نارسیس) Traite Lu Narcisse ١٨٩٢ ز وە (گەشتی ئۆریان)١٨٩٣ ز بریتین لەو دان‌پیانانەی کە بیرۆکەکانی جید دەردەخەن لێرەدا ویستی بەجارێ خۆی لەو ژیانە هەڵخەڵەتێنەرە ڕەها بکا ، لە یەکەم بەرهەمیدا دەبێژێت : (ژیانی ڕەهایی پاکترین ژیانەو بە هیچ شتێکی ناگۆڕمەوە ، لەم ژیانەدا زۆرم بینی ، ڕاستترین ژیان کورتترین ژیان بوو) .

لەم سێ بەرهەمەیدا خوێنەر لە دووتوێی دێڕەکاندا هەست بە ئارەزووی پەنامەکی دەکات . . وە ئەم سەربەستی‌یە بێ کۆتەی کە جید بە خۆی ڕەوا دیوە لە ناکاو مەیلێکی ئایینی بەسەردا زاڵ دەبێت ، هەر وەکو لە بەرهەمی یەکەمیدا دەڵێت : (هێڤی دەکەم لەم تەمەنی بیست‌و یەك ساڵی‌یەمدا کە ئەو تەمەنەیە ئارەزووەکان تیایدا گڕدەگرن بەکارێکی بەردەوامی بە لەزەت بیکوژێنمەوە ، لەو کاتەیدا کەسانی تر بە دووی خۆشی‌و لەزەت‌دا عەوداڵن ، من دەمەوێ بچمە نێو ڕەشەبای تووڕەو تاڵی‌و سوێری ژیان بچێژم) .

لە بەرهەمی (خۆراکە زەمینی‌یەکان) Les Nourritures Terrestres ١٨٩٧ ز دا دەبینین جید لەو پەڕی بای باڵدان‌دایە بەوەی کە پێمان ڕادەگەیەنێت گوایا زانست لە ڕێی بیرکردنەوەوە پەیدا نابێت بەڵکو لە ڕێی هەستەوە دێتە دی ، وەکوو خۆی واتەنی : (تۆ ناتوانی ئەو هەوڵ‌و تەقەلایەی پێویست بوو لە سەرت ئەنجامی دەی‌و بیقەرسێنی بۆ ئەوەی هەستێکی ڕاستگۆیانە بە ژیان بکەیت ، بەڵام ئێستا ئەوەش وەکوو هەر شتێکی دی لە ڕێی هەست‌و ئارەزووەوە جێ‌بەجێ بوو) .

هەروەها ئەندرێ جید لێ‌هاتووانە شان‌بەشانی نیتشەی بلیمەت‌هەوڵی دەرخستنی باوەڕی (ڕەهاکردنی ڕەوشت) یەدات چونکە لە چیرۆکی (ڕزگاربوو لە نەریت) ١٩٠٢ ز دا پاڵەوانی چیرۆکەکە (مێشێل) کە لاوێکی ناساغە چەند خۆی لە نەریتی باو دووربخاتەوە ئەوەندە ڕوو لە چاکی دەروات ، دەبینین ئەندرێ پاڵەوانی چیرۆکەکەی هان دەدات بۆ هەڵگەڕانەوە . ئەوەتا لە یاسای خێزان هەڵگەڕاوەتەوە ژن‌و ماڵی جێ‌هێشتووەو ئۆقرە ناگرێ ، ئەیەوێ بۆ دوورترین شوێن سەرهەڵگرێ ، چونکە دەرمانی ئەو لەزەت‌و سەربەستی سێکس‌و سەربەستی هەستە .

بێ‌گومان چیرۆکنووسی لێ‌هاتوو ئەوەیە هەر گاف ناگافێك چەند وێنەیەکی مرۆڤایەتی هەمەجۆرمان بۆ بکێشێ کە لە کەسێتی وێنەکێشەکەیان نەچن ، سەرکەوتنیشی لەوەدایە کە بتوانێ خۆی لە کاریگەری تەوژمی ناخی خۆی بپارێزێت .

جاری وا هەیە ڕەخنە لە جید دەگیرێ‌و هونەرەکەی بەوە لەکەدار دەکرێت کە گوایا خۆی لەپشت کەسانی ناو

چیرۆکەکانی یەوە دەشارێتەوە . وەکوو چیرۆکنووسە لێ ھاتووەکان وێنەیەکی مرۆڤانەی وامان بۆ ناکێشێت کە لە خودی خۆی نەچێت . .

لەراستیدا (جید) بەھرەیەکی چیرۆکنووسی بەتوانای تێدا نەبوو ، بەڵام سەرکەوتنی لەوەدا بوو کە بانگی بەسۆزی (ماف ژیان)ی دا .

لەو تۆژینەوە بێ ووچانەدا لەپێناو تێگەیشتنی خودی خۆیو دەرروونی مرۆڤایەتی . . لەو ئەگەرو نەگەرە پیرۆزانەی تێکۆشانی سەخت لەناخی خۆیدا لەنێوان پەروەردەکردنیو بیروباوەرەکانی ، لە نێوان سۆزی ئاینیو خۆ رەھاکردن لە نەریت . . لە کۆتاییداو لەو ھەوڵە نەترسەیدا بۆ گونجاندنی ھەردوو لایەنەکە . .

ئەمانە ھەمووی شێوەیەکی وورشەدارو نوێیان بە ھونەرەکەی بەخشیو ناوبانگێکی گەورەیان بۆ کتێبەکانی دەرکرد کە بەدەگمەن لە بەرھەمی گەورە نووسەرانی ھاوچەرخدا دەیبینین .

ھەر ئەو ھونەرە نی یە کە ئەندرێ بیی ی رەخنەگر لە بارەیەوە دەڵێت : (لەبارترین دەربرینە لەمەر گێژاوی ئەم سەردەمەی تیایدا دەژین) . لە خوێندنەوەی ھەر یەکی لەم بەرھەمانە ھەموو دەروون ئاڵۆزێك چەشەیەکی بێوێنەی لێ وەردەگرێت ، ئەندرێ خۆشی پێمان دەڵێت : (ھەموو بالقێك دەچێتە دۆخی منەوە کاتێ لە تەمەنی شانزە ساڵیدا بووم ، بەڵام لە من ئازاترو رەھاترو کامڵ تر دەبێ لە وەڵامدانەوەی پرسیارە لەرزۆکەکەی دا !) کامە وەڵام ؟ . . لەم بارەوە ئەندرێ جیدو مارسیل برۆست و بیراندللو یەکدیگیر دەبن کە گوایا ھەموو کەسێتی یەکی مرۆڤانە برێتی یە لە تارمایی یەکی لێل وێل ، مرۆڤیش دەستکردی بارو دۆخو مەزنەیە .

رادەی راستیو ناراستی ئەم باوەرە لەھەر عاستێکدا بێت شتێکی ئاییری یە ، بەڵام گومانی تێدا نی یە ئەندرێ جید دەستێکی باڵای لە نوێکردنەوەی چیرۆکی ئەورووپادا ھەیە چونکە شەقڵی باوەری (نەریتە وەستاوەکان)و (وێنە مرۆڤایەتی یەکان) کە لە ئەدەبی رۆژئاوادا لەسەر بنەمای چیرۆکی شیکارکاری بوو ، وە لە جێگای دا باوەری (نەست)ی لە پێش فرۆیدی زانادا چەسپاند . ئەم باوەرەش پەردەی لە رووی چەند لایەنێکی گرنگی غەریزەی (حەز)ی سێکسو نارێکی لە تەرازووی ھەستی خەڵکی دا ھەڵمالی . سەرکەوتنی جید لەم

لایەنەوە بەچاو مارسیل برۆستو بیراندللۆوە لەوەدایە بەوەوە ناوەستێ تەماشای ھەموو شتێك لە گۆشەنیگای دەروونناسی یەوە بکات ، بەڵکو لە ئەنجامی ئەم تۆژینەوانە دەستورێك دادەنێو لەسەری دەروات . دەستوورەکەش ئەوەیە : پێویستە ھەموو مرۆیەك ھەوڵی ئەوە بدات سروشتی خۆی تێبگاو ھەر خۆی راستی خودی خۆی بدۆزێتەوە ، وە ئەوەندەش ئازایەتی بناتە بەر خۆی بۆ وەدیھێنانی ئەو ئارەزووانەی کە خولیایەتی بەبێ ھەڵبژاردن ، واتا بێ ئەوەی مرۆڤ بەخۆی بڵێت : ئەمە لەگەڵ رەوشتو نەریتدا دەگونجێو ئەوەیان ناگونجێ . . .ھتد ، وەکو جید واتەنی پێویستە : (وەکوو منداڵێکی کاڵو ساکار دێتە دنیاوە بێ ئەوەی ژیانی شارستانی بزانێ ، وەکو درەختێکی بێ گەلا ، دەستێکی نھێنی فرێیداوە بێ ئەوەی رابردوو بزانێت ، بێ رێبازو بێ پشتو پەنا ، بێ نیشتمان ، بێ باوو باپیر) .

ئەمە لەلای جید تاقە رێگایەکە بۆ ئەوەی خۆمان بدۆزینەوە .

لە چیرۆکی (پارەی قەڵب دروستکەر)

Faux – Monnayeuts ۱۹۲۵ ز دا دەبینین (بەرنار)ی لاو رووی دەمی دەکاتە (ئەدوار)ی چیرۆکنووسو داوای ئامۆژگاری لێ دەکات کە چۆن دەستورێك بۆ ژیانی دابنێ ، ئەدواریش بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە : (ئەم دەستوورە لە خۆتدا دەدۆزیتەوە بە مەرجێ مەبەست پێش کەوتن بێت . . لەمە زیاتر شك نابەم کە پێت بڵێم : تۆ تەنھا ئامۆژگاری لە خۆت وەردەگری ، ھەوڵی ئەوە مەدە فێری ئەوە بیت چۆن بژیت تەنێ ئەوە نەبێت کە پێویستە ھەر بژیت) .

بۆئەوەی لە گۆشە نیگای (جید)ەوە ژیانێکی بێ کۆتو سنوور بژین گەرەکە کاتی پێویست رارا نەبینو ھەمیشە لەو پەری ئامادەبووندا بین بۆ گۆرینی باری ژیانمان ، چونکە ئۆقرەگرتن گەورەترین دوژمنی (جیدە) .

وەکوو بینیمان بیرۆکەکانی جید لەبارەی سەربەستی رەھاوە بەسەر سۆزە ئاینی یە پەنامەکی یەکەیدا زاڵ نەبووە بەڵکو ئەو باوەرە بەھێزەی بە رەھابوونو خۆ بەدەستەوەدان ئەنجامێکی ئاوەژووی لە ھەستماندا دروستکرد ، وای لە خۆشی کرد جڵەوی ئارەزووی ئاین پەروەری شۆر بکاو تاوناتاوێك بەسەریدا زاڵ بێت ، بێ ئەوەی ھەوڵی شاردنەوەی بدات . دەبینین بە شێوازێکی سۆفیانە باسی خواو ژیانی جاویدانی دەکات .

جيد هەڵوێستی خۆی بە فەلسەفەیەك ڕوون‌دەكاتەوە كە گرنگترین تازەگەری‌یە لە بیركردنەوەیدا ، ئەویش ئەوەیە ، چێژ Plaisir و خۆشەویستی Amour لە یەك جودادەكاتەوە . بە ..ڕێكی تردا جیاكردنەوەی لەش Corps و دەروون Ame . لەبەر ئەوە دەبینین هەموو پێویستی‌یەكی لەش ڕەوا دەكاو .. لایەكی تریشەوە ڕێگە بە ئەنجامدانی هەموو پێویستی‌یەكانی دەروون دەدات بۆ پەنابردنە بەر هێزێكی باڵا .

.ەم دەستەواژەیەی خوارەوەدا جید تەواو دان بەم لایەنەدا ..نێ لەمەڕ ئەو ئاستەنگە دەروونی‌یانەی تێیان كەوتووەو .ویستویەتی خۆی لێیان ڕزگار بكات : (زۆر جار دووپاتم كردۆتەوە لە بارەی ئەو شتانەی پەیوەندی‌یان بە خۆم وە هەیە كە چۆن بارو هەڵوێستی خۆم داوام لێ دەكەن خۆشەویستی‌و چەشە ..ێك بترازێنم بەڕادەیەك جیاكردنەوەیان ئازاریشی دەدام) . هەروەها دەڵێت : (من خۆم جیاوازیم لەنێوان چەشەو خۆشەویستی‌دا كرد ، بۆم دەركەوت جیاكردنەوەی ئەم دووانە پێویستە ،چونكە چەشە زۆر خاوێنەو خۆشەویستیش ئەوپەڕی پی‌گەیشتنە) .

بەلای (جید)ەوە چۆك‌دادان بۆ داواكاری لەش جۆرێكە لە ئەمەك‌و بێ‌تاوانی . . كاتێ مرۆڤ داواكانی سروشت‌و غەریزەكانی خۆی جێ‌بەجێ دەكات كە لەگەڵیدا لەدایك دەبن ئەوە دەگەیەنێت كە كڕنووشی بۆ خواستی خوا بردووە .

جیاوازی لەنێوان ئەو كەسەی كە خواست‌و ئارەزووە پاكەكانی جێ‌بەجێ‌دەكات لەگەڵ ئەو كەسەی هەندێكیان حەشار دەدات ، وەكوو ئەو جیاوازی‌یەیە : (یەكێك هەموو شتێك بخواو یەكێكی تر تەنها سەوزە بخوات) .

هەروەها دەڵێت : (لە مرۆڤدا تەنها شتی پاك‌و بێ‌گەرد . هەیە ، ئەو خواست‌و ئارەزووانەی لە سروشتی مرۆڤدا هەن تێكڕا واتای پاكی‌و دروستی‌و ئەمەك هەڵ‌دەگرن . .

پێویستە بێ هەڵبژاردن بیان‌پەرستین چونكە (هەموو هەڵبژاردنێك سەربەستیان لێ تێك‌دەدات) .

لە بەرهەمی (ئەگەر تۆوەكە نەمرێت) Sile Graimne Meurt ١٩٢٦ ز دا دەڵێت : (لەپشت پەردەی ناخمدا بیرێكی شارراوە نی‌یە . . پێویستە دوای ئەم چەشنە چەشانە نەكەوین ، وەكوو هەست‌كردن بە پەشیمان بوونەوە) .

ئەو لێرەدا دەیەوێ بڵێ : ئەگەر لەپشت بیری ڕەهاوە باوەڕێكی پەنامەكی یان مەبەستێكی تایبەتی هەبێت ئەو كاتە لە بازنەی پاكی‌و دڵسۆزی دەچێتە دەرەوە .

لەبەر ڕۆشنایی ئەوانەی باسمان‌كردن دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە ئەندرێ جید بیرێكی دوو ڕەگی هەیەو ئەمەش ناوەڕۆكەكەیەتی :-

یەكەم – لایەنی غەریزەی لەش لە مرۆڤدا كە لایەنێكی یێگری‌و سادەیە .

دووەم – لایەنی هەستی‌و رۆحی ، ئەمیش یان بارێكی تایبەتی هەست‌كردنی ئایینی‌یە یان بارێكی ئەهریمەنانەیە لە مرۆڤدا .

لەوانەیە ئەم دیاردەی خۆ دوورە پەرێز گرتن لە هەموو بیرێكی لاوەكی‌و هەڵگەڕانەوەو دڵەڕاوكێ‌و ئۆقرە نەگرتنی هەمیشەیی جید كە لەگەڵ ژیانی‌و بەرهەمەكانیدا . بەدرێژایی دەیەها ساڵ هات‌و بووبووە جێ‌ڕەخنەی ڕەخنەگران ، گەورەترین هۆیەك بێت بۆئەوەی بیگەیەنێتە عاستی مرۆڤێكی مەزن‌و بێ‌هاوتا . بەدرێژایی تەمەنی بووبووە (كێڵگەیەكی دوودڵی) هەر وەكوو یەكێك لە مریدەكانی خۆی (جاك ریڤیر)نووسەری فەرەنسا باسی‌دەكا : (بیری ئۆقرە ناگرێت ، ژیان بە باری بیرو هەستەوە شیتەڵ‌دەكات ، دوورترین شوێنی وولات پەی‌دەكات هەر بۆئەوەی بگات بەو ڕاستی‌یەی بەدوویدا وێڵە) .

كاتێ بمانەوێ ئەندرێ جید هەڵسەنگێنین پێویستە لە ڕوانگەی هێمای كەسێتی‌و ئامانجە دوورەكانی‌یەوە تەماشای‌بكەین كە بە كارە نەمرەكانی‌یەوە دیارە .

جید فێرمان‌دەكات چۆن زاڵ‌بین بەسەر ئەو ترس‌و لەرزو شەرمە بێ جێ‌یانەی بەسەرماندا زاڵن . فێرمان دەكات چۆن كەلەبەری شاردراوەی دەروونی تاریكمان بدۆزینەوە كە لەوەوپێش وامان‌دەزانی پەیوەندی‌یان پێمانەوە نی‌یە ، فێرمان‌دەكات ئەوەی لە دڵماندایە بێ‌دركێنین بێ‌ئەوەی خۆمان بدەینە دەست غەریزە ئاژەڵی‌یەكانمانەوە ، پێویستە لەگەڵ ڕەوشتی زگماكی خۆماندا بەدڵسۆزی ببزوێین‌و هەمیشە ئامێز بۆ گۆڕانكاری ژیان بكەینەوە .

لە نووسین : علي كامل
لە كتێبی : من أعلام الأدب الاوربی



# دیـــــاردەی «خۆکوشتن»و دنیایەکی سەیر !

**نەوزاد ئەحمەد**

**مانای وەستانی خوێن لە لەشی مرۆڤدا چی‌یە؟هیچ . . جگە لە مردن. هەر لەزۆر کۆنەوە کەوتنە ناو دنیای خامۆشی‌و بێ‌دەنگی هەتاهەتایی ، مرۆڤی ترساندووەو بەدرێژایی هەموو سەدەکان گڕی لەسۆزی شاعیرەکان بەرداوە.**

داستانەکان بۆمانی دەگێرنەوە کە چۆن «گەلگامش» لە (ئور) هاتە خوارەوەو لە نهێنی «لەناوچوون» ڕاما ،

ـەری ئەوەی کە بینی چرنووکی مردن
ـمجەقی‌یە ناو لەشی «ئەنکیدۆ»ی
ـەوری‌یەوە . بەلاّم چی دەربارەی ئەو
کەسە بلێین کەژیان لەخۆی دەشوێنی‌و
ـەرگای ژیان لەخۆی دائەخات ،
ـێشوازی هەڵبژاردنی مردن بکات ؟
خۆی بکوژێت ؟ وەکو گەلگامش
ـەسەرسامی‌یەوە بەرامبەر بەتووندوتیژی
مردن راوەستا ؟

زۆربەی زانا سایکۆلۆژی‌یەکان بەرامبەر بەدیاردەی خۆکوشتن (یان راستر بلێین لەناوبردنی خود) دەستەوسان راوەستاون ، ئەوەی دیارە لە ولاّتە پیشەسازی‌یە پێشکەوتووەکاندا رووداوی خۆکوشتن زۆر زیاترە وەك لە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکان ، بۆیە ئەبینین پەیوەندی‌ی نێوان دیاردەی خۆکوشتن‌و پێشکەوتنی تێکنۆلۆژیا ، لە ولاّتە سەرمایەدارەکاندا ، راستەوانە دەگۆڕری ، چونکە پێشکەوتنی پیشەسازی لە ولاّتی سەرمایەداری‌دا ئەبێتە هۆی دروستکردنی قات‌وقڕی‌و خراپی گوزەرانی ژیان کە ئەمەش کاریگەری زۆر لە پەیوەندی‌یە کۆمەلاّیەتی‌یەکان دەکات .

دیادەیەکی دیکەش لە ولاّتە سەرمایەدارەکاندا ئەبینرێ ، ئەویش ئەو کەسانەی کە خۆیان ئەکوژن زۆربەیان لە چینی دەوڵەمەندو بۆرژوازی‌یەکانن ، ئەمەش زیاتر لێك هەڵوەشان‌و جیابوونەوەی ئەندامانی خێزان هانی هەوڵدانی خۆکوشتن ئەدا بەتایبەتیش لە ریزی لاوەکاندا ، بەپێچەوانەی ئەو خێزانانەی کە بەبەختیاری لەناویەکدیدا ئەژین . بۆ نموونە ، لاوێکی ئەمریکی خۆی کوشتووەو نامەیەکی لەپاش خۆی بەجێ‌هێشتووەو تێیدا نووسیویەتی «من لاوێکی لەش ساغم ، هیچ کەم‌وکوری‌یەکم نی‌یە ، پارەیەکی زۆریشم هەیە ، کەوابوو بۆچی بژیم ؟» هەروەها ئەرنەست هەمەنگوای ، مارلین مۆنرۆ ، کینیث سۆب ،توانی هانکۆك‌و زۆری تریش ، هیچ گیروگرفتێکی دەرامەتی‌یان نەبووە یاخود نەبوونی پێویستی‌یەك کە پاڵیان پێوەبنێ بۆ کۆتایی پی‌هێنانی ژیانیان ، کەواتە هۆی خۆکوشتنی ئەمانە چی‌یە ؟ دیارە خۆکوشتنی هەریەکەیان لەئەنجامی پێکداچوونی بیروباوەڕی مرۆڤانەی خۆیان‌و جیهانی دەرەوەیە کە ئەم دژایەتی‌یەی سەپاندۆتە سەریان‌و لەپێشدا بەرەو نائومێدی‌و ڕەشبینی ئینجا بەرەو مردنی بردوون .







شایانی سەرنجدان‌و لێکۆڵینەوەیە کە ئەم دیاردەیە بەزۆری لەنێو ریزی لاوەکاندا ڕوودەدات ، ڕێژەو شێوازی خۆکوشتنیش لەولاّتێکەوە بۆ ولاّتێکی دیکە ئەگۆڕرێ ، یەکێك لە لێپرسراوانی نەخۆشخانەیەکی بەریتانیا تیشکی خستۆتە سەر هەندێ لەو هۆیانەی کە لاوەکانی والێکردووە ڕێگای خۆکوشتن بگرنەبەر ، پەنجەی بۆئەوە راکێشاوە کە هەندێ لە باوکان ناتوانن بەشێوەیەکی ئاسایی لەنێو ئەندامی خێزانەکەیان بژین‌و زۆربەی کاتیان بەخواردنەوە بەسەرئەبەن‌و پاشان بەتووندوتیژی‌و تووڕەیی‌یەوە بۆ ماڵەوە ئەگەڕێنەوەو گیروگرفتێکی زۆر دروست‌ئەکەن کە ئەمەش بەشێوەیەکی سەلبی کار لەدەروونی منالەکانیان ئەکات .

هەندێ جاریش (گیروگرفت)یان هۆیەکی دیاریکراو نابێتە هۆی خۆکوشتن ، هەندێ هۆ هەیە زۆر نابەجێ‌و کردارێکی شێتانەیە کە ببێتە هۆی کوژاندنەوەی چرای ژیان ، بۆ نموونە : کچێکی هەرزەکار هەوڵی خۆکوشتنی دا بەڵام دوای هەوڵێکی زۆر توانرا رزگار بکرێ ، کە لە هۆیەکەیشیان پرسی لەوەڵامدا ووتی «دایك‌و باوکم رازی نەبوون لەو جۆرەی کە خۆم ئەمەوێ پرچم تەسریح بکەم» هەروەها کورێکی تەمەن (١٥) ساڵ خۆی‌کوشت ، دوای ئەوەی هەموو جێگایەکیان پشکنی شتێکی ئەوتۆیان نەدۆزی‌یەوە کە هۆی خۆکوشتنەکەی روون‌بکاتەوە ، بەو مەرجەی هیچ گیروگرفتێك لەنێو خێزانەکەیاندا نەبوو و کورەکەش رەووشت چاك بوو و لەوانەکانیشیدا سەرکەوتوو بوو .

دیاردەی خۆکوشتن لە (یابان) شێوەیەکی توندوتیژتری وەرگرتووە ، راپۆرتێکی رەسمی لە (تۆکیۆ) ئەوەی راگەیاندووە کەهەر لەساڵی ١٩٧٨دا نزیکەی (٧٨٤)کەس خۆیان کوشتووەو زۆربەیان تەمەنیان (٢٠) ساڵ ئەبێ ، هۆی بنەرەتیی ئەو خۆکوشتنەش ، بەربەرەکانێی نێوان قووتابی‌یە لە قووتابخانەکاندا ، سەرەتاکەی ئەو بەربەرەکانیەش لەپرۆگرامی وانەیی یاباندا بەشێکە لەمەرجەکانی بەهێزکردنی سەرمایەداری ، لەهەموو وڵاتە سەرمایەدارەکاندا قووتابی هەست بەوە دەکات کە دەبێ هەوڵ‌بداو نمرەیەکی بەرز بێنێتەوە بۆئەوەی پاشەڕۆژی ماددی‌و مەعنەوی‌ی خۆی مسۆگەر بکات ، لێرەدا قووتابی دەبێ بەخۆبەخت‌کەر (ضحیه)ی ئەو بەربەرەکانێ‌یە ، جاری‌واش هەیە لەئەنجامی سەرنەکەوتنی لەهێنانەوەی نمرەیەکی بەرزدا ، بەسەر پەیژەی مردنا سەرئەکەوێ ، ئەمە وەکو بەسەر کچە قووتابی‌یەکی یابانیی تەمەن ١٣ ساڵدا هات‌و لەنهۆمی (١٤) مینی کۆشکێکەوە خۆی فرێ‌دایە خوارەوە ، ئەم کچە نامەیەکی بەجێ‌هێشتووەو تێدا نووسیوەتی (دایە . .بابە . .ببوورن ، بروام بەژیان نەماوە ، لەبەرئەوەی لەوانەی ماتماتێك نمرەیەکی بەرزم دەستگیر نەبوو . . ماڵ‌ئاوا»

هەموو ساڵێك لەئەمریکادا نزیکەی (٢٠٠٠٠) بیست هەزار کەس خۆیان ئەکوژن‌و (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار کەسیش هەوڵی خۆکوشتن ئەدەن ، هۆی سەرەکیی ئەو خۆکوشتنەش ، رژێمی بۆگەن‌و داتەپیوی سەرمایەداری‌یە ، کە بارێکی ناخۆش‌و خراپی دروست‌کردووە لە گرتن‌و کوشتن‌و برین‌و دزین‌و زۆر کاری دیکەی خراپ ، هەروەها فلیمی کاوبۆی‌و مرۆڤ کوشتن‌و توندوتیژی بەبەردەوامی لەسینەماو تەلەفزیۆن پیشان ئەدرێ کە ئەمەش کارێکی زۆری لەمێشك‌و دەروونی خەڵکەکە کردووەو لەحاڵەتێکی نەفسیی ناخۆشدا ئەژین کە بریتی‌یە لە بێزاربوون‌و راکردن .

دیاردەی خۆکوشتن لە ئەورووپای رۆژئاوادا بەگشتی ، لەدوای ساڵی ١٩٧٣ — وە پەرەی سەندووە ، بەزۆری لە نێو ریزی لاوەکان‌و ئەوانەی تەمەنیان لە (١٥—٣٠) ساڵیدایە . هۆیەکەشی ئەزمەی باری ئابووری‌ی سەرمایەداری‌یە ، زۆربەی وڵاتە سەرمایەدارەکان ، بەپلەی یەکەم ئەڵمانیای — رۆژئاواو ئینگلتەرەو ئیتالیا بێ‌کاریی زۆر تێدا بلاوبۆتەوە ، نزیکەی ٩ ملیۆن بێ‌کار تەنیا لە ئەڵمانیادا هەیە . ئەمەش دڵەراوکێ‌و بارێکی ناخۆش دروست‌ئەکا کە پاڵ بەهەندێ لاوەکان ئەنێ رێگای خۆکوشتن بگرنەبەر ، واتە سێ‌یەکی ئەوانەی ئەمرن بەهۆی خۆکوشتنەوەیە ئەگەر لەگەڵ مردنی ئاسایی بەراورد بکرێ .

یەکێك لە پزیشکە دەروونی‌یەکان دەڵێ «ئەوان لەهەمان کاتدا حەز بەژیان‌و مردن ئەکەن ، هەنگاونان بەرەو خۆکوشتن لەئەنجامی دوودڵی‌و رق‌لێ‌بوونەوەی ئەو بارە ناخۆشەوەیە کە لاوە بەریتانی‌یەکانی تێدا ئەژین . ئەو ژیانەی بووەتە دیوارێك‌و رێگای بینینی حەقیقەتی لێ‌گرتوون ، بۆیە ئەبینین کە ئەوان بۆ نارەزایی دەربرین تەنها ناچاری لێدانی زەنگی مردنن» .

رێگاکانی چارەسەرکردنی بژیشکی ، تا ئیستا نەیتوانیوە چارەیەك بۆ ئەو خۆکوشتنە بدۆزێتەوەو رادەیەکی بۆ دابنێ ، بەڵام ئایا لەهەموو سووچ‌و قوژبنێکی ئەم زەوی‌یەدا هیچ هۆیەکی پزیشکی هەیە بتوانێ ژیانی مرۆڤێك بگەرێنێتەوە کە لە نهۆمی (٣٠) هەمینی کۆشکێکەوە خۆی فرێ‌دابێتە خوارەوە ؟ بێ‌گومان نەء .

رۆژ لەدوای رۆژ ، لەوڵاتی سەرمایەداری‌دا ، کاری توندوتیژی‌و دیاردەی خۆکوشتن لەزۆربووندایە ،

- ئایا ئەبێ ئەم کارە هەر لەم رادەیەدا بوەستێ ؟ نەخێر ، لەبەرئەوەی لەپاڵ خۆکوشتنی لاوەکان ، ئەم دیاردەیە بەو پزیشکەکانیشدا بلاوبۆتەوە !

**- «خۆکوشتن»لەناو ریزی ئەدیبەکاند -**

لیستەی ناوی ئەو ئەدیبو شاعیرانەی خۆیان کوشتووە زۆرنو هۆیەکانیش ئاڵۆزو جۆربەجۆرو نادیارن ، غوربەتیو سەرنەکەوتن لەکاری ئەدەبی بەس نی یە بۆ روودانی خۆکوشتن بەڵکو هۆی تری شارراوە هەیە کە پاڵی پێوە ناون بۆ خۆکوشتن . «فرجینا وۆڵف» پاش ئەوەی تووشی بێزارییەکی سامناك بوو ، خۆی خنکاند «هارت کرین» خۆی خستە ناو دەریای کاریبی‌یەوە ، دوای ئەوەی خۆی بەسەرنەکەوتوو زانی ، «سلفیا بلاث»ی کچە شاعیر خۆی کوشت ، لەبەرئەوەی هەستی بەوە دەکرد کە دیلی جیهانە شیعرییەکەیەتی کە هەر خۆی دروستی کردبوو . «دیلان تۆماس»و «براندن بیهان» هەتا مردن خواردیانەوە .گەلێکی تریش لەوانەی خۆیان کوشتووە وەکو : سیزار بافیس ، مایکۆ فسکی ، پۆل سیلان ، راندل گاریل ، بەسنین . هەروەها لە نیگارکێشەکانیش : مۆدلیانی ، ئارشیل گۆرکی ، جاکسۆن روڵوك ، مارك رۆسکۆ .

داوی ئەوەی ژمارەی ئەو کەسانەی لەنێو ریزی (دادایزم) ەکانەوە خۆیان دەکوشت زوربوون ، ژمارەیەکی تری گۆڤاری «شۆرشی سوریالیزم» دەرچوو بابەتێکی بەناوی «ئایا خۆکوشتن چارەسەرە ؟»ی تێدا بلاوکرایەوە وەلامی زۆربەی سوریالییەکان بەشێوەیەکی ئیجابیانە بوو ، لەوانە (رینیە کرافیل)بوو کە لە دوایشدا خۆی کوشت ، هەروەها «جاك فاشیە» کە کارێکی زۆری لە «ئەندریە بریتۆن»ی دامەزرێنەری سوریالیزم کرد ، ئەویش خۆی کوشت ، جاك فاشیە ئەیووت : «من لەجەنگدا دژی مردنم ، ئەوکاتە دەمرم کەخۆم بریاری لەسەر دەدەم ، من لەگەڵ هاورێیەکی خۆشەویستدا دەمرم»هەروواش بوو ، لەساڵی -١٩١٩- دا کە تەمەنی ٢٣ ساڵ بوو ، لەگەڵ دوو هاورێی خۆشەویستی بۆ گەشتێك چووبوون ، لەوێ هەردوو هاورێکەیو خۆیشی کوشت .

**- ناودارەکانی جیهان ئەوانەی خۆیان کوشتووە -**

- «نیرۆن»بەخەنجەرێکی ژەهراوی خۆی کوشت .
- «مارك ئەنتۆنی»سەرۆکی رۆکانیاو خۆشەویستی «کیلۆپاترا»ژەهری خوارد ، دوابەدوای ئەویش (کیلۆپاترا)خۆی کوشت .
- (رۆمیۆ)و «ژولیێت»پێکەوە خۆیان کوشت .
- (رۆدلف)پادشای نەمساو «ماریا»ی خۆشەویستی خۆیان کوشت .
- (هیتلەر)ی نازی لەکاتی رووخانیا گوللەیەکی بەسەری خۆیەوە نا . هەروەها (گۆبلز)و خێزانەکەی ، پاشان (گۆرنج)ی هاورێی هیتلەر .
- لە فەیلەسووفەکانیش : (سوکرات)و (دیۆجین)و(سینیکا) .
- نووسەری بەرزی ئەمریکا (هەمەنگوای) دوای ئەوەی لەژیان بێزاربوو .
- (راندل کاویل)ی شاعیری ئەمریکی .
- (یاسوناری کاواباتا)ی نووسەری یابانی .
- نووسەرومێژوونووس (ستیڤان زڤایج) .
- (کلایست)ی شاعیری ئەڵمانی .
- (صادق هدایت)ی چیرۆك نووس .
- (فرجینا وۆڵف)و (مەدام بۆڤاری) .
- نیگارکێشی ناودار (ڤانکوخ) .
- ئەکتەری سینەمایی بەناوبانگ (مارلین مۆنرۆ)هەوەها نووسەری شانۆیی ئەڵمانی (تۆلر) .
- (یوکیو میشیما)ی رۆماننووسی یابانی لەساڵی - ١٩٧٠- دا خۆی کوشت .

**سەرچاوەکان :**


١ - الموت اختیارا - د . فخری الدباغ .
٢ - گۆڤاری (الفکر المعاصر)ژمارە (٢)ساڵی (١)-١٩٧٤ .
٣ - ژمارەیەکی رۆژنامەی (الجمهوریة) باسێك بەناوی (نرخی ژیانو دیاردەی خۆکوشتن)لەلایەن : رحیم السعدون .
٤ - (ملفات مروان)ئێستگە مۆنتیکارلۆ - شەوی یەكشەم ، ١٩٨١/٥/٣٠ باسێك دەربارەی (خۆکوشتن لە ئەوروپادا) .

# کاتێ ئەستێرەیەک ئەکشێ

هیوا عمر احمد

کولوەبەفرەکان وەکو ڕیشاڵەلۆکە دائەباری‌یە ناو شەقامو سەربانو ماشێن‌و شانو سەرو ملی هاتوچۆکەرانو توێژێکی زیوینی سپی دروست دەکرد . . . . زۆری نەدەبرد جێ‌پێ‌ی ڕێبوارو جێ تایەی ماشینەکان پەڵەیەکی بۆریان لەو کالاّ سپی‌یەدا جێ‌ئەهێلاّ کە شارەکە پۆشیبووی .

وردەوردە پەڵەکان پڕئەبوونەوەو دیارنەئەمان ، تا ڕێبوارێکی ترو ماشینێکی تر پەڵەیەکی تریان تیا جێ‌ئەهێشت . گەرچی باش خۆی نەپێچابووەوە ، هەستی بە سەرما نەکرد . وای ئەزانی وەك ئەو کۆمەڵە مناڵە ، کە لەسەر شۆستەی شەقامەکان هەڵبەزو دابەزیان ئەکردو هەوڵی گرتنی کولوە بەفرەکانیان ئەدا گەڕاوەتەوە تافی منداڵی . وای هەست‌ئەکرد خوێنی منداڵی بەدەمارەکانیا دێت‌و ئەچێ . حەزی‌دەکرد بکەوێتە هەڵبەزو دابەزو بەفرگرتن . مناڵی‌ی خۆی بیرکەوتەوە چۆن شێرە بەفرینەی بۆ – شێرۆ – ی برای ئەکرد ، خەڵوزی بۆ ئەکرد بە گلێنەی چاوو بە جووتە سواری پشتی ئەبوون . لە سەرمادا شین هەڵ‌ئەگەڕاو هەندێ زستان بەسەریشیدا نەخۆش‌ئەکەوتن‌و لە جێ‌دا لەپاڵ سۆپا دارینەکەیانەوە لی‌ی ئەکەوتن‌و گوێ‌یان بۆ ئەو چیرۆك‌و سەرگروشتانە ڕائەدێرا کە داپیرەیان بەدەم نوێڵەنوێڵی کۆنە سۆپاوە بۆی ئەگێڕانەوە . کە چاکیش ئەبوونەوە ، وەك نە بایان دیبێ‌و نە بۆران ڕایان ئەکردە ناو بەفرەکەو شەرە تۆپەڵیان دائەمەزراند .

هێدی هێدی وەك نەیەوێ بستێ لەژێر بەفرەکەدا بجووڵێ ، لەسەرخۆ هەنگاوی ئەنا . وەك بڵێ‌ی نەیەوێ ئازاری بەفرەکە بدات . یان نەیەوێ دیمەنی دلڕفێنی توێژە زیوینەکە بشێوێنێ . بەلاّم جێ‌پێ‌ی ئەمیش وەك هەموو ڕێبواران ، پەڵەیەکی بۆری لە بەفرەکەدا جێ‌هێشت . کە گەیشتیشە شوێنی کارکردنی خۆی حەزی‌ئەکرد بێتەوە بەر بەفرەکە .

بەلاّم ناچاربوو لەبەر مێزەکە دانیشێ ، پاش کەمێ وەرچەرخا ، پشتی کردە مێزەکە ، ئانیشکی دادایە سەر لێواری پەنجەرەکەو چەنەی خستە نێو لەپی دەستی‌و کەوتە سەرنج‌دانی نیشتنەوەی کۆترە باریکەی بەفرەکە بەسەر لق‌وپۆپی درەختە رووت‌و دارتەلەکانەوە .

هێندە مەست‌بوو ، وای ئەزانی دارەکان هەنارو هەنجیر ئەگرن‌و خۆ ئامادەئەکەن مرۆڤی بێت‌و لی‌یان بکاتەوە . . . بەلاّم موخابن مرۆڤیش تەمەن کورتەو مردن ناهێڵێ بگاتە پۆپەی هەوڵ‌و تواناو ئاواتەکانی ، کەمێکیان نەبێ کە هەرچەندە تەمەنیان درێژبێ ساتێ بۆخودی خۆیان ناژین‌و وەك چرایەك ڕێ‌ی ژیان‌و هاتوو بۆ خەڵکی ڕۆشن‌ئەکەنەوە ، ئەسووتێن‌و چاوەڕێ‌ی سووتانی خەڵکی ناکەن ، بڕوایان وایە مرۆڤ بە سووتان لەپێناوی خەڵکی‌دا پاك‌ئەبێتەوە وەك خۆڵەمێش نەرم‌و پاك‌ئەبێ . ئاگای لە کردنەوەی دەرگاکەی نەبوو :

– بەیانیت باش .

گۆمی تێ‌ڕامانی شڵەقا ، ئاوڕی‌دایەوە ، وەرچەرخاو پشتی کردە بەفرو پەنجەرەکە .

– بەیانیت باش .

هێشتا بەپێوەبوو ، ژان‌و خۆگرتن‌و ئازارو خەمێکی قووڵ تابلۆی دەم‌وچاویان نەخشاندبوو ، چەند چرچێکی ناوەخت کەوتبوونە ناوچەوان‌و ڕوومەتی ، وەك مۆرکی ژیان ، هەژو سوگوارو دڵشکاوییان لێ ئەتکا : – کچەکەم هێناوە .

کام کچ ، بەرلەوەی بێتەوە یادی ، دەرگاکە بە ترس‌و دەستێکی لەرزۆکەوە کرایەوە ، ئافرەتێکی گەنج ، دەم‌وچاو گرژ ، نیگا قووڵ ،

ـرکی قژزەردی چاوکاڵی پێنج شەش ساڵەی ڕەنگ زەردو تۆقیوی
ـ ـوەشەوە بوو ، بێ سلاو وەکو نەمام لە بەردەم مێزەکەدا چەق ،
جـی بڕی‌یە داباریی بەفرەکە ، کێ ئەڵێ وەکو خوێ زامی توێ‌توێ‌ی
ـی ـاچوزێنێتەوە .

- ـەسەر ئەو جێگەیە درێژی‌کە .

ـاروکەکەی سەری پەڕی ، کزە لە جەرگی ئەمەوە هات ، بەبێ قژە سەـردەم‌و چاوە بێ‌ڕەنگەکەی خەمبارو بەژان‌و تۆقیو دیاربوو . کەمێ ـەستی هێنا بە ناوچەوان‌و پشتگوێ‌و ژێرچەنەو لا مل‌و سەرشان‌و ـ هەنگڵ‌و سکی‌داو بە زەردەخەنەیەکی بزرکاوەوە ووتی :-

- وادیارە نەخۆشی‌یەکەی چۆتەوە قۆناغی نیشتنەوە .
- دکتۆر گیان ، ئێستا چاکە ، ڕەنگ‌و رووی گەشاوەتەوە .

بە دەم پشکنینەوە ، لە دڵی خۆی‌دا ئەیووت ( نازانم ئەم نەخۆشی‌یە کوشندانە بۆ خولقاون ؟ گوڵێکی تازە پشکوتوی وەك ئەمە نەژاکێن‌و باوانی بەم شێوەیە گیرۆدە ئەبن .

تۆ بڵێ‌ی سزای هەڵەو چەوتی باوانی بێ ؟ یان گەر بەم نەخۆشی‌یە نەناو نەچێ ، لە داهاتوودا زیان بە کۆمەڵ ئەگەیەنێ ؟ یان بۆ ئەوەیە هەزارانی وەك من‌و دایك‌و باوکی ببری لێ بکەینەوەو نرخی تەندروستی‌و ئاسودەیی خۆمان بزانین ؟ بەڵکو لە داهاتوویەکی نزیك‌دا دەرمانێکی بۆ بدۆزرێتەوەو لەم‌و سەدانی وەك ئەمی بپەڕێنێ) .

- ( جلەکانی دابکەنە )

کە رووتیان کردەوە ، کیژۆڵەکە بریتی‌بوو لە پێستێکی زەردو سیس ، چەن پارچە ئێسکێکی باریکی داپۆشیبووە ، خستی‌یە سەر لای چەپ‌و لە زەنگی‌دا . لە چاوتروکانێك‌دا ، پەرستارێك بە بەروانکە سپی‌یە چڵکنەکەیەوە خۆی کرد بە ژووردا .

- ( فەرموو )
- (کەل‌وپەلی ئاو لە پشت دەرهێنانم بۆ بهێنەو حەمەش بانگ بکە)

حەمە کارکەرێکی بەخۆوەی چوارشانەبوو ، بانگیان ئەکرد تا ئەو منالانەیان بۆ بگرێ کە ئاویان لە پشت دەرئەهێنا .

مرۆڤ زۆر ئازارو ژان ئەکێشی‌و کەس‌وکاری زۆر ماندووئەکات ، تا شوێنێ لە شانەی مرۆڤایەتیدا بۆ خۆی ئەکاتەوە ، لەپڕ نەخۆشی‌یەك ، ڕوداوێکی گێلانەیان وەچەکانی ئەژدیهاك ، وەك چۆن پەڵەیەك لەسەر بەرگێکی سپی بسڕیتەوە ، لە ژیانی ئەسڕنەوە . کەمێ نەبێ کە ئامادەنین وا بە ئاسانی لە ژیان بسڕێنەوە .

ئەبنە ژیلەمۆو کڵپەئەسێنن‌و جۆری ژیان‌و مەرگی خۆیان هەڵ‌ئەبژێرن‌و هەوڵ‌ئەدەن دەوروپشتیان وا سەربەست‌و شادبن‌و شوێن پەنجەیان بە پەرەی ژیانەوە ئەمێنێتەوەو ئەستێرەیان لە دڵی خەڵکی‌دا ناکشێ .

مرۆڤ نەخۆش بێ‌و لەش ساغ ، شا بێ‌و گەدا ، بیەوێ‌و نەیەوێ ، ناتوانێ خۆی لە سوورانەوەی چەرخی گەردوون رزگاربکات . تەمەنی تادێت زۆرئەبێ‌و ئەو ڕۆژانە کەم‌ئەبنەوە کە ماوەیەتی بژی . کە تەمەنی گەیشتە قەڵاپۆیە ئەبێتە لاشەیەکی ساردوسڕی وا تەنانەت نزیکترین کەس‌وکارو خۆشەویستی کە چەندەها شەونخونی‌یان بۆ ناساغی کێشاوەو چاویان لە دووریا سوورکردووە ئەکەونە خۆیان‌و ئەیانەوێ بە زووترین کات لاشە ساردەوەبووەکەی لە بەرچاو وون کەن‌و لە کەمێ خامی بپێچن‌و لە بستوکێ خاك‌دا بیشارنەوە .

حەمەو پەرستارەکە ، بە کەل‌وپەلەکانەوە هاتن ، کیژۆڵەکە کەوتە نووکەنووك ، هەر کە حەمە کەمێ قەرەوێڵەکەی ڕاکێشاو چووە پشتی‌یەوە ، ئەم دەستی بە گریان کرد ، ئەویش بە دەستە پان‌و قامکە زبرەکانی ، بە جۆرێ سەرو ئەژنۆی هێنایەوە یەك ، پشتی کەوانەیەکی ڕێکی دروست‌کردبوو .

کیژۆڵەکە بە جۆرێ ئەگریاو ئەیناڵاند ، یەکێ دەردە سەختەکەی نەزانیبایە ، وای ئەزانی بەم گریانە نەخۆشی‌یەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ . کەمێ شلەی قاوەیی‌و پاشان مۆریان کرد بە پشتی‌دا . هەموویان بێ‌دەنگ بوون ، تەنیا زریکەو دایە گیانی ئەم بوو لە ژوورەکەدا ئەتەقی‌یەوەو بێ پەساپۆرت بەرەو هۆڵ‌و ژوورەکانی تر ڕێ‌ی خۆی ئەکردەوە . لەو سەری هۆڵەکەوە ئەدرایەوە . دکتۆر دەرزی‌یەکی درێژی گرت بەدەستەوە . لە هێڵی ناوەندا کردی بە گازەرای پشتیا ، بەبێ دەستەلاڵی وا ئەیقریشکاند ، خەریك‌بوو پەردەی گوێ‌یان بتەقێنێ . کە نێرکی دەرزی‌یەکەی لابرد ، شلەیەکی زۆر روونی وەك ئاونگی سەر گەڵای پێش خۆر هەڵاتن یان ئاوی کانی قەدپاڵ روون‌و پاك ئەتکایە ناو ئەو شوشەیەی بۆیان ڕاگرتبوو . شوشەیەکی تەشیلەیی بچووکی لە باوکی کیژۆڵەکە وەرگرت . سەرێکی شکاندو سرنجێکی لێ‌پڕکردو لکاندی بە دەرزی‌یەکەوەو لەسەر خۆ کردی‌یە پشتی‌یەوە دەرزی‌یەکەی دەرهێنایەوە ، زریکەی کیژۆڵەکە وەك خۆی مایەوە . پاش ئەوەی پشتیان بۆ پێچاو بەرگەکەی لەبەرو باروکەکەی لەسەر کرایەوە ، کەمێ گریانەکەی نیشتەوە پاش دەست شوو شتن لەسەر کورسی‌یەك دانیشت ، هەستی بە لەش سووکی ئەکرد بەدەم زەردەخەنەیەکی تاڵەوە ووتی :-

- مانگێکی تر وەکو ئەمرۆ بیهێننەوە بۆ دەرزی‌یەکی تر

بە قووڵی لەروویان وردئەبوویەوە ، هێندە بێ‌هیوا بوون ، ئەتووت دەم‌وچاویان دەمارومامسولکەی تیانەماوە تا باری‌دەروو نیان دەربڕێ .

یان دەروونیان ژەنگی ژان و ئازاروخەمی گرتووە جێ‌ی هیچی تری تیا نابێتەوە .

# ئاگر ... ئەو خوایەی بووبە پەرستە!!

● نیازی حمە عزیز



«ئادەمیزاد ئاگری دروست نەکردوو و دای‌نەهێناوە . . بەڵکو دۆزیویەتیەوەو بەرەبەرە توانی بۆ پێویستیەکانی ژیانی بەکاری بهێنێ»

ئاگر ، ئەو دیاردە سروشتی‌یەیە کە گەلێك جار لە ژیانی رۆژانەماندا رۆژنەماندا دووبارە دەبێتەوە . دۆزینەوەی ئاگر هۆیەکی کاریگەربوو بۆ گۆڕانی ڕێڕەوی ژیانی مرۆڤ بەرەو باشتر ، بەڕادەیەك هیچ داهێنانو دۆزینەوەی ماددەیەك لە جیهانی پیشەسازی‌دا نەیتوانی ووزەیەکی ئاوا بۆ مرۆڤ بێنێتەکایەوە هەروەکو چۆن سەلماندنی ئەم ووتەیەمان لەو کارە گرنگەی کە ئاگر لە تەکنۆلۆژیای ئەم سەردەمەماندا بەدی‌هێناوە ، دەردەکەوێت .

**سەرەتای ناسینی ئاگر :**

مرۆڤ سەرەتای ئاگری نەدیبوو ، بەڵام لە ئاکامی تەقینەوەی چیا ئاگرپژێنەکانی دەوروبەری‌و کەوتنەوەی ئاگر . یا لە ئەنجامی گڕگرتنی لەخۆیوە ئەو ماددە ئۆرگانی‌یانەی کە سەربەخۆ شی دەبوونەوە . یان کاتێك هەورەتریشقەیەك لە شوێنێکی داباو ئاگرێکی فراوان کەوتبایەوە . لەم کاتانەدا بۆ یەکەمین جار ئاگری بەرچاوکەوت‌و بەڕووداودیتی . ئەم جۆرە ئاگرانەش لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی فراوان بوون ومەودایەکی زۆری لە دارستانو مەزراو شوێنە ئاگرگرتووەکان دەگرتەوەو مرۆڤ نەیدەتوانی بەئاسانی بەسەریدا زاڵ بێت . بەڕواڵەت‌و دیاردەیەکی سەیرو سامناکی دانا ، وەبەلایەوە گرانبوو کە دەستکاری بکات . .

ئەمەش هۆیەکی گەورەبوو بۆ ئەوەی ئاگر بەتوانایەکی مەزنو پیرۆزو خاوەن هێز دابنێ . بەم شێوەیە ئاگر بووبە خواوەندی مرۆڤی کۆنو گەیشتە ڕادەی پەرستن . . جگە لەوەش ئاگر هۆیەکی باش بوو بۆ ڕووناككردنەوە . . ئەمانە وایان کرد کە



نرخ و سودی ئاگر بزانی و هۆگری بێت وزیاتر بیپەرستێت .

## چۆن ئاگریان هەڵکرد

زانایانی شوێنەوار ئەوەیان سەلماندووە کە مرۆڤ لە سەردەمی (بلۆسینی)دا کەدەگەڕێتەوە بۆ ٢٥٠ ٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا ئاگری ناسیووەو توانیوویەتی دەستی بەسەردابگرێ ، ئەمەش دووای دۆزینەوەی پاشماوەی سووتان و خۆڵەمێش و سووتەمەرۆی تەختەو ئێسقان کە لەیەکێك لە ئەشکەوتەکانی نزیك شاری (پەکین)ی پایتەختی وولاتی چین . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤی کۆن ئاگری بۆژیانی رۆژانەی خۆی بەکارهێناوە . بەڵام چۆن توانی دەست بەسەر ئاگردا بگرێ ؟

ئادەمیزادی سەرەتایی تەنها دەیتوانی ئاگر لەو سەرچاوە سروشتی‌یانە وەربگرێ کە لەمەوپێش باسکران . . بۆ نموونە : لقە دارێکی سووتاویان پێستێکی گڕگرتووی بەکاردەهێنا کە لە دارستانێکی سووتاو وەری دەگرت وەئەم ئاگرەی بەکار دەهێنا . . بەڵام ئەمە ئاگرێکی هەمیشەیی و بەئارەزووی خۆی نەدەبوو چونکە تەنیا بە کوژانەوەیەوە پەکی دەکەوت وە دەبوو چاوەڕوانی هەلێکی‌تر بێت تاکو جارێکی تر ئاگرێکی تری سروشتی بکەوێتەوە .

بەرەبەرە ئەمە گۆڕاو ئادەمیزاد لە ڕێگایەکی ترەوە توانی ئاگر وەدەست بهێنێ ئەویش بەکەڵك وەرگرتن لەو پرووشکە ئاگرە بچوکانەی کە لە کاتی دروستکردنی ئامێرێك وەك چەقۆ ، قەمە کەلە بەرد دروستیان دەکرد دەپرژا ! ! وەتەواو تێبینی ئەوەی کرد کە دەتوانێ لەو پرووشکانە ئاگرێك دروست بکات ، بۆ ئەمەش کۆمەڵە گەڵایەکی ووشکی دادەناو بە ئاراستە کردنی پریشکە ئاگرەکان ئەم گەڵایانە ئاگریان دەگرت و بەم شێوەیە توانی ئـاگر لـە کـاتی پێویستدا وەدەست بهێنێ . . .

ئاگر کردنەوەش بەلەیەکدانی دوو بەرد وای لە مرۆڤ کرد کەبە دوای ئەو جۆرە بەردانەدا بگەڕێ کە لەکاتی لێکداندا پریشکی ئاگری زوریان لێ دەبۆوە باشترین بەردیش بۆ ئەمە (بەردەستێ) بوو .

جگەلەوە مرۆڤ کەڵکی لە لەیەکخشاندنی دوو پارچە تەختە وەرگرت بۆ ئاگرکردنەوە . . کە دەبوە هۆی پەیدابوونی گەرمایی‌یەکی زۆرو یەکێك یان هەردوو پارچە تەختەکان کڵپەیان دەستاند .

مرۆڤی کۆن ڕێگایەکی تری بەکارهێنا بۆ ئاگرکردنەوە . . ئەویش تەختەیەکیان دەهێناو کونێکیان تێ‌دەکرد وەدارێك وەکو (وتیرۆکی نانکردن)یان دەهێنا کە پڕبە پڕی کونی دەختەکەبێت . . بەهۆی پەتێکی قایمەوە ئەو دارەیان بەناو کونی تەختەکەدا دەخوولاندەوە بەم چەشنە گەرمایی لە نێوان دارەکەو تەختەکەدا دروست دەبوو کە دەبووە هۆی گڕگرتنی یەکێکیان . بەڵام ئەم بوارانە بۆ ئاگرکردنەوە هەتا ڕادەیەك سەرکەوتوو نەبوون چونکە ، یەکەم : ئەو

تەختەیەی ئاگری دەگرت دەسووتاو دەبوو بەخەلوز ، واتە سەرچاوەیەك نەبوو كە بتوانێ هەمیشە ئاگری لێ‌وەربگیرێ . دووەم : زۆر جار هەبوو تەختەكە ووردو خاش دەبوو وئاگری نەدەگرت بەتایبەتی ئەگەر كەش سارد بووابە .

**« مرۆڤ كەلكی لە ئاگر وەرگرت »**

دوای ئەوەی مرۆڤ دەستی بەسەر ئاگردا گرت‌و توانی هەركاتێ بیەوێت ئاگر دابگیرسێنێ . شێوەی بەكارهێنانی ئاگر پەرەی سەندو بوو بەشتێكی زۆرپێویست . هەروەكو بەكاریان دەهێنا بۆ خۆ گەرم كردنەوە بەتایبەتی لەو شوێنانەی كە ژیان ئاسان نەبوو لێ‌ی لەبەر سەرماوسۆڵ وەساردی‌و كرێوە رێگای راوكردنی لێ‌دەگرتن‌و لەم شوێنانەدا ئاگر باشترین چەك بوو بۆ جەنگ كردن لە گەڵ زەقێنەی دژوار .

جگەلەوەش زۆر گیانداری درندەو سامناك هەبوون مرۆڤ نەیدەتوانی بەرەنگاریان بكات . بەلام ئاگربوو بەتیغێك‌و ئادەمیزاد توانی بەهۆیەوە خۆی لە دەستیان رزگار بكات .

ئەمەو ئاگر گۆرانێكی مەزنی لە بەرنامەی ئامادەكردنی خواردندا هێنایەدی . . لەسەرەتادا بەرێكەوت پارچەیەك گۆشتی خاو كەوتە ناو ئاگردانێكەوە . . لە دوای كەمێك یەكێك لە دانیشتوانی كۆری ئاگردانەكە تامی ئەو پارچە گۆشتەی كرد كە لەناو ئاگرەكە دەری‌هێنابوو بەم شێوەیە هەست بەوەكرا كە ئەگەر بێت‌و گۆشت بخرێتە ناو ئاگرەوە چێژوتامی خۆشترە لەوەی بەخاوی بخورێ . بەم جۆرە بەكارهێنانی ئاگر بۆ چێشت لێنان داهات‌و ئادەمیزاد فێری (سووركردنەوە)و (برژاندن)و(كوڵاندن) بوو .

لەمە گرینگتر ئەوەیە كە مرۆڤ زوو هەستی بەوەكرد كە ئاگر كردنەوە هۆیەكی باشە بۆ رۆشن‌كردنەوە . وەگر كارێكی سەرەكی بوو بۆ رووناككردنەوەی رێبازو ئەشكەوت‌و زنجەكان بەتایبەتی لەشەوەزەنگ‌و تاریكایی سەختدا . هەر بە سوتانیش بوو كە گلۆپ داهات‌و (ئەریسۆن)ی زاناو بلیمەت توانی بنچینەی ژیانی ئادەمیزاد بگۆرێ لە تاریكایی‌یەوە بۆ رووناكایی ئەویش بەداهێنانی هێزی (ئەلەكتریك) .

**« ئاگرو تەكنۆلۆژیا »**

ئاگر بۆ زۆر شت بەكارهێنراوە ، وەبەپێ‌ی گۆرانی شێوەی ژیانی مرۆڤ وپێش‌كەوتنی شارستانیەت بەكارهێنانی گۆردراوە ئەویش بەكەڵك وەرگرتن لێ‌ی لە پیشەسازی‌یەكاندا ئادەمیزادی پێشینان كاتێك ئاگردانیان لە قور دروست‌كرد دوای ماوەیەك سەرنجیان‌دا ئەم قوری ئاگردانە بووەتە ماددەیەكی رەق‌و پتەو . ئەمە وای كرد كە ئادەمیزاد كەڵك لەم رووداوە وەربگرێ‌و بەهۆی سووتاندنی قورەوە پێویستی‌یەكانی ناو ماڵ وەك قاپ‌و قاچاغ ، شەربەو گۆزەو كوپە ، ودروست‌كردنی خشتی سوورەوەكراو وەدەست بهێنێت .

بەم شێوەیە پیشەسازی پێش‌كەوت‌و كل‌-كاری «صناعة الفخار» بووبە هۆیەكی باشی دروست كردنی پێویستی‌یەكانی مرۆڤ .

جگەلەمە مرۆڤی كۆنو سەدەكانی پێشوو لەكاتی ئاگركردنەوەدا تێبینی ئەوەیان كرد كە ئاگروگەرمایی كار دەكاتە سەر ئەو كانە تواوەو لەو بەردە گەرم‌كراوانە جۆگەی دەبەست وەدوای ساردبوونەوە شێوەی شتێكی لێ دروست‌دەبوو مرۆڤ بەژیری خۆی ئەم دیاردەیەی وەرگرت‌و توانی ئەو كانانەی وەك (مس‌و ئاسن‌و زەردو زیوو ئەوانی تر) لەو بەردانە دەربكات بەهۆی گەرم‌كردنێكی زۆرەوە . وەدوای پالاوتنی ئەم كانە لە بەردەكان دیسان دەیتواندەوەو بەدڵی خۆی ئامێرو چەك‌و تیغی لێ‌دروست‌دەكرد . . وەهەر ئەم رووداوەش‌بوو وای كرد شارستانیەتی سەرزەمین پێش‌بكەوەی‌و ئێمەش ئێستا بكەوینە سەردەمی ئەلەكتریك‌و فرۆكەو ئۆتۆمبیل‌و كەشتی‌یە ئاسمانی‌و دەریایی‌یەكان .

گەرمی‌و گزنی خۆر چاوگەی هەموو تینی گەرمایی‌یە لەم گەردوونەدا وەگەرمی‌ی‌ماتی (الحرارة الكامنە)ی ناوجەرگەی زەوی پەیوەندیەكی راستەوخۆی بەبوونی خۆرەوە هەیە . وەبۆ سوود وەرگرتن لە گەرمی خۆرزاناكان هەوڵی زۆریان داوە بۆ پەیداكردنی وزەیێكی تازە لەبری ووزەی نەوت . بۆ ئەمەش هەنگاوی باش‌نراوە تاكو ئێستا «هەروەكو یەكێك لە كۆمپانیا جیهانیەكانی درووست‌كردنی ئۆتۆمبێل ، ئوتومبلێكی بچووكی دروست‌كردووە كە بەووزەی خۆر دەروا د ، دەتوانێ بەماوەی كات ژمێرێك «٣٥» میل ببرێت بەهێزی (٥٥) ئەسپ . .وەوا چاوەروان دەكرێ لە دوارۆژدا ئەم جۆرە ئۆتۆمبیلە رەواجێكی باشی بكەوێتە سەرو لە درووست‌كرنیشدا پێشتر بكەوێ» .

بەم زوانەش مانگێكی دەست‌كرد هەڵدەدرێ كە لەگەرمی خۆرەوە وزەیەكی كارەبایی‌یە (٥٠٠ میگاوات) دەگۆرێ وبەشێوەی شەپۆلی كورت (MICROWAVE) بۆ -ئێستگەیەكی هێزی خۆر لەسەرزەوی دەینێرێ . ئەمەش تواناكەی هاوتای ووزەی پێنج ئێستگەی نیوترۆنی‌یە .

# ڕشانـــــەوەی منداڵان



ئامادەکردن و وەرگێرانی لەئینگلیزیەوە :
أحمد مصطفى أحمد
كلية التمريض
جامعة بغداد

ڕشانەوە یەکێکە لە دیارترین نیشانەی نەخۆشییەکان لەمنداڵاندا لەوانەشە ببێتە یەکەم نیشانەی هەریەکێ لەبلاوترین نەخۆشی یە هەوکردووەکان (الـتهابات) هەروەکو هەوکردنی گەروو Pharyngitisو هەوکردنی گوێی ناوەڕاست وەسی ئاووسان Pnemonia و هەوکردنی کۆئەندامی میز وەیان عادەتەن پەیوەندی هەیە بە تالیٔهاتنەوە Fever .

هەندیٔ جاریش بەڵگەی یەکیٔ لەحاڵەتە نەخۆشییەکانە کە بەشێوەیەکی زنجیرەیی و بەردەوام هاتوون ، زانینی بوونی ڕشانەوە لەمنداڵاندا زۆر گرنگە چونکە بەهۆیەوە دەتوانریٔ دەست نیشانی تێکچوونی کردارەکانی هەزم بکرێت .

لە منداڵە ساواکان و زۆر بچکۆلەکاندا مەترسی یەئی زۆری هەیە بۆ کرداری هەناسەدان چونکە لەو کاتەدا یەکخستنێکی تەواو لەنێوان دەمارو ماسولکەکاندا نی یە ، بۆ بەرهەڵستیی ئەمەش دەبیٔ منداڵ جێگەی باش و گونجاوی بۆ ئامادەبکریٔ ، بەم جۆرە دەبیٔ لەسەر لا تەنیشت یان لەحاڵەتی لەسەر سك درێژبوون دا بێت Prone Position تەمەنی نەخۆشەکەش دیسان زۆر گرنگ و بەکەڵکە ، بۆ نموونە لەسەردەمی تازە بوونیدا Neonatalو مانەوەی کەمێك لەڕشانەوە شتێکی ئاسایی یەو بەتۆزێك لەنیشانەی نەخۆشی دادەنرێت .

هەروەها شێوانە زگماکی یەکان (تشوهات و لادیە) کە بەشێوەیەکی توندو تیژن و دەبنە هۆی گەدەو ڕیخۆڵە گیران بەزۆری لەم تەمەنەی منداڵدا ڕوودەدەن . وە ئەم حاڵەتانە دەبنە هۆی مەترسی یەکی زۆر بۆی ئەگەر زوو چارەیان نەکرێت . وە لەجیاکەرەوەکانی ڕشانەوە کە زانراوبن لەڕشانەوەی بەشێوەی هەڵدان بەتووندی هەردەم پەیوەندی هەیە بەگەدەو ڕیخۆڵە گیران و زیادبوونی پاڵەپەستۆی ناوەوەی مێشك ، ئەو ڕشانەوەیەی کە خواردنی نەگۆڕاو ئاووگی گەدەی تێدا نەبێت ئەوا لەسورێنچکەوە سەرچاوەی گرتووە . ڕشانەوەیەك کە گلوەشیری مەیوی تێدابێت و ڕەنگی قاوەیی یان سەوز نەبێت ئەوا لەگەدەوە هاتووە . ئەو منداڵە تازە بووەی کە ڕشانەوەکەی ڕەنگی سەوزە لەوانەیە تووشی ڕیخۆڵە گیران بووبێت (لەبەشی خوارەوەی بەیەك گەیشتنی بۆری ز رداوو ڕیخوڵەدا) .

ڕشانەوەی خوێناوی لەوانەیە ڕەنگی سوور یان قاوەیی بێت . لەسەرەتایەکی زووی تازە بوونی منداڵدا واباوە کەمێك خوێن قووت دەدات کە لەدایکی یەوە بۆی دەچێت وە دەتوانریٔ بەتاقی کردنەوەی گۆڕانی تفتی جیابکرێتەوە . لەمنداڵانی گەورەتردا ڕشانەوەی خوێناوی بەهۆی رووشانی جیاجیای سورێنچك و برینداریی کاگەدەوە یە (قرحە معدة)

هەروەها ئەو ڕشانەوەیەی کە پیسایی یان بۆنی پیسایی هەیە واتێبینی دەکرێت کە لەئەنجامی گیرانی بەشی خوارەوەی ڕیخۆڵەکانەوە یان هەوکردنی پەردەی پریتۆنیۆمەوە دەبێت . نیشانەکانی زیاتری ئەم حاڵەتەش ئەوەیە کە منداڵ هەست بەگێژبوون ، بوورانەوە . سەرسووران ، دوودڵی ، شپرزەیی ، نوزانەوەو لاوانەوە دەکات

لەگەڵ کەم ئارەزوویی خواردن ، ووشك‌بوونەوەی لەش ، کەم‌بوونەوەی کێش‌و بزرکردنی ماددەو شلەی زۆر . لەرشانەوەی دەوریدا کە بەزۆری کە لە نەخۆشخانەکاندا روودەدات و پەیوەندی هەیە بەتەمەن و چۆنیەتی پێك‌هاتنی لەش‌و بەرگریی نەخۆشییەکان ، بەگران رۆیشتن بەریدا ، سەرئێشان ، ژانەسك ، زووتوورە بوون ، باوێشك‌لێ‌هاتن و خەواڵوویی و خەولێکەوتن جیادەکرێتەوە ، وەهەر شتێکی بدرێتێ لەرێگەی دەمەوە زوو دەیهێنێتەوەو یەکسەر ووشك هەڵاتوویی (جفاف) لێ‌دیاری دەدات و تەنەکێتۆنەکان لەمیزدا سەرنج دەدرێن و لەهەناسەشدا بۆنیان هەیە وە پلەی گەرمای لەشی نەخۆشەکە بەرزدەبێتەوە بەرادەی ١ – ٢ پلە سەربەرەوژوور تر لە پلەی ئاسایی . ئەم جۆرەی رشانەوە بۆ ماوەی (٣ – ٤) رۆژ بەردەوام دەبێت ، خول شێوە ساڵی دووسێ جار دەگەرێتەوە .

**هۆیەکانی تووش‌بوونی رشانەوە :-**

ئەو حاڵەتانەی کە دەبنە هۆی رشانەوە لەهەموو تەمەنەکاندا بریتین لەو هۆیانەی کە پەیوەندیان بەخواردن هەیە لەگەڵ تەمەن ، ئارەزووی منداڵ ،جۆری خواردن ، باری تەندروستی منداڵ و نەزانینی رێگەی خواردن پێدان ، لەم کاتەدا کەدەرشێتەوە هەمان ئەو خواردنانە دێنێتەوە کە لەپێشدا خواردوونی و گلۆەشیری مەیوی تێدا دەبێت لەسەردەمی ساوایەتیدا .

وە لەهۆیەکانی کە پەیوەندیان بەچەند حاڵەتێکی نەخۆشی هەیە وەکو : هەوکردنی گەدە کە لەرشانەوەکەیدا خواردن ، لینجاوو خوێنی تێدایەو بەژانە . هەوکردنی ریخۆڵە کوێرە لەسەرەتادا خواردن و پاشان زەرداو Bile یش دێنێتەوەو ژانەسکی لەگەڵدایە .

هەروەها ئەو نەخۆشییانەی کە لەژاراوی‌بوونەوە پەیدابوون خواردن و ئاروگی گەدەو ووشك‌بوونەوەی خێرای لێ‌دیاری دەدات :

**کۆخەرەشە** : لەم بارەدا رشانەوە کەخواردن و لینجهوی تێدایە لەکاتی خواردندا یان یەکسەر دوای خواردن ، یان دوای کۆخە روودەدات .

**نەخۆشی شەکرە** : لەرشانەوەکەیدا خواردنی تێدایەو نەخۆش هەست بە بوورانەوە Coma دەکات .

نەخۆشی‌یەکانی گورچیلە : لەم کاتەشدا ئاووگی ناو گەدەی تێدایەو بەزۆری لەدوا قۆناخی نەخۆشی‌دا . روودەدات .

**ژاراوی‌بوون (تسمم)** : ئاووگی گەدەی تێدایەو ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگە دەبێ نەخۆش لەژێر چاودێری‌یەکی زۆر باشدە زوو چارەبکرێت .

بەرگەنەگرتنی دەرمانەکانی وەکو سالیسلەیت و لەناویدا : ئاووگی ناو گەدەی تێدایەو باشتر وایە لەبەکارهێنانی دەرمانەکە دووركەوێتەوە .

حاڵەتی دەمارگیری (حالات عصبية) : لەم کاتەدا رشانەوەکە لەشێوەی ئاودایەو هەندێ نیشانەکانیشی بریتین لە (چوزانەوە -اهاجه)و شپرزەیی‌و دوودڵی (قلق) .

هۆیە میکانیکیەکان : ئاووگی ناو گەدە لەرشانەوەدا بەدی دەکرێت و لە ئەنجامی پەنجەمژین ، ئاڵووکەوتن ، هەوکردنی گەروو هەوا قووت‌دان پەیدادەبێت .

زیادبوونی پاڵەپەستۆی ناوەوەی مێشك : ئەم هۆیە هیچ پەیوەندی نیە بەخۆراکەوە لەناویدا ئاووگی گەدە هەیەو بەتووندی هەڵدانی بۆ دەرەوەو پەیوەندی هەیە بە هەوکرینی پەردەی داپۆشەری مێشکەوە (التهاب السحايا) کە دەبێتە هۆی گیران (امساك) ، بوورانەوەش روونادات .

هەروەها لەو هۆیانەی کە لەتەمەنی جیاجیای منداڵدا دەبن بەرووداونی ئەم حاڵەتە :

خۆراك پێدانی کەم : ئەمەش لە منداڵاندا لەرۆژی لەدایك‌بوونەوە تاکو تەمەنی سێ مانگی روودەدات ورشانەوەکەی ئەو ماددەیەی تێدایە کە لەپێشتر پێی دراوە ، نیشانەکالیشی برسیەتی ،گریان ، هەوا قووت‌دان و قاچ راوەشاندنە .

شێوانە زگماکەکان وەکو بوونی یەکێ لە جۆرەکانی قوری ، کە لەسەرد می ساوایەتیدا دەبێتە هۆی رشانەوەو لەناویدا شیرو لینجاو بەتوندی هەڵدان و بێ‌ئارامی لەسەر منداڵ سەرنج‌دەدرێ.

**تەسکی‌ی دەرچەی دواوەی گەدە Pyloric Stenosis : لەو منداڵانەدا دەبێتە هۆی رشانەوە کە تەمەنیان لەنێوان ٢ هەفتە تا چوار هەیڤە ، لەناویدا گلۆەشیر ، لینجاوو خوێن هەن وە بەتووندی هەڵی‌دەداتە دەرەوە .**

**لەسەرەتای تا لێ‌هاتندا** : ئەمەش لەمنداڵی گەورە تردا روودەدات و هیچ جیاکەرەوەیەکی تایبەتی نیەو پلەی گەرمای لەشی نەخۆش بەرزدەبێتەوە .

**رشانەوەی دەوری** : لەو منداڵانەدا دەبێت کە تەمەنیان لەدوو

ـــنّ بەرەوژوورترە ، خواردن . ئاووگەگەدە بەتەنها لەو شتانەن کە
ـە شانەوەکەدان .

**خاووبوونەوەی ماسولکەکانی سورێنچك** : لەحەرد می
ـوایەتیدا دەبێتە هۆی ئەم دەردە . خۆراك ، لینجاو هەندێ
حەریش خوێن دیاردەبێت . وە لەهۆیەکانی زیاتری ڕشانەوە بریتین
ـەکاوێژکردن ، زیادی بڕی گلوتین ، نارێکیی بۆری خوێنەکان ،
سورێنچك گیران ، بوونی تەنۆچکەی بیانی لەسورێنچکدا ،
خراپیی ریخۆڵەکان ، نەمانی پەنکریاس ، خراپ پێك‌هاتنی
ڕێکەودەرچەی کۆم ، ئاوسانی جگەرو پەنکریاس ، برینداربوونی
کەللەسەر ، سەرەتانی مێشك ،تێك‌چوون بەهۆی جووڵەکردن
(وەکو تێك‌چوونی ناو ئوتومبیل) ، هەوکردنی بەشی سەرەو
خوارەوەی کۆئەندامی هەناسەدان ، بەکارهێنانی هەندێ جۆری
دەرمان (وەکو ئەسپرین ، دیجیتال‌و دژەزیندەکان و هۆیە
نەفسی‌یەکان و زۆری تر . .

## چۆنیەتی چاردێری کردن و چارەکردنی منداڵ :

بۆ چارەکردنی هەر دەردێك کە منداڵ پی‌یەوە دەناڵێنێ دەبێ
لەپێشەوە هۆیە تووشکەرەکەی بزانری‌و بەگوێرەی توانا بەرهەڵستی
لی‌بکری‌و ڕێگەی چارەی گونجاوی بۆدابین بکرێت .

ڕشانەوەش لەبەرئەوەی هۆیەکانی زانراوون کەواتە ئەو کەسەی
کە چاودێری منداڵە نەخۆشەکە دەکات لەماڵەوە یان لەنەخۆشخانە
دەتوانێ ووردەووردە بەرەو چاك‌بوونەوەی بەرێت . گرنگیدان
بەپاك‌وخاوێنی لەش‌و جل‌و بەرگ‌و شوێن‌و ڕێك‌خستنی
خواردن‌پێدان لەبارەی کات ، جۆری خۆراك ، تەمەنی منداڵ ،
ئارەزووکردنی ڕێگەپێدانی ، چۆنیەتی باری منداڵ و شارەزایی
ولێهاتوویی ئەو کەسەی خواردنەکە دەدات و گونجانی خۆراکەکە
لەگەڵ باری تەندروستیی منداڵ . . چۆنیەتی لەباوەش‌کردنی منداڵ
ئەگەر ساوابوو کاتی خواردن پێدانی وە ئەگەر لەناوبێشکەدا بوو دەبێ
سەری بەرزبکرێتەوەو ، کاتی ڕشانەوەی دەبێ بخرێتە سەرلا
تەنیشت وەیان دەست بەناوچەوانییەوە بگیرێت و دوایی دەبێ دەمی
پاك‌بکرێتەوە ، بەهێواشی خواردنی پی‌بدری‌و دەبێ لە کاتی
خواردندا پشووبدات ،ئەگەر شیری بەمەمکەشوشە پێدرا دەبێ
لەبڵێ هەوا بەتاڵ بکرێت و پاك ڕابگیرێ؟ نەهێشتنی
لەقووت‌دانەوەی مادەکانی ڕشانەوە دیسان ڕێگەیەکی باشە بۆ
ڕزگارکردنی منداڵ لەخنکان و لی‌پیس کردنی دەردەکەی .لەگەڵ
سەرنج‌دانی کاتی ڕشانەرەو برو ڕەنگ‌و بۆن و ژمارەی جارەکان و
پەیوەندی بە خواردن و ئەو مادانەی کە تێیدایەو هێڵنجدان
nauseaوجۆرەکەی .

سەرەرای تێبینی‌کردنی باری تەندروستی و نەفسی منداڵ :
هەروەها ددان پاك‌کردنەوەو دەم‌وچاو شۆرین و خۆدانە بەرخۆر ،
هەوای پاك‌هەڵمژین ، گرنگی‌دان بەپێست و جل گۆرین
تۆمەرکردنی تێبینیی پێویست لەسەر نەخۆشەکەو پێدانی شلەو ئاووگی
میوەو گلۆکۆزو هەندێ خواردنی حووکی کەم ڕۆنو نانی گەرم و
هەنگوین و هێلکە و چای شیرین بەلاّم ئەگەر زیاتر بەردەوام بوو
ڕشانەوەکەی دەبێ شلەی گونجاوی لەرێگەی دەماری
خوێن‌هێنەرەوە بدرێتێ . دڵنەوایی‌کردن ر ماندوو نەکردنی و
سەرنج‌دانی چۆنیەتی ڕشانەوە (بەشێوەی هەڵپدان یان بەزەحمەت)
لە ئاگادارییەکانی ترن بۆ نەخۆش .

چارەکردنی هەموو ئەو دەردانەی کە منداڵ تووشی‌هاتووە یان
بەرگری‌کردن لەرووودانیان وەکو کوتان (تلقیح)دژی کۆخەرەشە ،
تالی‌هاتن ،ئینفلۆنزا ،سیل‌و شێوانە زگاکیەکان ، بردنی منداڵ بۆ
نەخۆشخانە لەکاتە کوت‌وپڕەکاندا وەکو ژاراوی‌بوون ،
ریخۆڵەکوێرە .هەروەها بۆ چارەکردنی نەخۆشییە هەوکردووەکان و
ڕشانەوەی دەوری و ئاووسانی جگەرو پەنکریاس و وەستان
لەبەکارهێنانی هەندێ لە دەرمانە ناپێویستەکان . هەروەها
بەرگری‌کردن لە ووشك‌بوونەوەو ئامادەکردنی منداڵ بۆ یاری‌کردنی
بۆ دوورکەوتنەوە لەپەنجەمژین و خووی خراپ . وە پێویستە لەسەر
(پەرستاری – Nurse) منداڵان کەدایك فێربکات چۆن گرنگی
بەمنداڵ بدات لەهەموو بارێکەوە کەپێویستی‌یەتی ، بۆ یوور
کەوتنەوە لەهەر گیروگرفتێك و چارەکردنی ئەگەر تووشی منداڵەکەی
هات . .


ئەم سەرچاوانەی کە بەکهرهاتوون :

1 – Paediatric Nursing
by – Margaret Duncombe Barbara F. Weller 5th edition
1980

2 – Pediatrics
Edited by
– Mohsen ziai, M.D with
– Charles A.Janeway , M.D
– Robert E. Cooke , M.d Second edition 1975.

# جیۆگرافیای شێرپەنجە.. تووشبووەکێن .. چۆن و لە کوێ ؟

مەحەمەد بەدری
کردوویەتی بە کوردی

شێرپەنجە بەبەردەوامی ئەمێنێتەوە . . نێچیرەکانیشی بە هەزارانن و زانیاری پزیشکایەتیش بۆ لەناوبردنی لە هەوڵدانایە و هەتا ئیستا کە پەی‌ی‌نەکراوە بەسەریدا زاڵ بێت و لەناوی بیات . . لیکۆڵینەوە و کۆنگرەکانی ئەم دوایی‌یە کە بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشی‌یە تەرخان کرابوون هەندێ لایەنی بنەرەتی‌یان روون کردەوە لەوانە : ئەو دەورەی کە زگماك لە شێرپەنجەدا ئەیبینێ وجیوگرافیە سروشتی و مرۆڤایەتی‌یەکەی . .
شێرپەنجەی ئافرەت . . شێرپەنجەی دەم و قورگ . . دوا هۆیەکانی چارەسەکردنی و چۆنیەتی پەرەپێدانیان . .



لە شێرپەنجەدا وەك لە نەخۆشی یەکانی تردا تووشبووەکان وەك یەك نین ، هەیە بە زۆری تووشی ئەو خەتەرە ئەبێ بەتایبەتی ئەوانەی گیرۆدەی نەخۆشی یە زگماکی یەکان برون ( نەخۆشی زگماکی ئەو نەخۆشی یەیە کە بەهۆی گواستنەوەی دوو ( جینە ) پەیدا ئەبێ ، دوو (جینە)ی نەساغ کە یەکێکیان لە دایك و ئەوەی تریان لە باوکەوە ئەبێ) . .

ئەوەی باشە کە ئەم جۆرە نەخۆشی یانە بەدەگمەن روودەدەن بەلاّم هەندێ نەخۆشی زگماکی تر کە ئێستا کە بە شێوەیەکی دیار وەدەرنەکەوتوون ئەوانەن کە مەترسی تووش بوون بە شێرپەنجە زیاتر پەیدا ئەکەن . . بە پێ ی ئەو لێکۆڵینەوەی کە گۆڤاری (نیو ئینگلەند جیورنال ئوف میدیسینی) بلاّوی کردبووە و ە ئەوەی تیادا سەلماندووە کە یەکێك لەو لارێکی یانە کە بەهۆی زگماکی یەوە پەیدا ئەبن لە سەدا هەشتا و حەوت لە پێش تەمەنی شەست ساڵیدا مەترسی تووشبوون بەو نەخۆشی یە زیاد ئەکەن ، ئەمە لە کاتێکدا کە لەلای خەڵقی کە ناگاتە لە سەدا یەك . . هەروەها لێکۆڵینەوەکانی تر ئەوەیان دەرخستەوە کە هەندێ نارێکی لەو کرۆمۆزۆماتانەی کە (ژمارەیان بیست و سێ جووتە) نەبێ بەهۆی تووشبوونی مرۆڤ بە نەخۆشی شێرپەنجەوە . . نارێکی زگماکی لە کرۆموزۆمدا ڕەنووس پانزە لە گەڵ شێرپەنجەی گورچیلە لە لای منالّدا رێنەکەوێ و نارێکی کرۆمۆزۆمی ڕەنووس سیانزە ئەبێتە هۆی پەیدا بوونی شێرپەنجە لە تۆری چاودا . .

پێوەندی نێوان (جینات) و شێرپەنجە ئەتوانرێ بە دو رێگە لێکی بەینەوە : یان دەبێ شێوانێکی زگماك هەبێ ، یاخود شێوانێکی لە ناکاو روودەدات بە کارتێ کردنی ئەو مادانەی کە دەبنە هۆی پەیدا کردنی شێرپەنجە . . .

لە هەردو حالێەتدە نارێکی یەك لە ئیش و کاری شانەکاندا دروست ئەکات ، چونکە شانەیەکی بنەرەتی لە یەکێك لە چینەکانی پێشدا گەر هات و تووشی شێوانێك بوو دوور نی یە شێرپەنجەی پێشت دروست بکات ئەوەش بەرێگەی زۆربوونەوە لەسەر حیسابی خانە ساغەکان . . لەم حەڵەتەشدا ئەو شانەیە ژمارەیەکی زۆری جیناتی تێدا ئەبێ ( جیناتیش جیاوازیەکی زۆریان لەگەڵ کرۆمۆزۆماتا هەیە) ئەشێ ئەو شانەیە ژمارەیەکی کەمی لەو جیناتەی تێدا بێ و لەم حاڵەتەدا ئەگەر هاتو بەرەنگاری تووشبوو نێك بوو ، نائوانێت فریای خۆی بکەوێت ، ئەمەش رێگە بۆ تووشبوون بە شێرپەنجە خۆش ئەکات کەواتە هەندێ هۆی زگماکی هەیە کە لە تووشبوونی ئەم ن خۆشی یە دەوری خۆیان ئەبینن ، بۆیەش خەڵقی بە گشتی تووشی نەخۆشی شێرپەنجە نابن . .

یۆگرافیای شێرپەنجە . .

ئەو خاڵە یووەمەی کە لێکوڵینەوە تازەکان روویان کردووەتەوە پێوەندی بە دەستنیشان کردنی ئەو هەرێمانە هەیە کە تووشی شێرپەنجە ئەبن . . ئەوەی سەیریشە کە ئەم سنوور دانانە زۆر وردە ، سەیرتریش ئەوەیە کە هەندێ شوێنو هەرێمی تایبەتی لە جیهاندا هەیە کە بەزۆری تووشی شێوەیەکی تایبەت لە شێرپەنجەدا ئەبێ . . لەو کۆنگرەیەی کە لە شاری (بیزنون)ی عەرەنسا گیرا لیکۆڵینەوەکان ئەمەیان خستەروو . .

١ – ئەو شێرپەنجەیە کە پێ ی ئەوترێ ( ئیجیوسا رگومدو کابووس ) ئەو شێرپەنەیەیە کە تووشی پێست ئەبێ لەچوارلا کانەوە – واتە دەستو پێ کانەوە سەرهەڵ ئەدات . پاشان بلاّو ئەبێتەوە و تووشی ئەندامە ناوخۆیەکان ئەبێت ، ئەم جۆرە شێرپەنجەیە بە دەگمەن بەدی ئەکرێ لە هەرێمی مەغریب و لە رۆژهەلاّتی ئەفریقا وەك ئۆغەندا کە لە سەدا شانزەی تووشبووەکان پێك دێنێ .

٠ – شێرپەنجەی جەرگ ، ئەم جۆرە شێرپەنجەیە لە ولهێتە رۆژ

ئاوایی‌یەکاندا بە دەگمەن بەدی ەەکرێ بەڵام لە ئەفریقیایی باشوور و ناوەندی زۆر بڵاوە و لە سەدا چل تووشی نێرینەکان ئەبێ و لە وڵاتی مۆزەنبیقدا ئەگاتە سەدا شەست و پێنج و ئەمەش لە رۆژئاوا خوارووەکەی بەلگاریایا زۆر بڵاوە .

٣ – شێر پەنجەی قورگ ، ئەتوانین بڵێین ئەمە شتێکی جیهانی‌یە بەڵام زۆربەی ئەوانەی تووشی ئەم جۆرە نەخۆشی‌یە ئەبن لە ئەفریقیای خوارووی ئیران و کەناری دەریای قەزوێن لە سەدا پەنجای تووشبووەکان پێك دێنێ .

٤ – لە وڵاتی بەلجیکادا شێرپەنجەی سی تووشی زۆربەی دانیشتوانی پێنج شارە سەرەکی‌یەکانی ئەو وڵاتە ئەبێ .

لە (غلاسغۆ)و لە هەرێمی ( ئیکۆس )ی بەریتانی دا رادەی ئەوانەی کە لە نێرەکاندا ئەمرن بە هۆی شێرپەنجەی هەناسەدانەوەوە ئەگاتە هەشت و سێ لە سەد دا و هەروەها لە شاری (هاتلبول)یش کە بە پیشە سازی بە ناوبانگە . .

تووشبون بە شێرپەنجە پێوەندی‌یەکی زۆری بەرەگەزەوە هەیە ، ئوسترالیە سپی پێستەکان لەکەسانی تر زیاتر تووشی شێرپەنجەی پێست ئەبن ، دانیشتوانی خوارووی چین و سەرووی ئەعریقیا بە زۆری تووشی شێرپەنجەی لووت و قورگ ئەبن . . یونانی‌یەکان و ئیرلەندی‌یەکان بەرێژەیەکی زۆر بەرز تررشی شێرپەنجەی گەدە ئەبن . . ئەمە لە کاتێکدا کە ئیرلەندی‌یەکان بە هیچ شێوەیەك تووشی شێرپەنجەی (قۆلۆن) نابن ، ژنە ژاپۆنی‌یەکان و میسری‌یەکانیش تووشی شێرپەنجەی مەمك نابن و ئورۆپیەکانیش بە گشتی بە هیچ شێوەیەك تووشی شێرپەنجەی جەرگ نابن . .

لێرەدا هەندێ جیاوازی هەیە ، ئەو جیاوازی‌یە پێوەندی بە رەگەز و رادەی کۆمەڵایەتی و ئابووری‌یەوە هەیە . . لە ئیران بۆ نموونە : لە سەدا یانزەی شێرپەنجەی مەمك لە ناو هەژارەکاندا ئەبینرێ و لە سەدا بیست و حەوت لە ناو کۆمەڵە دەوڵەمەندەکاندا ، ئەمە لە کاتێکدا کە لە سەدا حەڤدەی شێرپەنجەی پێست لەناو ئیرانی‌یە دەوڵەمەندەکاندا ئەبینرێ و لە سەدا سی و دوو لە ناوچەی هەژارەکاندا . . شێرپەنجەی واش هەیە کە ئەتوانین بە شێرپەنجەی پیشە ناوی ببەین .

ئەم جۆرە نەخۆشی‌یە تووشی ئەوانە ئەبێ کە لە هەندێ پیشەی تایبەتی دا کار ئەکەن وەك شێرپەنجەی خوێن کە تووشی ئەو کەسانە ئەبێ کە لە پیشەی وێنەگرتن بە هۆی تیشکەوە ئیش ئەکەن ، یەخود شێرپەنجەی قورگ کە تووخی دارتاشەکان ئەبێ . . جگە لەمانەش



ھەندێ شێوەی‌تری شێر پەنجە ھەیە کە بە چۆنیەتی ژیانەوە بەستراوە وەك ئەوەی کە لە ولأتی فەرەنسە روو ئەدات و ژمارەی توشبووەکان بە ھۆی بەردەوامی لە سەر مەی خواردنەوە و جگەرە کێشاندا تووشی شێرپەنجەی گەدە وسروشك ئەبن .

ئافرەت و شێرپەنجە :

لێکۆڵینەوەیەکی سەرژمێری کە لە ئەمریکا لەم دوایی‌یەدا بلأوبووەتەوە ئەوەی دەرخست کە ژمارەی ئەوا نەی تووشی شێرپەنجەی مەمك بوون لەم بیست ساڵەی دوایی‌دا دووقات بووەتەوە . ئەم لیکۆڵینەو یە پەنجەی بۆ ئەوەش راکێشا کە سەرەرای ئەوەی کە رێژەی چاك بوونەوەی تەواو لە ھەندێ ئاو سانەوەی شێرپەنجەیی لە لای ئافرەتاندا گەیشتووەتە سەدا سەد ، ئەمە ئەگەر ھات و زوو بە زوو دەست نیشان بکرێت ، بەلأم لە ھەمان کاتیشدا ژمارەی کریوو کانیش بە ھۆی ئەم جۆرە شێرپەنجانەوە زۆر لە بەرزی دایە ، بۆیە ئامۆزگای نیشتمانی ئەمریکایی بۆ شێرپەنجە لە شاری واشونتۆندا ئەڵقەیەکی تایبەتی رێکخست بە مەبەستی دەست‌نیشانکردنی ئەو ھۆیە سەرەکی‌یانەی کە رێگە بۆ تووشبوون بە یەکێك لە سێ جۆرە زۆر بەناوبانگەکەی شێر پەنجە لە نێوان ئافرەتاندا خوش ئەکەن و ئەمانەش بریتین لە مانەی خوارەوە : شێرپەنجەی منالدان ، شێر پەنجەی سەری منالدان ، شێرپەنجەی پەردەی ناوەوەی منالدان ، شێرپەنجەی مەمك ، لە پاش کۆتایی ئەم ئەڵقەیە پرۆفیسۆر مۆفیە چهرفس کە سەرۆکی بەشی لۆیەکانی زاوزێ‌کردنە لە خەستەخانەی فیکری فەرەنساوی و لەم ئەڵقەیەدا بەشداری کردبوو ووتی : ئەو ئەنجامە سەرەکی‌یە کە لێکۆڵەرەکان پی‌ی گەیشتن ئەوەیە کە پێویستە گرنگی‌یەکی زۆر بە دەست نیشانکردنی زوو بە زوو بدرێ ،جگە لەوەش ئەبێ ئەو ھەوڵ و تەقەلایە بۆ ئەوە بێت کە لە کارتێکردنی ھەندێ ھۆ وەك تووتن ر تیشك و ھەندێ ( فایرۆس ) و مەی و ماددەی ( ئەمبانت)و (فایرۆس)ی ئاوسانی جەرگ بکوڵرێتەوە چونکە و ك روون و ئاشکرا بوەتەوە ئەمانە رێگە بۆ تووش بوون بە شێرپەنجە خۆش ئەکەن سەرەرای ئەودەورەی کەھۆرمۆنەکان دەیبینن .

لە راستی‌دا لەوێ سێ ئەندام زاوزێ‌کردن ھەیە کە ھەر یەکێکیان ئامھدەیە بۆ تووشبوون بە شێرپەنجە و بریتین لە مانە : سەری منالدان و پەرد ی منالدان و لۆوەکانی مەمك . . لیکۆڵینەوەکانیش بە شێوەیەکی گومان لێ‌نەکراو ئەوە یان دەرخست کە ئەو ھۆیانەی شێرپەنجەی گەردەنی منالدان دروست ئەکەن جیاوازی‌یەکی زۆریان لە گەڵ ئەو ھۆیانە ھەیە کە ئەبن بە ھۆی پەیدا کردنی شێرپەنجەی پەردەی منالدان و مەمك ، ئەمەش بۆ ئەوە ئەگەرێتەوە کە ئەو شێرپەنجەیەی لە گەردەنی منالدانا پەیدا ئەبێ ھیچ جۆرە پێوەندی‌یەکی بە کارکردنی ھۆرمۆنەیکانی زاوزێ کردنەوە نی‌یە ، ئەمە لە کاتێکدا ك شێرپەنجەی پەردەی منالدان و مەمك پێوەندیەکی زۆری بەم ھۆرمۆنانەوە ھەیە . ھەروەھا سێ لایەنی بتەرەتیش ھەیە ئەو ھۆیانە روون ئەکەنەوە کە مەترسی تووشبوون بە شێرپەنجەی گەردەنی منالدان پەیدا ئەکەن و ئەو ھۆیانەش دیاری ئەکەن کە دەبنە مایەی بەرزبونەوەی رێژەی تووشبونی خەڵکی بەو نەخۆشی‌یە .

١ – ئەو ژنانەی کە زیاتر تووشی ئەم جۆرە شێرپەنجەیە ئەبن ئەوانەن کە لە کاتێکی زۆر زوودا ژیانی رەسەنایەتی‌یان دەستی پێ‌کردووە و ئەندام زاوزێ‌کردنیان بۆ چەند جارێك تووشی نەخۆشی بووە و بە شێوەیەکی چاك چارە نەکراوە .

ئەوەی رەچاویش کراوە کە ئەم ئافرەتانە بە زۆری سەر بەو چینە کۆمەلأیەتی‌یانەن کە دەست کورتن .

٢ – شێرپەنجەی گەردەنی منالدان بە شێوەي کی زۆر خاو پەرە ئەسێنێ و لە ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ درور نی‌یە بگات بیست ساڵ پێش ئەوەی بە رادەی خەستەخانە بگات ، لە ناوەراستی ئەم ماوەیەدا ئەم شێرپەنجەیە لە سنوورێکی زۆر کەم‌دا ئەبێ ، واتە وای تیادا پەیدا بووە ، لێرەدا ئەتوانرێ – گەر ھات و دۆزرایەوە – ئەو شانەیە لە گەردەنی منالدان دوور بخرێتەوە .

٣ – خۆ پاراستن لە شێرپەنجەی گەردەنی منالدان و ھات وچوو کردنی خەستەخانە بە شێوەیەکی بەردەوامی دوو شتی پێکەوە بەستراون . . بۆیە بۆ ئەوەی ئەم نەخۆشی‌یە چارەسەر بکرێ پێویستە ئەو دەرھاویشتنەی کە لە گەردەنی منالدانا وەدەردێت چاوی لێ بخشێنرێ و بە شێوەیەکی ورد و قووڵ تەماشا بکرێ دوور نی‌یە چاك بوونەوەیەکی لە سەدا سەت وەدەست بهێنین ، ئەمە لە کاتێکدا کە شێرپەنجەکە سنوور دار بێ . . . بەلأم سەبارەت بە شێرپەنجەی پەردەی منالدان ئەوەی ئاشکرایە کە بەرپرسیاری‌یەکە بەرەو رووی ھۆرمۆنی ئەلستڕۆجین ئەبێ . .

ئەوەش لە ولأتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا وەدەر کەوت و بە تایبەتی لە لای ئەو ئافرەتانە کە تووشی رادەی نائومێدی بوون ، ئەوانەی کە بە ناچاری بە ھۆی ئەستڕۆجینەوە چارەسەر ئەکرێن . . ئەو ئەستروجینەی کە ھیلك دان دروستی ئەکات و ئەبێتە ھۆی زۆرکردنی شانە لە منالداندا ، بەلأم ئەم شانانە بە ھوی ھۆرمۆنێکی دژ بە (ئەستروجین) لە کاتە سروشتی‌یەکەی – خوێن‌دیتن – العادة

الشهرية)دا ئەفەوتێت ، ئەو هۆرمۆنە (بروجستوجین)ی پێ ئەوترێ ئافرەت کە (ئەستروجین)وەدەر ئەخا بێ ئەوەی بە هۆی (بروجستروجین) دوایی پێ بهێنێ ئەمە دەبێتە هۆی پەیدابوونی ئاوسانێکی شێرپەنجەیی . . ئەوەش بینراوە کە مەترسی تووشبوون بەم نەخۆشی‌یە لە پێنج ساڵ یاخود دە ساڵی پێش گەیشتنی ئافرەت بە ساڵی نائومێدی زۆر زیاتر ئەبێ ، چونکە لەم قۆناغەدا هۆرمۆنەکان تووشی شێواوی و نارێکی و بێ‌هێمنی ئەبن ، هەر بۆیەش بە یەکێك لە قوناغەکانی مەترسی دا ئەنرێن . .

ئەو ماوەیەی کە شێرپەنجەی پەردەی منالْدان پێویستی‌یەتی بۆ پەرەسەندن زۆر لەو ماوەیە کەمترە کە شێرپەنجەی گەردەنی منالْدان پێویستی‌ی پی‌ی هەیە و ماوەکەش لە نیوان پێنج تا دە ساڵ دایە . .

بە پێچەوانەی شێرپەنجەی گەردەنی منالْدانەوە شێرپەنجەی پەردەی منالْدان زۆر لەوە گرانترە کە بە هۆی ئیفرازاتەوە بدۆزرێتەوە ، بەلاّم ب رامبەر بە مە خۆ دوورخستنەرە لەم نەخۆشی‌یە زۆر ئاسانە ، ئەوەش بە رێگەگرتن لە کەمبوونی ئیفرازی برۆجسترجینەوە ئەبێ ، ئەوەش تێبینی کراوە کە هەندێ دەرمانی دژ بە هەڵچوون و ئاوسان بەتایبەتی ئەوەی لەگەڵ ئەو دوو هۆرمۆنەدا رێئەکەوێ یاریدەدەرێکی باشە بۆ خۆ پاراستن لەم دەردە . .

ئەوەی پێوەندی بەم شێرپەنجەی مەمکەوەش هەیە ئەوەی سەلماند کە ئەسترۆجین رۆڵێکی هەرە بنەرەت لە تووشبووندا ئەبینێ ، بەلاّم بە رادەیەکی کەمتر لە شێرپەنجەی پەردەی منالْداندا ، ئەم بیرورایەش لەدوو هۆوە هاتووە یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو قۆناغە شاراوەیەی کە ئەکەوێتە نێوان یەکەم تووشبوون بە هۆیە شێرپەنجەیی‌یەکە و دەرکەوتنی بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا درێژترین ماوەیە سەبارەت بە و جۆرە شێرپەنجانەی کە تووشی جی‌یەکانی زاوزێ کردن ئەبن چونکە بیست یاخود بیست و پێنج ساڵ ئەخایێن . . هوی دووەمیش لە بەشداری کردانی رەگەزە زگماکی‌یەکەیە کە بە رێگەی نارێکی و شێواوی کرۆمۆذۆمەکانەوە دێت ، ئەمەش لە ناو ئەو ئافرەتانەدا دەرئەکەوێ کە دایکەکانیان یاخود نەنکەکانیان تووشی شێرپەنجەی مەمك بوونە . .

سەرەرای ئەمەش ئەتوانین بڵێین کە هۆرمۆنێکی سی‌یەمیش لە مەمکدا هەیە (برۆکتین)ی پێ ئەوترێ و لەگەڵ ئەستروجین و برۆجسترۆجین دا رۆڵێکی بنەرەتی لە مەسەلەی شیرداندا ئەبینێ و وەك روون بووەتەوە ئەبێتە هۆی تووشبونی مشلك بەلاّم لای ئافرەتاندا ئاوا نی‌یە بە مەرجێك گونجانێکی ئەوتۆ لە نێوان ئەم و ئەو برۆجسترۆجینەی کە هێلکەدان وەدەری ئەخاتەوە هەبێ . .

هەروەها سلك‌پڕ بوون بۆ یەکەم جار گەر هات و لە کاتێکی زۆر زووا سەبارەت بە رادەی پێگەیشتنی ئافرەتەکەوە بوو دوور نی‌یە ببێتە هۆی دوور خستنی ئەو ئافرەتە لە شێرپەنجەی مەمك چونکە ئەبێتە هۆی یارمەتی دانی لووەکانی مەمك بۆ رێکخستنی ئیش و کارەکانی .

جگە لەو هۆیانەی کە لە پێشەوە باسمان کردن هەندێ هۆی‌کە هەن پێوەندی‌یەکی زۆریان بە دەور و بەرەوە هەیە چونکە دوور نی‌یە ببێتە هۆی لە کارخستنی هەندێ لە ئیش و کارەکانی هیلکەدان هۆرمۆنەکان و ئەم مەسەلەیە لە شارە پیشە سازی‌ی رۆژ ئاوایەکان و دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا هەستی پێ کراوە چونکە ئەوەی بینراوە کە ئاژاوەی دەروونی ئەبێتە هۆی شڵەژانی هۆرمۆن لە مەمکدا .

لەو کۆنگرە دوایی‌یەی کە ئامۆژگای نیشتمانی بۆ لیکۆڵینەوەی شێرپەنجە لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەسترا و لێکۆڵینەوەیەکی زوری دەربارەی کارتێکردنی ئەسترۆجین لە لووەکانی مەمکدا تیادە پێشکەش‌کرا و ئەندامانی کۆنگرە بە گشتی لە سەر ئەوە یەکیان گرتەوە کە ناویان لی‌نا ( پ نجەرەی مەترسی ئەسترۆجین) کە ئەکەوێتە بەینی سەرەتای پێگەیشتنی مەمك و یەکەم سلك‌پڕبوون چونکە ئەم قۆناغە تووشی ئیفرازێکی یەکجار گەورە لە ئەسترۆجین ئەبێ . ئەوەی لێرەدا جی‌ی سەرنج راکێشانە ئەوەیە کە ئەم ماو یە بە هۆی زوو پێگەییختنی کچەکانەوە رەنگە ببێتە ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ ، ئەمەش لە ئەنجامی دواکەوتنی سلك‌پڕبوون یەکەم لە کۆمەڵگا تازەکاندا . . هەروەها ئەندامانی کۆنگرە ئەوەیان بریاردا کە نابێ بۆ مەسەلەی چارەکردنی هۆرمۆنەکە لە پێش سلك‌پڕبوونی یەکەم بۆ ئەو رێگایانە پەناببرێت کە لە زانیاری دادوورن و هەروەها هەندێ دەرمانی دژ بە ئاووس‌بوونیشیان قەدەغە کرد بە تایبەتی ئەوانەی کە رادەی ئەسترۆجینی یان زۆر زۆرە .

**دەم و قورگ :-**

پزیشکەکانی شێرپەنجە ، وە ئەسەلمێنل کە ئەگەر بێتو و بتوانین بە سەر ئەلکۆڵ و جگەرەکێشاندا زاڵ‌بین رەنگە مەسەلەی تووشبوون بەم نەخۆشی‌یە واتە شێرپەنجەی دەم و قورگ بە لیوە بگەێینین ، ئەمەش بریاری ئەو کۆنگرەیەیە کە بۆ کۆڵینەوە لە شێرپەنجەی دەم و قورگ لە شاری پاریحدا بەسترا ، ئەو کۆنگرەیەش بە سەرۆکایەتی ئیف کاشین بوو . . ئەندامانی ئەم کۆنگرەیە ئەوەیان تێبینی کرد کە ئەوانەی تووشی شێرپەنجەی دەم و قورگ بوون چواریەکی تووشبووەکانی شێرپەنجە لە فەرەنسە ئەنوێنن ، ئەوەی لێرەدا زۆر

ـخۆشیشە ئەوەیە کە چارەکردنی ئەم سیٚ شێوەیە زۆر سەخت و گرِنە ، جگە لە وەی کە زۆربەی ئەو نەخۆشانە هەتا دوایی لەگەڵ چارەکردنەکەدا نارِۆن لە ترسی ئەوەی نەوەك تووشی هەندیٚ شڵژاوی و ئاڵۆزی ببن یاخود وەك تاقە چارەکردنێك و بۆ ئەوەی نەخۆشی‌یەکە بڵاو نەبێتەوە ناچار بن بۆ لە ناوبردنی قورگیان و ئەنجامیش مردنی نەخۆشەکە ئەبیٚ . .

بۆ چارەسەرکردنی ئەم تۆرە شێرپەنجانە پێشکەوتنێکی باش هەیە بەڵام زۆر لەسەر خۆیە . . سەبارەت بە برین سازی‌یەوە پێشکەوتنێکی دیار و ئاشکرا لە چاکردنی برین‌سازی و کاشتنی ئەندام و شانەی جێگر لە جیاتی ئەوانەی کەزیانیان بەر لە وتوەو بە ناچاری یەرهێنراون . . ئەمە لەلایەك و لە لایەکی تریشەوە چارەکردن بە ریٚگەی تیشکەوە پەرەسەندن و پێشکەوتنەکەی دیارترە چونکە توانراوە هەندیٚ ئامێر و ریٚباز پەیدا بکریٚ را لەو ئەندامە تووشبووانە بکات جۆرە هەستێك لە ژێر تیشکدا پیشان بدات و پاشان بۆ بەهێز و بتەو کردنی رۆڵی تیشك . . لە هەمان کاتیشدا ئەم هۆیە تازانە ئەتوانن ئەندامە ساغەکان لە مەترسی بپاریزن ، ئەمەش ماوەی چارەکردنەکە کورت ئەکاتەوە جونکە لە تواناادا ئەبیٚ هەر رۆژێك زیاتر لە تەنیا دانشتینێك بکریٚت و لە دوایی‌دا ماوەی چارەکردنەکە لە حەوت حەفتە بۆ سیٚ حەفتە کورت ئەکریٚتەوە .

بەڵام ئەوەی کارگێری یاریدەدەری یەکەمە بۆ چارە کردن وەك برۆفیسۆر ڤیف کاشین ئەڵیٚ بریتی یە لە دوورکەوتنەوە لە ئەلکولٚ و تووتن و لەم بوارەدا ئەڵیٚ : تووشبوون بە شێرپەنجەی دەم پانزە جار زیاتر ئەبیٚ لە مەیانی بەکار هێنانی نیو لیتر ئەلکولٚ و پێنج جگەرە لە رۆژێکدا ر سیٚ لیتر ئەلکولٚ و چوار پاکەت جگەرە . .

**چارەکردنەکانی ئەم سەردەمە :**

کەواتە چی هەیە دەربارەی ئەو رێگەیانەی کە ئیستاکە بۆ چارەکردنی شێرپەنجە بەکار دێن ؟ !

لێرەدا هەندیٚ هۆی جیا جیا هەیە و بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لەم هۆیانە ئەبیٚ بۆ شێوە و جۆری ئەو شێرپەنجەیە و پلەی بڵاوبوونی بگەرِێین .

ئەگەر هات و شێر پەنجەکە تەشەنەی نەکردبوو و لەیەك‌شوێندا بوو ئەتوانین بە رێگەی برین سازی‌یەوە چارەی بکەین و شوێنە تووشبووەکە دوور بخەینەوە ، هەروەها رێگەیەکی‌کەش هەیە کە بۆ ئەم جۆرە نەخۆشی‌یە بەکار ئەهێنریٚ ئەوەش بەرێگەی تیشکی ئەیۆنی‌یەوە ئەبیٚ ، کە لە توانای‌دا هەیە ئەو شانە تووشبووانە لەناو ببات و بیان‌فەوتێنیٚ . . زۆر جاریش ئەم دوو رێبازە پێکەوە بەکار ئەهێنرێن ، تیشکەکە ئاوسانە شێرپەنجەیەکان کورت ئەکاتەوە و گەمارویان ئەدات و بەم شێوەیە رێگە بۆ برین‌سازی خوش ئەکاتەوە . .

بەڵاك تیشکیش مەترسی‌یەکی لەسەر ئەندامە ساغەکانیش هەیە ، دووریش نی‌یە کە تیشك بە شێوەیەکی دەرەوەش بەکار بهێنریٚ وەك تیشکی کۆباڵت یاخود لە ناوەوەی لەشی نەخۆشدا ئەوەش بە رێگەی سەرچاوەکانی تیشکەوە ئەبیٚ – بووری یاخود شریت – ئەمە تیشکی کۆری‌ی پیٚ ئەوتریٚ چونکە بە ناوی مەدام کۆری‌یەوە ناو براوە ، ئەو ئافرەتەی کە توانی مەسەلەی بەکار هێنانی تیشکی رادیۆم بو شوێنێکی تایبەت بدۆزێتەوە . بەڵام گەر هات و ئەو شێرپەنجەیە زۆر بڵاوبووبووەوە بۆ ئەمە دوو رێگەی سەرەکی هەیە : چارەکردن بە رێگەی دەرمانی کیمیاوی‌یەوەو چارەکردن بەرِێگەی هۆرمۆن لە کاتێکدا ئەو شێرپەنجەیە بە هۆی هۆرمۆنەوە پەیدا بوو بیٚ . .پەنجا جۆرە دەرمانیش هەیە ، هەندێکیان بە رێگەی دەمەوە بەکار دێن و هەندێکی تریشیان بە رێگەی شرینقەوە . بەڵام ئەم دەرمانانە دوور نی‌یە بۆ شانە ساغەکان زەرەریان هەبێت و بە تایبەتی ئەو شانانەی کە بە رێگەی‌خرِوکە سپی‌یەکانەوە پەیدا ئەبن . . لێرەدا پێویستە پاش بەکار هێنانی دەرمانەکە خوێنەکە تەماشا بکریٚت . .

لە حاڵەتی تووشبوون بە شێرپەنجە هۆرمۆنی‌یەکان پێویستە ئەو شێرپەنجەکە بنبرِ بکریٚ و ئەوەش بە رێگەی بەکار هێنانی هۆرمۆنێك ئەبیٚ کە دژ بە هۆرمۆنە یەکەمەکە یاخود بە رێگەی دەرهێنانی ئەو لووە ، ئەبیٚ کە بووەتە هۆی پەیدا کردنی شێرپەنجەکە . . سەبارەت بە ئەترۆفیۆنیش لێکۆڵینەوەکان هیچ جۆرە ئەنجامێکی وردیان دەربارەیی و کاریان نەداوە بەدەستەوە ئەمە لە کاتێکدا کە لەمەیانی تاقی‌کردنەوەی بەسەر مشکدا سەرکەوتنێکی باشی ئەنجام‌داوە ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنیٚ کە ئەتوانیٚ شێرپەنجەی ئادەمیزاي چارە بکات . .

لەم دوایی‌یەش لە شاری (تۆلۆز)ی فەرەنسی دا ماددەیەکی نویٚ خرایە مەیانی تاقی‌کردنەوەوە ئەو ماددەیە (سواز)ی پیٚ ئەوتریٚ و لە کبریت‌و ئازۆت و فۆسفۆر و کاربۆن پێك دێت ، ئەوەی روون بووەتەوە ئەوەیە کە ئەم کاددەیە توانای چارەکردنی سیانزە شێوە شێرپەنجەی کە لەلای مشکدا هەیە چارەبکات بەڵام هەتا رۆژی ئەمرۆ بەسەر مرۆڤ واتە ئادەمیزاد تاقی نەکراوەتەوە .

# "کورتەباسێک لەمەڕ قەرەجانەوە"

" محەمەد ئەحمەد سەعید"

ئەوی ڕاستی بێت لە مێژەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە هەندێ تێبینی سەبارەت بەقەرەجانەوە بنووسم . بەلاّم نەبوونی سەرچاوەو ونووسین دەربارەی ئەم تیرەگەڕۆکە ، هەروەها زیانی کۆچەرییان بوونە هۆی ئەوەی کەلێ ی سارد ببمەوە . .

وە لەبەر ئەوەی کە بەکوردی شتێکی ئەوتۆ لەم بارەوە بلاّو نەکراوەتەوە وە ئەگەر بلاّویش کرابێتەوە ئەوا زۆر کەمو دەگمەنە . . ئەمەش پاڵی پێوە نام کەسەر لەنوێ بەم نووسینەمدا بچمەوە وگەلاّلەی بکەم .

وە ئەوی لە کوردیدا بەرچاوم کەوتبێ لەمەڕقەرەجانەوە وتارێکی کورتە بەنێوی «چی لەبارەی قەرەجەکانی دنیاوە ئەزانی» کە لەژمارە (٢)ی ڕۆژنامەی برایەتی ساڵی ١٩٧٤/١/٩ دا لاپەرە هەشت بلاّوکراوەتەوە وە نووسەرەکەشی ناوی خۆی نەنووسیوە .

لەم نووسینەدا دەربارەی کۆچ کردنیان وژیان و گوزەرانیان وباری ئێستایان کۆڵراوەتەوە .

وە هەر لەکاتی نووسینەوەی ئەم وتارەدا کتێبێکی زۆر نایابم دەست کەوت لەم ڕووەوە بەزمانی عەرەبی بەنێوی «الغجر والقرج في العراق» کەهی مامۆستا «طه الحديثي»یە . بەڕاستی زانیارییەکی زۆر ووردو نایابی تێدایە . هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی زانستییەو بەتەواوی تێیدا قووڵ بووەتەوە . . . منیش ئەم کتێبەم کرد بەسەرچاوەیەکی تری باسەکە وە کەڵکێکی زۆرم لێ وەرگرت .

لەم نووسینەمدا ویستوومە هەندێ تیشك بخەمەسەر ئەو خاڵانەی کەڕەنگە سوودی لێ وەربگیرێ . لەو ڕووەوە خوێنەران زیاتر ئاشنا بکات وەك ، ووشەی قەرەجو بیروڕای زاناو مێژوو نووسەکان .

وە هەندێ بەراووردی زمانەوانی لەرووی جێنا ورستەو ووشەکانیەوەوە دەقێك لەقسەو گفت وگۆ کردنیان و گۆڕینی بۆ زمانی کوردی لەگەڵ هاتو چۆ کردنیان وژمارەی خێزانەکانیان لە عێراقدا . لەمانەش بترازێ حیکایەتێکی فۆلکلۆری لەبارەی زانایەکی قەرەجانەوە .

دەربارەی ووشەی قەرەج چەند بیروڕایەکی جیاواز هەیە . .

م . بینیامین وای بۆچووە کەووشەی قەرەج لە «قەرە»ی تورکییەوە وە بەمانای «ڕەش» وەووشەی «تسیکان»ی فەرەنسیش هەمان مەبەست ئەپێکی . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان قەرەجو «غجر»ی عەرەبدا هەیە . . .[1]

ئەب ئەنستانس دەڵێ بەوکۆمەڵە ئەووترێ کەلە دەوروبەری شاری مووسڵو هەندێ ناوچەکانی بەغدا داهەن . کەبەئیشی دزیو ماڵ خواردنو دەست برینەوە خەریکن وە خۆیان ئەبەنەوە سەر «قرەشییەکان» وە وای بۆ ئەچێ کە ئەم کۆمەڵە خەڵکی دەوروبەری «کەرەج»بوون . کەرەچیش ئەکەوێتە نێوان هەمەدانو ئەسفەهانەوە . بەلاّم نەلەبارەی مێژووی هاتنو کۆچ کردنیان لەشوێنە کۆنەکانی خۆیانەوە دوواوە ، وەنەباسی بنەچەو ڕەگەزیاتیشی کردووە . دەستنیشانی ئەوەشی نەکردووە سەربەچ کۆمەڵێکن ؟[2] لە فەرهەنگی تورکیدا ووشەی قەرەچی لەرووی ماناوە بەرامبەر بە «غجر» یان جنکانییان قبطی دەوەستێ . کەبەبێ ئابروو بەدرەووشتی مانای هاتووە .

کە کۆمەڵێك بوون لە هیندا ئەژیان وبتیان ئەپەرست دواجار پەرشو بلاّوبوونەوە هەندێ بەرەو ئێران چوون وە هەندێکیشیان ڕووەو عێراقو میسر وەڕێ کەوتن . لەوێوە بەرەو وولاّتی ئیسپانیاو ئەندەلووس چوون و بەژیانی کۆچەرییەوەمانەوە . وەمانایەکی دیکەشی لێکداوەتەوە کە بەدزو ڕێگریانی داوەتە نووسین .[3]

مامۆستا «طه الحديثي» لەگەڵ ئەوەدایە کەووشەی قەرەج لەڕەنگی ڕەشەوە نەهاتووە وە هەروەها ئەوەش ناگەیەنێ کە لەووشەی کەرەچەوە هاتووە ، بەڵکو بە وکۆمەڵە دەووترێ کە بەکاری بەدرەووشتی و سووکەوە خەریکن .

پشتی بەوە بەستووە کە زۆربەی کۆمەلاّنی خەڵکی عێراق ئەو ووشەیە بەو مانایە بەکار دەبەن وە لە هەمان کاتیشدا کە کۆمەڵێکی تێکەڵ وپێکەڵن . . لە چەند کۆمەڵێکی جیا جیا پێکهاتوون وەك کورد ، تورك ، فارس ، عەرەب .

هەندێ خێزانی قەرەجی قەلاّی کەرکوك وگەڕەکی عارەب لە هەولێر خۆیان دەبەنەوە سەر هۆزی «مهرالی بلك» . کەلە دووا دووای فەرمانڕەوایی عوسمانیدا لە تورکیاوە هاتوونەتە عێراق ، هەڵێکی وایان بۆنە ڕەخساوە ڕەگەزنامەیان دەسگیربێ وەقەرەجەکانی تەیراوەی شاری هەولێر دەڵێن ئێمە لەقەلاّی دمدمەوە هاتووین دووای ئەوەی کە شاە عەبباسی سەفەوی لەسەرەتای سەدەی حەڤدە هەمدا وێرانی کرد . . هەندێکیان خۆیان دەبەنەوە سەر هۆزی «بەنی مورەی عەرەبی»[4] کەچی قەرەجەکانی ناوچەی کەرکوك و سلێمانیو هەولێر پێیان خۆش نییە بڵێن قەرەجن لەوەلاّمی ئەوقسەیەدا ئەڵێن ئێمە قەرەج نین وە لەکۆنەوە پێمان ئەڵێن خەرات وەبەئیشی دەستییەوە وەك بێژنگو شەنو قەفەسو بێشکە دروست کردنەوە خەریکین وە هەر لە کۆنەوە ئەم ناوەمان لێنراوە .

ئەبارەی مێژووی کۆچ کردنیانەوە وەکو زانراوە کەقەرەج نەتەوەیەکی گەڕۆکن لەسەرووی ڕۆژ هەڵاتی هیندستانەوە هاتوون . ئەم کۆمەڵەوا ناچارکراوەکە شوێنی خۆیان بەجێ بهێڵن . لەبەر هەندێ هۆ کە ئێستاش بەشارراوەیی ماونەتەوە ئەم کۆچکردنەش لە سەدەی پێنجەمی زایینیەوە تاکو سەدەی دەیەم بەردەوام بووە . بۆ ماوەیەکی زۆریش لەناوچەی ئاسیای بچووك نیشتە جێبوون . دواییش لە ژووروی ئەفەریقیا .

تاله سەدەی پانزەهەمەوە دەستیان کرد بە کۆچ کردن بەرەو ناوەراستی ئەوروپا . مانەوەشیان لەوناوچانەدا بووە هۆی ئەوەی کە کار بکاتە سەر خوورەوشتو زمانو جۆری ژیانی ئاسایی ئەسڵیان . هەر چەندە هەندێ شت لەوگەلانەوە فێربوون کە لە ناویانا ژیاون . (٥)

لە رووی زمانو گفتو گۆکردنیانەوە . . ئەو زمانەی کە ئێستا ئەم تیرە یەقسەی پێ ئەکا ناتوانین بڵێین زمانی ئەسڵی خۆیانە . چونکە بەلای کوردانەوە ئەو زمانەی قسەی پێ ئەکەن بێگانەنییە لەزۆریش تێ ئەگەن . .

وە هەروەها بەلای فارسی وە یاخود تورکیشەوە بەهەمان چەشن . لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم نەتەوە گەڕۆکە زمانەکەیان لە ماوەی چەند سەد ساڵێکدا دۆڕاندووە . وە کەوتووەتە ژێر تینو گوڕی زمانەکانی وەك کوردیو فارسیو تورکییەوە . بەواتە ئەو ناوچانەی کە تیایدا ئەژینو هاتوو چۆ دەکەن تەنانەت لەوە ووردتریش ، دەبینین قەرەجەکانی کوردستانی تورکیا بەشێوە زاری «دیالێکتی» کرمانجی ژووروو گفتو گۆ دەکەن .

وە قەرەجەکانی ناوچەی سلێمانیو هەولێرو کەرکوك بە دیالێکتی کرمانجی خواروو قسەدەکەن . هەروەها ناوچەی خانەقینو لوڕستانیش بەکوردی باشوری دەدوێن وە موفرەداتەکانی ئەم ناوچانە زاڵە بەسەرهێنەکانی کەرکوكو سلێمانیو هەولێردا . یاخود بابڵێین شێوە لوڕییەکە لە ناوچەکانی کوردستانی ئێرانو کەرکوكدا بەتەواوەتی بەسەریا زاڵە .

ئەوی لێ ی دووایین زمانی قسە کردنی ئێستایانە بەڵام زمانە ئەسڵییەکەیان بە هیچ جۆرێكو وە بەشێوەیەکی گشتیش لەو زمانەنا چیێ کەقسەی پێ دەکەن .

وەجیاوازییەکی زۆریشی لە نێوانیاندا بەرچاو دەکەوێ چ لەرووی پێکهاتنی رستەوە وە چ لە رووی جێناو ووشەکانەوە . بەو زمانەش دەڵێن « چەپەوانە» کەم کەسیان دەزانن قسەی پێ بکەن . تەنها پیرو بەساڵا چووەکانیان نەبێ کە هەندێ لە موفرەداتەکانیان لە بیرە . وە بەکار هێنانیشی تەنها لە کاروباری نهێنی دایە وەك بەسەر هاتنی میوان و هەندێ گیروگرفتی ناوخۆیان .

وە لەبەر ئەوەی کە ئێستا رەواجی نەماوە وەسەودا ومامەڵەی لەگەڵ دانیشتواناندا پێ ناکرێ بەزمانێکی مردوو دەژمێررێ .

وە وا هەندێ نموونە لەووشەکانی ئەوزمانە دەخەینە روو وەلەگەڵ بەراوورد کردنی لەگەڵ زمانی کوردی وفارسیدا .

| قەرەجی | فارسی | کوردی |
|---|---|---|
| تیە | دیدە | چاو |
| ژووت | زن | ژن |
| دوختەر/دونگ تاز | دختر | کچ |
| دوندن | وندان | دان |
| زوون | زبان | زمان |
| نفت | بینی | لووت |
| گوش | گوش | گوێ |
| چەنگ | دست | دەست |
| دەخا | خوب | باش |
| خراو | بد | خراپ/بەد |
| کەلور | کلە | کەللەسەر |
| لەکەر | شکر | شەکر |
| کالدا | کودك | منداڵ |
| تینە | مرغ | مریشك |
| نورا | چشم | چاو |
| مانس | مردم | پیاو |
| پەیلەر | پا | پێ |
| سووناوی | چا | چای |
| نار | ئاتش | ئاگر |

نموونەی جێناوە کەسییە سەربەخۆکان

| | | |
|---|---|---|
| مکی | من | من |
| تکی | تو | تۆ |
| ئو | او | ئەو |
| ماکی | ما | ئێمە |
| شماکی | شما | ئێوە |
| ئوریا | أیشان | ئەوان |

ئەمەش چەند رستەیەکی قەرەجییە لەگەڵ بەراووردکردنی زمانی فارسیو کوردیدا :

قەرەجی : مکی دەخا هەوم .

فارسی : من أز أو خوبترم .

کوردی : من لەو باشترم .
قەرەجی : مکیم مسی پیر .
فارسی : برای بازار میروم .
کوردی : بۆ بازار ئەڕۆم .

نموونەیەك لەگفت وگۆ کردنیان :—

«مانس وەچیێ ، ئی کەلوپەلایە وەرە چەنەش بکی ویسی ئوپیر خانگی یلك‌بتوو ، زیغال کەمتەیی ناگوماسی کالدا وەرە چەنەش بەخوشی بتوو ، ئوقسەم ئبری هەوە وارتوو بکیمی سی پیر سلێمانی وەوچو ، خانگی ئەسەیەمو شونیشستەم ، جەنگم کردە ئاردەسی ، تینە ئیماتش کردم . هەی چنو تەومەکو ئوماوەتەی موو .»

بەکوردی :

«ئەو پیاوەهات ووتی ، ئەم کەلوپەلانە هەڵگرە بچۆ شارێکی تر خانوویەك بکرە وتیا بژی . دەست بکە بەئیش وکار بۆمناڵەکانتی سەرف بکەو بەخۆشی دانیشە . من ئەو قسەیەم پێ خۆش بوو . هەڵسام چوومە سلێمانی لەوێ خانوویەکم کردو لەوێ دانیشتمو دەستم کرد بەبێژنگ درووست کردنو مریشك بەخێو کردن . ودوای ساڵێك خزمەکانم هاتن بۆلام .»

ئەوی راستی بێ ئەم شێوە قسە کردنە تەنها پیرەکانیان قسەی پێ دەکەن ئەم نەوەی ئێستایان زۆربەی موفرەداتەکانی نازانن . ئەویش لە ئەنجامی ئەوتێکەلاو بوونەیە کە لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچانەی تیّدا دەژین .

لەم پەرگرافەدا هەندێ ووشە هەن کە لە ووشەکانی فارسی و کوردی دەچن وەك : ئی ، نیشتە ، خوشی ، سی ، ئی‌لە (این)ەوە .سی‌لەسوی‌یەوە نزیکن وە هەروەها کەلوپەل ، خانگ ، کردم لە کوردی‌یەوە وەرگیراوە

**هاتو چۆکردنیان** :

قەرەج هەر لەکۆنەوە سرووشتی بەوە راهاتووە کە حەز بەنیشتە جێ بوون نەکات . هەتا وەکو ئەم ساڵانەی دووایش هەر لە کۆچ کردن وگەڕاندا بوون . وە بە تایبەتی ئەوانەی کە لە کوردستان دادەژین .

هەتاکو ئێستاش هەندێکیان لە مەڵبەندی نیشتەجێ بوونیانەوە کۆچ دەکەن بۆ شوێنەکانی تری کوردستان بەتایبەتی لەوەرزی بەهاراندا کە جووتیارو لادێیەکانی کوردستان پێویسیان بەکەرەسەو ئامێری کشتوکاڵ هەیە زۆربەی دەست کردی ئەوقەرەجانەن وەك داس ، شەن ، بێژنگ ، قەفەس ، تەشی . . . تادوایی .

قەرەجەکانی شاری کەرکووك بۆ ناوچەکانی سلێمانی‌و شارەزوور وهەورامان کۆچ دەکەن وە ئەوانەی هەولێر بەرە و ناوچەی چۆمان‌و ئالانەوگەلاڵە دەڕۆن . هینەکانی موسڵیش بەرەو جەزیرە کۆچ دەکەن .

ئەوی شیاوی باسە ئەم کۆچ کردنەیان دە دوانزە ساڵ پێش ئێستا لە سنووری عێراقەوە دەترازایە نێو سنوورەکانی تورکیاو ئێرانەوە ، وەبۆ ماوەیەك لەوێ دەمانەوەو ئەم بەرو ئەوبەریان دەکرد وەهەندێ جار لە شارەکانی وەك کرماشان‌و قەسری شیرین‌و سنەو مەریوان‌و دیار بەکر دەمانەوە و دەستیان دەکرد بەئیشی دەستی .

وە لەبەر ئەوەی ئێستا بایەخێکی زۆر دەدرێ بەبارو زروفیان و چارەکردنی گیرو گرفتەکانیان وە هەوەها زەوی‌و زاریان بەسەردا دابەش دەکرێ . بەتایبەتی لە عێراقدا . میری دوای شۆرشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بایەخێکی زۆریان پێ‌داوە وخەریکە بەرەبەرە کۆیان دەکاتەوە ونیشتە جێ‌یان دەکات ، جگە لەمەش کە خۆیان ئێستە حەزبە ژیانی شار دەکەن‌و هەروەها ئەو هەل‌و مەرجانەیان بۆ نارەخسێ کە بەئارەزووی خۆیان هاتوو چۆ بکەن . لەبەر ئەم هۆیانەو چەند هۆیەکی تریش ئێستا زۆربەیان لە شارەکانی وەك کەرکوك ، هەولێر ، سلێمانی ، دهۆك ، موسڵ نیشتە جێ بوون شانیان داوەتە بەر کارکردن وەك کرێکاری‌و دارتاشی وکاروباری بیناوگە چکاری‌و مامەڵەو سەودا کردن . . . تادوایی .

**بیروبارەڕی ئایینیان** :

ئەوی راستی بێت ناتوانین بڵێین کە قەرەجان سەربەیەك ئایین وئاینزاو[٦] باوەڕن . ئەوی کە تا ئێستا روون بووەتەوە ئەوە یەکە ئەو قەرەجانەی لە ناوچەکانی سلێمانی‌و کەرکوك و هەولێر وکرماشان وقەسروسنەو مەریوانن موسڵمانن‌و کەچی هی ناوچەکانی موسڵ‌و تەلعەفەرو سنجارو شارەکانی وەك دیاربەکر سەربە ئایینی ئێزەدین .

ژمارەی دانیشتوانی قەرەجەکانی عێراق :—

وەکو لەمەو بەر باسمان کرد کە زۆربەیان لە شارەکان‌و دێهاتە کاندانیشتە جێ بوون وە بەئیشی دەستی وکشت‌و کاڵەوە خەریك بوون . وە هەندێکیان لەسەر خوو رەوشتی کۆچەری خۆیانەوە مانەوە وە لەم رووەوە دەتوانین بیکەین بەچەند بەشێکەوە :—

**١ — شارنشینەکانیان** :—

نزیکەی ٢٨٠ خێزان دەبێ‌و ژمارەیان خۆی لە ١٣٤٠ کەس دەدا . ئەمانە لە شارەکانی دهۆك وکەرکوك‌و سلێمانی وسمێل‌و سنجارو موسڵ نیشتەجێ بوون . لەم شارانە خەریکی ئیش کردن‌و کاری

ئەستی‌و کرێکاری‌و بۆیە چێتی‌ن .

**نیشینەکانیان :-**

ئەمانە خۆیان ماوەیەك لەمەو بەر کۆچەری بوون‌و ئێستا لەبەر ئەوەی کەدەوڵەت دەیەوێ نیشتەجی‌یان بکات زەوی‌و زاری کشت‌و کاڵی وبەراوی بەسەریاندا دابەش کردووە . خەریکی ئەو کاروبارانەن ، تێکڕای هەموویان نزیکەی (١٠٠) سەر خێزانێك دەبێت . لەدێیەکانی سۆلاف‌و بەعس‌دا بە کشتو کاڵەوە خەریکن . ئەم دوو دێیەش لە شێوەی ئۆردوگای هاوچەرخی دایە .

**٣ - کۆچەری‌یەکانیان :-**

ئەم کۆمەڵەش هەندێ جار دەگەڕێنەوە نێوشارەکان لە نزیك گەرەکێ چادرو خێوەتی لێ هەڵدەدەن و لەکاتی بەهاران دا بەرەو دێهاتەکان دەڕۆن وە خۆی لە (١٠) دە خێزانێك دەدا . ئێستا بلاوەیان لێ کردووە بەشارەکانی سلێمانی‌و هەولێرو دێهاتەکانی دەوروبەری شاری کەرکوك وەك : حەسارو باداوەو هەندێ دێهاتی تر . .

**باری ئێستای قەرەجان :-**

وەنەبێ قەرەج تەنها لە عێراق‌دا هەبێ بەڵکو لەزۆربەی وولاتەکانی دونیادا هەیە وەك تورکیاو ئێران‌و میسرو ئیسپانیاو زۆربەی وولاتە ئەورووپی‌یەکان .

باری ئێستایان وەکو سەردەمەکانی پێشوویان نی‌یە . هەر چەندە هەندێکیان تاکو ئێستاش هەر لە گەڕان‌و کۆچ کردن‌دان و لەسەر ژیانی سەرەتایی خۆیان ماونەتەوە خەریکی ئیشی دەستین .

قەرەجان ئێستا بە چاوێکی ترەوە سەیریان دەکرێ ولە زۆربەی ولاتەکاندا بایەخیان پێ دەدرێ دەیانخەنەسەر کارو بەشێوەیەکی مرۆڤانە تەماشایان ئەکرێ . ئەم دەوڵەتانەش بەمەوە نەوە ستاون بەڵکو زۆر بە پەرۆ شەوەن بۆ ئەوەی ئەم کۆمەڵە چارەیان بۆ بدۆزێتەوەو ڕێ‌و شوێن‌و پاشە ڕۆژیان دیاری بکرێ . بۆ نموونە دەبینین‌و دەبیستین لە زۆر وولات‌دا هەولێ دراوە بۆ نیشتەجێ کردنیان‌و دابەش کردنی زەوی وزار بەسەریاندا ، بەتایبەتی لە عێراق‌دا پاش شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ کۆمەڵێکی زۆریان لێ‌نیشتەجێ بووە . وە هەروەها لە زۆربەی دامودەزگاکانی دەوڵەت‌دا ئیشیان پێ دەکرێ وەیاسای سەربازی دەیانگرێتەوە . ڕێگایان بۆ ئاواڵە کراوە بۆ ئەوەی منداڵەکانیان لە فێرگەکان‌و قوتابخانەکان بخوێنن‌و فێربکرێن .

وە لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینی دەوڵەتی سۆڤیەت بڕیاری دابەش کردنی زەوی‌و زارونیشتەجێ کردنی دەرکرد بۆ ئەو قەرەجانەی کە لەوێ جێگیر بوون وە ئێستا زۆریان پێ گەیشتوون‌و پزیشك‌و مامۆستاو هونەرمەندی چاکیان تێدا هەڵکەوتووە . وە لە شاری مۆسکۆ شانۆیەکی تایبەتی‌یان هەیە بەناوی «ڕۆمێن»ەوە .

**حیکاتێکی فولکلۆری لەمەر زانایەکی قەرەجانەوە :-[٧]**

ئەوی ڕاستی بێت ئەم حیکایەتەم لە گۆڤاری «التراث الشعبي»ی ژمارە (١٢) دوانزەی ساڵی چوارەمی ١٩٧٣ بەنێوی «ذكاء حكيم غجري»ەوە وەرگرتووە بەدەسکاری‌یەوە وەرم گێڕاوەتە سەر کوردی .

لە پەراوێزی کۆتایی گێرانەوە کەدا نووسەر دەنووسێ : ئەم گێرانەوەیەم لە پیاوێکی پیری خەڵکی ناوچەی بەرواری بالأبیستووە . کەنێوی (حسين حكمى)یە . (حسين حەمەکی)یە وە لە ساڵی ١٩٧١ پیاوێکی پیری ٧٥ ساڵە لە دێی ئالانەی سەر بەمە مەڵبەندی گەلاڵە کە نێوی «حاجى محمد رسول»ە بۆی گێڕامەوە . .

وا دەردەکەوێ کە لەنێو دێهاتی کوردان‌دا هەموو شێوە زارەکانی دانیشتوان دا ئەم حیکایەتە بلاوە . گێڕراوەتەوەو دەگێڕرێتەوە . . . گێڕ ڕەوەکانیشی زۆرکەمە . .

باوەڕی نووسەریش وایە کەتەمەنی ئەم حیکایەتە کۆن ودرێژە . دەیباتەوە بۆ سەردەمی بلاوبوونەوەی موسڵمانەتی لە نێو کوردان‌دا . چونکە لەو دەمەدا دوێت تەنها لەلایەن زاناو ئیمامەکانەوە بەکاردە هێنرا . لە دووا دووای پەراوێزەکەد اوای بۆ دەچێ کەخۆی لە ٥٠٠ ساڵ دەدا .

**پەراوێزەکان :**

١ - الغجر والقرج في العراق للاستاذ طه الحديثي لاپەرە (٢٠)
٢ - هەمان سەرچاوە هەمان لاپەرە .
٣ - هەمان سەرچاوە لاپەرە (٢١)
٤ - هەمان سەرچاوە لاپەرە (٢١ -٢٢)
٥ - برایەتی ژمارە (٢) ساڵی ١٩٧٤ لاپەرە (٨)
٦ - مەبەست لە ئاینزا «مذهب»ی عەرەبی‌یە
٧ - التراث الشعبي مجلة فولكلورية العدد الثاني عشر السنة الرابعة ١٩٧٣ حكاية شعبية ، منطقة أربيل ذكاء حكيم غجري / عبدالغني علي يحى .

# تایەر تۆفیق دەنگێکی هونەری ڕەسەنە

کەریم شارەزا

ئەوەی لای هەموو کەسێکی شارەزای هونەری ئاوازو گۆرانی کوردی روون‌و ئاشکرایە . ئەو راستی‌یەیە کە نەتەوەی کورد خاوەنی سامانێکی گرانەهای لە بن نەهاتووی هونەری ئاوازو گۆرانی ڕەسەنەو . لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە لە ناو دڵ‌و دەروون‌و ویژدانی میللەتدا ڕەگی قووڵ رۆیشتووەو . وەك بەڵگەیێکی مێژوویی بووە بە تۆمارێکی ڕاستگۆی ژیانی ڕابوردووی کۆمەڵگای کوردەواری‌و بە ئاوێنەی بالاْ نومای ژیانی ئابووری‌و کۆمەلاْیەتی گەلەکەمان‌و لە هەموو دەورو سەر دەمێکدا رۆڵەکانی میللەت هەست‌و سۆزو ڕازی دڵ‌و دەروونی خۆیان لە ناودا دۆزیوەتەوەو بە بەش‌و تووشێکی جودانەکراوە لە ژیانی رۆژانەی خۆیاندا زانیوە .

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی و بە تێکڕایی سەیری هونەری ئاوازو گۆرانی کوردی بکەین‌و لە لق‌و پۆپ‌و جۆرەکانی وورد ببینەوە ، دەبینین هەموویان بە قەدی دارێکی گەورەو قایمی بوونی گەلەکەمانەوە لکاون‌و وەك جۆگەو رووباری ساردو سازگار لە یەك سەرچاوەوە هەڵ دەقوڵێن‌و بۆ ناو دەریاچەی هەست‌و نەستی مرۆڤی کورد دێنە خوارو بەرەو دەریای بیرو ئەندێشەی قووڵی رۆڵەکانی شۆڕ دەبنەوە ، بەلاْم لەگەڵ ئەو خاسیەتە گشتی‌یەشی‌دا دەبینین ئەو هونەرە ناسك‌و بەرزە لەهەر جێ‌و شوێن‌و مەڵبەندەی کوردستاندا جۆرە مۆرك‌و چەشنە گورجی‌و خاوییەکی لە ناودا پەیدا دەبێ‌و ، لە لای مەقامناسان‌و هونەرمەنداندا بە ئاشکرایی لێکدی جودا دەکرێنەوە ، وەك بڵێی : لاوك لەناو کرمانجی ژووروو ، حەیران لە ناو کرمانجی خواروو بە تایبەتی لەناو دەشتی کوردستان‌و ، هۆرە لە ناو جاف‌و مەقام‌و بەستەی هەمە جۆریش لەناو شارەکانداو لە هەر شوێنەش جۆرە مۆرکێکی تایبەتیان بە سەرەوەیە .

هەندێ مەڵبەندو شاری کوردستان ، مەڵبەندی سەرهەڵدان‌و گەشە کردنی هونەری ئاوازو گۆرانی کوردی بوون . لە موکریان‌و ، بە تایبەتی شارەکانی وەك مەهابادو سەردەشت چاوگەی سەرهەڵدانی ئەو هونەرە ناسکە بوون‌و ، شاری کۆیە قۆناغی سەرە ڕێ‌و ناوچەی ڕێك‌خستن‌و مشتومالْ کردنی ئەو ئاوازو گۆرانیانەو شاری سلێمانیش مەڵبەندی گەشەکردن‌و بەرەو پێشەوە بردنیان بووە .

## تایەر تۆفیق‌و شاری کۆیە :

مامۆستا تایەر تۆفیق لە شاری کۆیە ، شاری شیعرو هونەری ئاوازو گۆرانی ، مەڵبەندی ڕێکخستن‌و مشتومالْ کردنی هونەری ئاوازی کوردی ، لە ساڵی ١٩٢٢ دا لە دایك بووەو ، لە ساڵی ١٩٢٩ دا باوکی لە سوختەخانەی (مەلای ڕەش)ی کۆیە لەبەر

خوێندنی ئاینی داناوەو قورئانو گوڵستانو بۆستانی تەواو کردووە .

لە ساڵی ١٩٣٣ دا چۆتە قوتابخانەی یەکەمی سەرەتایی کۆیەو لە پۆلی دووەمدا وەرگیراوەو ، لە ساڵی ١٩٣٦ وە دەستی بە گۆرانی گوتن کردووەو مامۆستاکانی قوتابخانەکەی یەکەمین هاندەری بوون بۆ گرتنی ریبازی هونەری ئاوازو گۆرانی کوردی چونکە خاوەنی دەنگێکی خۆشو بێگرێ بووەو گوێچکەی هونەری بە چریکەی بولبولانی باخەکانی شەمەو ئۆمەرخوچانو باغەو رەزی پلووسكو هەرمۆتەو ئاشانو سەیرانگاکانی دیکەی ئەو شارە گۆش بووە .



هەرچەندە تایەری هونەرمەند خۆی خاوەنی بەهرەیەکی هونەری گەورەیە لە مەیدانی ئاوازو گۆرانیی کودیدا ، بەڵام پەروەردە بوونی لەو شارە زیندووە هوشیارەدا بووە بە مایەی گەشە کردنی بەهرە هونەرییەکەی . رێچکەی ژیانی هونەری لە پۆلی سێیەمی سەرەتاییەوە سەری هەڵداوە ، لەو کاتەی کە لە تیپی سروودی قوتابخانەکەیدا ئەندامێکی زۆر دەنگ خۆش بووە ، لە دوایی‌دا لە کۆڕی ئاینیو ئاهەنگەکانی مەولوودی پێغەمبەرو دانیشتنی تایبەتی دۆستو برادەرانی خۆی وەك مەقابێژێکی بە دەستەلاتْ رێگەی ناوبانگو شۆرەتی بۆ خۆی شەق کردووە ، تا بووە بە میراتگری مەقامبێژە بلیمەتەکانی ئەو شارە دێرینەی وەك (مەربێن)ی دەنگ خۆشو نەشئەتی رەشید ئاغاو حاجیە گەورە و رەفیق چارچاو و عەبەی چایەچیو مەلا ئەسعەد و سێوە ، بەڵام دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین کە تایەر تۆفیق) کتو مت ئەو هونەرەی مەقامی کوردی بە بێ دەست لێدانو بەرەو پێشەوە بردن وەرنەگرتووە ، بەڵکوو جۆرە گۆرانکاریو چەشنە داهێنانێکی نوێی خستۆتە ناو و ، تەرزە خاسیەتێکی تایبەتی خۆی پێ داون ، بە جۆرێکی هونەرییانەی وا کە لەگەڵ دەنگە خۆشو زوڵاڵەکەیدا بگونجێن .

لە سەرەتای ژیانی هونەریدا ، لە مەقام گوتنی لەسەر شیعری کلاسیکی کوردی سوودی لە رێبازی هونەرمەندی خوا لێ خۆش بوو (مەلا ئەسعەد)و لە دواییشدا لە هونەرمەند (ئەحمەدی حەمە مەلا)[أ] وەرگرتووە ، بەڵام کە بازووی هونەریی بەهێز بووە خۆی بووە بە خاوەنی رێبازێکی تایبەتیو دەنگێکی هونەریی رەسەنو لە ئاوازو گۆرانیی گوتنی کوردیداو خاوەنی دەنگو ئاوازی پڕ سۆزی خۆی .

تایەر تۆفیق لە دوای هونەرمەند (ئەحمەدی حەمە مەلا)

یەکەم گۆرانی بێژی کورد بووە لە شاری کۆیە ، توانی هونەری گۆرانی کوردی لە کۆری ئایینیو ئاهەنگەکانی مەولوودی پێغەمبەر و لەسەر حەفەلو منارەو گۆمبەتی مزگەوتانەوە بهێنێتە ناو کۆری جەماوەری میللەتو بیهاوێتە قاڵبی گۆرانی نەتەوایەتیو سیاسیو توانی گۆرانی کوردی لە دیوەخانی ئاغایان دەربهێنیو بیباتە سەر شانۆی ئاهەنگی نەورۆز و جەژنە نیشتمانییەکانی وولاتو ، لە دواییشدا بردی بۆ جیهانێکی فراوانترو لە ئیستگەی کوردیی رادیۆی عیراقەوە بە هەموو لایێکی دا بلاّوکردەوە .

**تایەر تۆفیق دەنگێکی هونەریی رەسەنە :-**

مامۆستا تایەر تۆفیق گۆرانی بێژێکی هونەرمەندی بەدەستەلاّتە ، خاوەنی دەنگێکی زولاّلی تایبەتیی رەسەنەو شێوەی گۆرانی گوتنەکەی لە ناو دەیان دەنگ بەڵکوو لە ناو سەدان دەنگ دەناسرێتەوەو ، گرنگیی دەنگەکەی لەوەدایە ، لە وەتی دەستی بە گۆرانی گوتن کردووە ، تاکوو ئەمرۆشی لەگەڵدابێ ، هەمان جۆشو سۆزی هەیەو ، بە هەمان هێزو تین گۆرانی دەڵێ ، بۆمان هەیە بڵێین : گۆرانی گوتنی ئەمڕۆی ، لەگەڵ هی چل ساڵ لەمەو بەری جیاوازییێکی ئەو توی نییەو ، هەمان جۆشو خرۆش دەدەن بە هەستو هۆشی گوێگر ، تەنیا ئەوە نەبێ بە ئاستەم بێ هێزیو نەخۆشی پێوە دیارەو توانیویەتیشی چارەسەری ئەو دیاردەیە بکات بە گوتنی گۆرانی وا کە لەگەڵ هێزو تاقەتیو لەگەڵ شەوقو ئارەزووی دەروونی خۆیدا بگونجێو .

گەلێ گۆرانی بێژی دەنگ خۆش کە دەکەونە تەمەنی پیریی دەنگە خۆشو ناسکەکەیان ناساز دەبێ ، کەچی ئەو دیاردەیە بە هیچ جۆرێك لەم هونەرمەندەمان هەست پێ ناکرێ .

هەر کەسێکی کەمێك ئاشنای هونەری ئاواز و گۆرانیی کوردی بێو گوێی لە ناوی تایەر تۆفیق بێ یەك سەر ئاوازی گۆرانییەکانی (زولفت بە قەدتدا کە پەرێشانو بلاّوە)ی (نالی) و (چاوەکەم زانیوتە بوچی خەو لە چاوم ناکەوێ)ی (مستەفا بەگی کوردی)و (لە مەیدانی بەهارا شارەکەی کۆ)و (لەسەر شەو رۆژی داناوە)ی (حاجی قادری کۆیی)و (ئیش کە رووی ئێستێ لە هەوارزە)ی (شوکری فەزلی)و (لە باغان ئاهو ناڵین دێ)ی (وەفایی)و (مەکەن مەنعی ئاشقان)ی (ئەحمەدی کۆر)و (تا بە کەی قوربان بناڵم)ی (تایەر بەگی جاف)و (چوارینەکانی خەیام)و (غەزەلە ناسکەکانی صافی هیرانی)و (عەونی)ی کۆییو (پەڵە هەور)ەکەی (گۆرانی نەمر)و (گوڵی سەربەستی)ی (بەختیار زێوەر)و (بیستو حەوت ساڵە)کەی (بێکەس)و (ئەی بادی شەماڵ)ی (دڵدار)و چەند شیعرێکی تەرو پاراوی (مەدهۆش)و (دڵزار)و (هەژار)و گەلێ چەپکە گوڵی گوڵزاری شیعری فۆلکلۆریی کوردی دێتەوە یاد و لەگەڵ ئەندێشەی شیعرەکانو ئاواز و دەنگە خۆشەکەی ئەم هونەرمەندە کوردەماندا دەژی .

ئێستاش با ئێمە خۆمان لەو دابو دەستوور و نەریتە کۆنەی بابو باپیرانمان رزگار بکەین کە لەمەو بەر هیچ نرخێکیان بە زاناو ئەدیبو هونەرمەندانیان نەداوە تاکو لە ژیاندا بوون ، کەچی کە ئەو ساعاتەی کوچی دواییشیان کردووە ، کەوتوونەتە پێداهەڵدانو کۆتەڵ بۆ رازاندنەوەو بردوویانن بۆ ریزی ئەولیاو پەیامبەرانی خودا .

با ئێمەی خوێندەوار قەدر زانی هونەری کوردی ئەو رێزلێنانەی هونەرمەندو زانایانمان بخەینە سەردەمی ژیانیانو ، بە تایبەتی کە تێر تەمەن دەبن ، با نرخی رەوایان بدەینە دەستو دەستی حورمەتو رێزلێنانیان بۆ بە سنگەوە بگرین ، چونکە مردن خۆی لە هەموو ئادەمیزادێك لە کەمین ناوە و چاوەروانی دەفەتو کەلێنێکە لێیەوە پەلامار بداتو ، ئەو کاتەش ئەم دەرفەتەی ئێسامان لەدەست دەچێو هونەرمەندەکانمان لەسەر شانۆی ژیانو دنیای داهێنان نابێنو دەبێ پاش ماوەیەکی دیکە یەکێکی دوورە دەستی نەدیتیو نەناسی بێو لە ژیانو بەرهەمی ئەو زاناو هونەرمەندانە بکۆڵێتەوە ، ئەوجا هەر مەزانە چی لێ بکاو چی پێ بکا ؟ ! لەوانەیە شتی وای بخاتە پاڵ کە هەر بەلاشیەوە نەچووبێو ساڵە رێیەکی لێوە دوور بووبێ ، کەچی ئێستا وا لەبەر چاومان دێنو دەچنو گوێمان لە دەنگو ئاوازو بەرهەمەکانیان دەبێو چمان بوێ لێیان وەردەگرینو ، چمان لێ نەزانینو لێیان بوو بە گرێ لێیان دەپرسین .

کەریم شارەزا
هەولێر : ١٩٨٢/٥/٢٧

**(×)خوالێ خۆشبو ئەحمەدی حمە مەلا باوکی کاك - وریا-ی هونەرمەندە کە ئەندامی هەرە بەناوبانگی تیپی موسیقای باواجی بوو . .روشنبیری نوێ)**

# ئەفجینا لە سلێمانی

**ئەنوەر قادر ڕەشید**



کچە شازادەی (ئەسینا) لەسەر داواکاریی (ئارتیمیس)ی خواوەندی جەنگەڵستان لەپێناوی وڵاتو نەتەوەکەیدا دەکرێ بەقوربانی (!) . (ئارتیمیس) داواکاری خوێنی ئەفجینایە بۆ هەڵکردنی (با) ، تاکەشتییەکانی (ئەسینا) بەرەو تەروادە بجوولێ بەنیازی هێرش بردن ، ئەم بەسەرهاتە بۆ یەکەمجار لە ئەلیادە (٩٠٠ – ٨٠٠ پ ز) ی هۆمیرۆس باس کراوە و پاشان ئەسخیلۆس (٥٢٥ – ٤٥٦ پ ز) لە شانۆگەریی (ئۆریستا) دا [ سێ شانۆگەرییە یەکتر تەواو دەکەن] باسی هەمان بەسەر هات کراوەو سۆفۆکلیس (٤٩٥ – ٤٠٥) لەشانۆگەری ئەلیکترا [خوشکی ئەفجینایە] هەمان بەسەر هات باس دەکا ، پاشان یۆرپێدیس (٤٨٠ – ٤٠٦ پ ز) لەدووشانۆگەریدا بەسەرهاتەکەی کردوە بە ڕووداوێکی سەرەکیو لە (ئەفجینا لە ئۆریس) و (ئەفجینا لە ئۆلیس) دا دیڕشتوە و پاشان ڕاسین لەبەرگی نیوکلاسیدا بە ناوی (ئەفجینا) هەمان شانۆگەریی نووسیوەو هەروەها (گۆتە) ش هەمان بابەتی کردوە بەشانۆگەرییو پاشان هەرخوێنشی کردوویەتی بە ئۆپیرا . جا لێرەدا بە پێویستی دەزانم بەراوردێکی بەم بابەتە بکەین بە پێی میژوو و لەسەر ڕوشنایی ژیانی کۆمەلأیەتی ئەو سەردەمەی تیایدا نوسراوە چونکە وەك بلیخانۆف دەڵێ : (هونەر ئاوێنەی ژیانی کۆمەلأیەتییە) کەواتە داهێنان زادەی کێشەی کۆمەلأیەتییە لەبارو زرووفێکی تایبەتیدا بەپێی ڕادەی بیرکردنەوەو ئەو بەرەیەی هونەرمەند دەگرێتەخۆی وَ ئەمیش بەرگریی لێ دەکا . بۆ ئەم مەبەستەش وای بەچاك دەزانم (زۆر بەکورتی) باسی ئەفجینا بکەین لەو تێکستە یۆنانیانەی باسمان کردن و مەبەستی نووسەرەکەیشی بەپێی قۆناغی میژوویی خۆی شیکەینەوە . تێکستەکان هەموویان شانۆگەریین تەنیا (ئەلیادە)ی هۆمیرۆس نەبێ داستانە .



(جۆرج تۆمسن) له (ئەسخیلۆس و ئەسینا) دا دەڵێ (داستان زادەی یاسای پادشایەتی یە و لەگەڵ هەرەس هێنانی ئەم یاسایە ئەویش رما). جا لێرەدا پێویستە بزانین هۆمیرۆس لە چ کاتێکدا (ئەلیادە) و (ئۆدیسا)ی نووسیوە و بابەتەکانی لە چ قۆناغێك هەڵبژاردوە. سالانی نووسینی ئەلیادە و ئۆدیسا بە (٩٠٠ – ٨٠٠ پ. ز) دا دەنرێ. کاتێ مەترسی ی داگیرکردن رووی کردە یۆنان، ناچار بوون هۆز و تیرەکان یەك کەون و هەموو لەژێر سایەی یەك یاسادا کۆببنەوە و سوپا ئامادە بکەن یاسای پادشایەتیش زادەی ئەم دیاردەیە بوو چونکە هەموو سوپایەك پێویستی بە فەرماندەیەکی سەرکردە هەیە بۆ ئەوەی پەرش و بلاو نەبن و لە کاتی جەنگیشدا بتوانن هەموو پیلانەکان بە رێك و پێکی بەجێ بهێنن. هەر چەندە سەرەك هۆز و تیرەکانیش هەریەکەیان جێ ی دیاری کراوی خۆیان هەبوو. پاشان ئەم یاسایە بە پێ ی پێویست فەرماندەی تری قیادەیی و وەك پلەی پەیژە هەر یەکەی وەکو پادشا وایە لەچاو ئەوی خوار خۆیەوە. ئەمانەش بەپێ ی پێویست هەر یەکەی پیاو (بەیت بێژ)ی تایبەتی ی خۆیان هەبووە کە بەشان و باهوویاندا هەڵبدا و باسی ئازایەتی و پاڵەوانی ی و جوامێریان بکات و، بەتایبەتی ئەو چینەش (چینی ئۆرستۆکراتی ی عەسکری) لە کاروباری بەرهەم هێنان دوورکەوتەوەو بەهۆی داگیرکردن و کوشتارە وە بابەتی هونەری ی داگیرکرد. ئەمەش بووبە هۆی سەرهەڵدانی (داستان). بەلام لەژیانی هۆمیرۆسدا ئەم جەنگ و هێرش و داگیرکردنە کپ بووەوە و یاسای پادشایەتیش بەرەو هەرەس هێنان ملی نا (چونکە ئەم جۆرە یاسا عەسکەریانە ناتوانن لەکاتی ئاشتیدا خۆیان راگرن). بەم شێوەیە کێشەیەکی پیرۆز سەرهەڵدەدا لەکاتێکدا کۆمەڵێك ئارەق دەرێژن و بەرهەم دەهێنن و چەند کەسێك دێنە سەر خوانی ئامادەکراو بەبەرهەمی ماندوبوون و ئارەق ناوچەوانی ئەوانی تر رادەبوێرن. بۆیە دەبینین هۆمیرۆس لە ئەلیادەدا باسی جەنگەکانی رابوردوو دەکا کە داگیرکردنی (تەروادە) یە سالی ١١٨٤ پ. ز لەکاتێکدا سوپای یۆنانی دژی دوژمنێکی دەرەوە دەجەنگا. بۆیە دەبینین لە سروودی نۆیەمی (ئەلیادە) دا وەك تەواوکەری بەشێك بەداستانەکەو وەك کارەساتێکی لاوەکی باسی قوربانی ی (ئەفجینا) دەکاو هەموو داستانەکەش تەرخانکردوە بۆ باسی ئەخیل (ئەکلیز) و ئاگامەمنوون و تواناو بەهرەی خۆی بەکارهێناوە بۆ باسی جەنگەکە (هەرچەندە رایەکی وا هەیە کە هۆمیرۆس ئەلیادە و ئۆدیسای کۆکردوەتەوەو بەلگەشیان بۆ ئەم رایە ئەوەیە کە هۆمیرۆس مانای کۆکەرەوە دەگەیەنێ). کاتێ باسی ئەفجینا دەکرێ زیاتر لەقوربانی یەکەدا رۆشنایی دەخاتە سەر جوامێری ی (ئەخیل) بەرامبەر ئەفجیناو کێشەی خودی ئاگامەمنوون (باوکی ئەفجینا) لە نێوان خۆشەویستی ی کچەکەی و پێویستی ی سەرشانی وەك فەرماندەیەك بۆ بەرێ چوونی کەشتی یەکان، خواوەندەکان داوای خوێن دەکەن، داوای خوێنی ئەفجینا دەکەن ئەمیش وەکو یەکێ لە کۆمەڵ دژی دوژمنێکی دەرەوە دەجەنگێ و هەڵوێست دەسنیشان دەکا (لە قۆناغێکدا کە تاکەکەس بە تەواوی بەکۆمەڵەکەیەوە بەستراوە، کێشەی چینایەتی ناوخۆ زۆر سەرەکی ی نایێ). وەکو لۆکاشیش دەڵێ: (شیعرەکانی هۆمیرۆس باسی خەباتی کۆمەڵ دەکا بەوپەری تواناوە لەرێگەی پەیوەندی تاکەکەس و کۆمەڵەوە). کەواتە ئەفجینا لە (ئەلیادە)ی هۆمیرۆسدا تەرخانکراوە بۆ پیاهەڵدانی پاڵەوانانی جەنگ و هۆمیرۆسیش وەك شاعیرێکی سەر بە چینی ئەرستۆکراتی بەسەر ئازایی و توانای جەنگ گێرانی باو و باپیرانی دا هەڵداوە و پاڵەوانانی شەری تەروادەی کردوە بە بابەتی نووسینەکانی وەك بەسەرکردنەوەو شانازیکردن بە رۆژانی رابوردووەوە.

پاش چەند سەدەیەك ئەسخیلۆس سەری هەڵداوە وەك ترازیدیا نووسێك شەری تەروادەی کردوە بە بابەت بۆ سێ ینەی (ئۆریستا) بەلام بە شێوەیەکی تر.

ئەسخیلۆس لە کاتێکدا ژیاوە کە کۆمەڵ لە قۆناغێکی ئالۆز و پرروداو و بەرەو گۆررانێکی بناغەیی ملی ناوە. لە سالێ (٥٢٥ پ. ز) چاوی هەڵهێناوە، یاسای حوکمرەوایی تاکەکەسی بە چاوی خۆی دیوە و هەر بە چاوی خوێشی رماندنی ئەم یاسایەو هاتنی یاسای دیموکراتی ی دیوەو لە جەنگی ماراسۆن (٤٩٠ پ. ز) و سالامیس (٤٨٠ پ. ز) هاوبەشی ی کردوە. جۆرج تۆمسن دەڵێ: (ئەسخیلۆس یەکێك بووە لەچینی دەرەبەگی ئەتیکی کۆن و نەریتی ئەم چینەی پەیرەوکردوەو ئەو پرسیارەی بەدرێژایی ژیانیشی دەیکرد ئەوە بوو: کۆمەڵگای هۆز و تیرەکان چۆن گۆررا بە شارستانی ی دیموکراتی). کەواتە ئەسخیلۆس خۆی یەکێك بوو لەوانەی هاوبەشی ی هاتنەکایەی ئەو یاسایەیان کردبوو. هونەرمەندیش وەك ئەروندەڵ دەڵێ:

(هونەرمەند زادەی کات و شوێنی خۆیەتی). بۆیە دەبینین خواوەندەکان و لەعنەتی خواوەندەکان بابەتی سەرەکی بوەو کەس نەیتوانیوە بەرەنگاری بێتەوە لەشانۆگەری یەکانیدا. بۆیە دەبینین ئەفجینا لای ئەسخیلۆس لەسەر داواکاری ی (ئارتیمیس)ی خواوەند دەکوژرێ و بەسەرهاتەکەش لەسەر

زمانی کۆرس دەگێڕرێتەوەو کارەساتی ئاگامەمنوونیش پاش گەڕانەوەی لەجەنگ دەگێڕێتەوە بۆ لەعنەتی خواوەندەکان (چونکە پەرستگاکانی تەروادەیان تالان کردووە) . کەواتە پاڵەوانەکانی ئەسخیلۆس چارەنووسی خۆیان دەزانن و دەستەوسانن بەرامبەر ئەو چارەنووسە چونکە لە خواوەندەکانەوەیە .

پاشان سۆفۆکلیس لە کاتێکدا چاوی هەڵهێناوە کە کۆمەڵ کێشەیەکی چینایەتی تیا دەرکەوتووەو یاسای دیموکراتی بوە بە کۆت و زنجیر لە پێی زوربەی هاوڵاتیاندا . کاتێ ژمارەی کۆیلەکان لە پەرەسەندنابوو (پاش ئەوەی هەندێ شوێن داگیر کراو دیلەکانی ئەو جەنگانە کران بەکۆیلە ، کاری سەربەستەکان بەرەوکزیی ڕۆیشت چونکە زوربەی کرێکاری بەشانی کۆیلەکان دەکران ، بۆیە ناچاربوون ئەو بێ ئیش و کارانە بژێن و ئەو کارە گرانەش بخەنە سەرشانی ئەو شوێنانەی داگیریان کردبوو . لێرەدا دەبینین چینی چەوسێنەر ئەمەی بەهەل زانی و تەنانەت هەقی هەڵبژاردنیشی لە هەژارەکان سەندەوەو مانای دیموکراتی بە تەواوی گۆڕرا . سۆفۆکلیسیش وەك یەکێکی سەر بە چینی ئەرستۆکراتی بەرگریی لەچینەکەی خۆی دەکرد و دەبینین جارێکی‌تر پەنای بردەوە بەر پاڵەوانانی (ئەو پاڵەوانانەی چارەنووسی خۆیان دەزانن بەڵام بەردەوام هەوڵیان‌داوە و تا ئەنجام لەگەڵ چارەنووسی خۆیاندا کێش دەکەن) بۆیە دەبینین لە شانۆگەریی (ئەلیکترا) دا باسی خوشکی ئەفجینا دەکا و باسی هەولێ ئەم کیژە دەکا دژی کلیمنتسترای دایکی و (ئۆجیست) ی باوەپیارەی ، پاش ئەوەی ئاگامەمنوونی باوکی دەکوژن . لێرەدا ئەلیکترا سەر بۆ ئەو کەسانە دانانەوێنێ کە باوکیان کوشتوە ، بەڵکو خۆی بەستوەتەوە بە هیوای گەڕانەوەی (ئۆریستیس)ی برای کە تۆڵەی باوکی بکاتەوە . بەڵێ لەناخی‌یەوە بەرگری لەبیروباوەڕی خۆی دەکا و بەرگەی ئێش و ئازارو ئەشکەنجە دەگرێ (کاراکتەرەکانی سۆفۆکلیس ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ دەهێنن لە کاتێکدا کە ناچارن ڕازی‌بن بە زللەی ڕۆژگار . ئازایانە بەرەو ڕووی چارەنووسیان دەبنەوە بەڵام ناتوانن لەدەستی ڕابکەن) . کەواتە سۆفۆکلیس پاڵەوان دێنێتە کایەو بەرەو ڕووی چارەنووسیان دەکاتەوە . لای سۆفۆکلیس سنووری شانۆ بەرینترەو کەمتر دەستیی پەرستگاو جێ‌پەنجەی (دیترامپ)ی سەر بە کۆمەڵگا نهێنی‌یە ئایینی‌یەکانی پێوە دیارە و دەبینین دەوری کۆرس تا ڕادەیەك کەم دەبێتەوە و ژمارەی ئەکتەریش لە دوانەوە دەبێ بەسێ .

پاشان یۆرپێدیس هاتە مەیدانی شانۆ و وەك نووسەرێکی تراژیدیای بەتوانا خۆی چەسپاند و بووبە دوا کەڵە شاعیر تراژیدیای گریك . ئەمیان لە دوو نووسەرەکەی تر جیاوازبوو . ئەمیان لە چینێکی هەژار بوو ، تێکەڵاوی ئەو چینە بوو ، بۆیە لە هەندێ لەو سنوورە لایدا کە بۆ تراژیدیای بەر لە خۆی کێشرابوو . وەك شالدون چینی دەڵێ( . . . **پاشان یۆرپێدیس هات و شۆڕشێکی لە درامای کۆمەڵدا گێڕا . تاکە مرۆڤی هێنایە کایەوە لە جیاتی دەمامکەکانی کۆمەڵ .**) . لەبارەی یۆرپێدیسەوە زۆر وتراوە و بەرهەمەکانیشی شایەتن کە مرۆڤ خولیای سەرەکیی بوە ، بۆیە لەگەلەوە نزیك بوە (**یۆرپێدیس لە لایەنی گەلەوە لە کۆتایی ژیانی و پاش مردنی ، خۆشەویسترین شاعیری گەل بوە .**) . ئەم شاعیرە لەزوربەی بەرهەمەکانی ئەریستۆفانیسی (شاعیری کۆمێدیا) هاوچەرخی خۆی باسی کراوە . (ئەریستۆفانیس دەوری سی‌ی ساڵێك لە یۆرپێدیس منالتر بوە بەڵام ژیانیان لەیەك قۆناغی کۆمەڵایەتیدا بووە) دەبینین لەشانۆگەریی (**ئەرخانی‌یەکان**) و (**بۆقەکان**) و (**دادگای ئافرەتان**) و (**ڕێکەوتن**)دا یوپیدیس باسکراوە . گاڵتە بەکاراکتەری شانۆگەری‌یەکانی یۆرپێدیس دەکا و دەڵێ گوایە هەموویان شەل و کوێر و پیر و نەخۆشن وەکو کچی بچکۆلە لەشانۆگەری ڕیکەوتندا بە تروجایۆس دەڵێ : (ئاگات لە خۆت بێ لە ئاسماندا بەر هیچ نەکەوی ، هەر لێکەوتە بوویت یۆرپێدیس دەتکات بە پاڵەوانی تراژیدیایەك .) . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیوە ئەوەش بشارێتەوە کە چەند یۆرپێدیسی بە دڵ بوە و چەند ڕێزی لێ گرتوە هەر وەك لە هەمان شانۆگەیدا لەسەر زمانی ترۆجابۆسیدا دەڵێ : (بۆنی خوای خۆشەویست باسی لەزەتی میوەی شیرین و بۆن و بەرامەی جەژن و نەریتی دایونیزیا و شیعری سۆفۆکلیس و ڕستەی یۆرپێدیس دەکا) . هەرچی چۆنێك بێت یۆرپێدیس بۆ سەردەمی خۆی نووسیوە و لە مرۆڤ دوواوە بۆیە دەبینین لە کارەساتی ئەفجینا قوربانی‌یەکە دەبێ بە بابەت ، بەڵام لەسەر بناغەی کاراکتەرەکان بنیادی ناوە . کلیمنتسترای دایك تەنیا بیر لەخۆی دەکاتەوەو هەموو هەوڵێکی بۆ تۆڵە سەندنە ، هەروەها ئاگاومنوون دەکەوێتە گێژاوی هەڵبژاردنێکی دژوارەوە لە نێوان پەسەندکردن و بەجێ هێنانی داواکاری ئارتیمیس خواوەند و خۆشەویستیی ئەفجینای کچی (لێرەدا بابەتی ئەفجینا و ئوسلووبی یۆرپێدیس لە ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس جیا دەکرێتەوە) مەسەلەی کوشتنی ئەفجینا لەلایەن خواوەندەکانەوە بڕیار نەدراوە و چارەنووسی ئەفجینا بە دەست خواوەندەکانەوە

نی‌یه ، بەڵکو هەڵبژاردنی چارەنووسەکە وا لەدەست ئاگامەمنوونی باوکیدا . کەواتە ئاگامەمنون بۆی هەیە کچەکەی بکات بە قوربانی‌ی و دەتوانیٚ لەمردنیش رزگاری بکا . کێشەکەش لەسەر ئەو بناغەیە بنیاد دەنریٚ **لە نێوان مرۆڤ‌و مرۆڤدا** (نەك مرۆڤ وچارەنووسێك کە خواوەندەکان لەسەرەتاوە دەسنیشانیان کردبێت) . ئاگامەمنون نایەویٚ بریاری کوشتنی ئەفجینا بدات ، بەڵام کاتیٚ بریار دەدا لەبەر ئەوە نی‌یە ولاٚتەکەی زۆر خۆش دەویٚ یان بیەویٚ پارێزگاری و بەرگری لە نیشتمانەکەی بکا ، بەڵکو لەترسی ئەوەیە نەك سوپاکەی لی‌ی هەڵگەرێنەوە و خەڵکەکەش وای دانێن شایستەی ئەوە نی‌یە بکریٚ بە پادشا و سەرەك فەرماندەی سوپا . کەواتە لە پایەو کورسی‌یەکەی خۆی دەترسیٚ نەك لەدەستی‌ی بچیٚ . بۆیە دەنێریٚ بەشوێن ئەفجینادا بەو ناوەوەی گوایە لە (ئەکلیز)ی مارە دەکا ، لەملاشەوە ئەفجینا بەو پەری بەختیاری‌یەوە بەرگی بووکی‌ی دەپۆشیٚ دیٚ بۆ ئۆلیس بەو نیازەی بەهاوسەری ژیانی شادبیٚ ، بەڵام کاتیٚ دەگاتە ئۆلیس ئەو هەواڵە ترسناك و جەرگ‌بڕە دەبیستیٚ . وەکو دەزانین ئەفجینا کچە گەورەی ئاگامەمنونە لە کلیمنسترا (کلیمنتستراش کێشەریەکی کۆن و رق‌وکینەیەکی کۆنی لەگەڵ ئاگامەمنون هەیە .) ئاگامەمنوون دەیەویٚ جەرگی کلیمنتسترا ببریٚ و جارێکی تریش جەرگی بسووتێنێتەوە (جاری پێشوو کۆرپەکەی لە باوەشیدا دەرهێناوە و داوێنی بە تاوێرە بەرددا و کوشتوویەتی ) وا ئەمجارەش خوێنی کچە گەورەکەی دەرێژیٚ (ئەفجینای کچی هەردووکیان) . کێشە دەست پیٚ دەکا ئاگا مەمنوون لەگەڵ ناخی خۆی و لەگەڵ سوپاکەی دەوروپشتی‌و لەگەڵ کلیمنتسترا و لەگەڵ ئەفجینا و تەنانەت لەگەڵ (ئەکلیز)ی فەرماندەش .

ئەم کارەساتەش لەسەر خواستی (ئارتیمیس)ی خواوەندی جەنگەڵستانە . داوای خوێنی ئەفجینا دەکا بۆ ئەوەی (با) هەڵکاو کەشتی‌یەکانی سوپا بکەونە ریٚ بەرەو **(تەرواده)** . ئەم کێشەیە بەردەوامە تا ئەفجینا کۆتایی پیٚ دێنیٚ بەوەی ئامادەیە گیانی خۆی بەخت بکا لە ری‌ی نیشتماندا و سوورە لەسەر ئەوەی خوێنی خۆی لەسەر قەسانجانەی پەرستگا برێژیٚ و خواستی (ئارتیمیس)ی خواوەند بەجیٚ بهێنیٚ . لێرەدا جارێکی‌تر ئوسلووبی تایبەتی یۆرپێدیس دەبینین بەرووداوی (موعجیزە)یەك لە کۆتاییدا ، ئەویش بە هەڵبرینی ئەفجینا بۆ ئاسمان لەلایەن خواوەندەکانەوە و سەربرینی ئاسکێك لە پەرستگا لە جیاتی ئەفجینا . ئەگەر بەوردی بروانینە کۆتایی ئەم تراژیدیایە دەبنین ژیانی ئەفجینا **(وەك مرۆڤێك)** گرنگەبەلای یۆرپێدیسەوە بۆیە نایەویٚ بکوژریٚ و لەو کۆتایی‌یە جەرگ برە رزگاری دەکا . ئەم کارەش بۆ یۆرپێدیس سەری گرتوە چونکە لەو قۆناغەدا چاوەری‌ی موجیزەیەك کراوە کە کۆمەڵ لە کۆت وزنجیری ئەو یاسا هەرەس هێناوە رزگاربکا . (بەلاٚم دەبنین لای **راسین** لەشانۆگەری ئەفجینادا کۆتایی بە موجیزە نایەت چونکە لەو قۆناغەی ئەفجینای راسین تیانوسراوە ١٦٧٤ ز . دانیشتوانی فەرەنسا باوەریان بەوجۆرە موجیزانە نەبووە بۆیە بەر لە کوشتنی ئەفجینا بۆیان دەردەکەویٚ کە هێلانە (ئەو ئافرەتەی فرێنراوە و بوە بەهوی جەنگی تەرواده) کچێکی لە مێردە تازەکەی بوە و ناوی ناوە ئەفجیناو خواوەندی جەنگلستانیش خوێنی ئەو ئەفجینایەی داوا کردوە ، بەم جۆرە ئەکلیز و ئەفجینا و ئاگامەمنون و کلیمنتسترا بەیەك شاد دەبنەوە و ئەفجینای کچی هیلاٚنە دەکریٚ بە قوربانی) بەمجۆرە دەبینین یۆرپێدیس بەراستی‌ی نزیکترین تراژیدیا نووسی رێبازی کلاسی‌ی کۆنە لە بینەری ئەمرۆوە .

دەروانین (ئەفجینا لە ئۆلیس) مەرجە بناغەیی‌یەکانی رێبازی کلاسی‌ی لای نەداوە و وەك بابەتیش بەپی‌ی ئەو قۆناغەی یۆرپێدیس تیایدا ژیاوە و ژیانی کۆمەڵگای ئەوکاتە بابەتی هاوچەرخ بووە و بەرگری لە زۆرترین بەشی کومەڵ کردوە و بابەتەکەی لە واقیعی ئەوکاتەوە نزیك بووە مانای لاسایی کردنەوەی واقیع بووە و هەر لەو سنوورەدا بووە کە **ئەریستۆ** پاشان خستی‌یە قالبی لێکۆڵینەوە و دەڵیٚ **لاسایی کردنەوەی واقیع** (محاکاتی واقیع) ئەوەیە باسی رووداوێك بکریٚ رووی دابیٚ یان لە کات و شوێنێکی دیاری کراودا روویدا .

دەبینین رووداوی سەرەکی‌ی کێشەی بناغەیی‌یە و هیچ کێشەیەکی لاوەکی لە مەسەلە بنەرەتی‌یەکە کەم ناکاتەوە مانای کێشەی لاوەکیش لە خزمەتی کێشە سەرەکی‌یەکە دایە . هەروەها مادەی **کۆمیدی** هیچ تیادا نی‌یە و رووداو و بینراوی کوشتار و سەربرین ئازاردان لەسەر شانۆ نابینریٚ .پاشان یەکسانی‌ی کات وشوێنی تیادایە . رووداوەکە لەیەك شوێندا باس دەکریٚ و لە هەمان شوێندا دەگێردرێتەوە و رووداو ناچێتە هیچ جی‌یەکی تر . ئەوەی لە دەرەوەی شوێنەکەش روودەدات پیشان نادریٚ بەڵکو دەگێردرێتەوە لەلایەن کۆرس‌و کاراکتەرەکانەوە هەروەها کارەساتەکەش لە بیست و چوار سات تێپەر ناکات . هەروەها مەسەلەی سەرەتا و ناوەراست‌و کۆتایی لە کێشەکەدا راچاوکراوە . لەلایەکی ترەوە کورس دەوری خوی دەبینیٚ هەرچەندە لای یۆرپێدیس دەوری کەمترە

ـە کۆرسی تراژیدیا نووسەکانی تر لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەوری خۆی ماوە .

**لایەنی هونەری‌ی**

کاتێ باسی شانۆگەری‌ی ئەفجینا دەکەین پێویستە بەشێوەیەکی تایبەتی باسی بکەین ، چونکە لە لایەکەوە بەرهەمەکە بەرهەمێکی ئەکادیمی‌یەو لە پەیمانگای هونەرە جوانەکاندا دەخوێنرێ وەك نموونەیەك لە شانۆی کلاسی‌ی کۆنو ، لەلایەکی تریشەوە بۆ جەماوەرێکی تایبەتی پێشکەش دەکرێ وەك بەرهەمێکی هونەری‌ی **(تاك لایەن)** مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ (هەرچەندە جێ پەنجەی دەرهێنەر لەسەر رووداوەکان دیار دەبێ) . هەرچۆنێك بێت **(ئەحمەد سالار)ی** هونەرمەند خۆی لە قەرەی بەرهەمێك داوە کەم هونەرمەند دەتوانێ لی‌ی نزیك بکەوێتەوە .

ئەفجینا لە ئۆلیس)وەك مەنهەجێکی دیاری‌کراوی پەیمانگا هەڵبژێرراوە و یۆرپێدیسیش نزیکترین تراژیدی نوسی گریکە لە بینەری هاوچەرخەوە ، جیاوازیشی لەگەڵ هاوچەرخەکانی خوی ئەوە بووە کارکتەرەکانی لە ناوجەرگەی گەلەوە لە خەڵکی ئاسایی هەڵبژاردوە و وەکو وتراوە **(ئەسخیلۆس لەسەر خواوەندەکانی نوسیوە و سۆفۆکلیس لەسەر پاڵەوانان و یۆرپێدیس (سەر مرۆڤ)** . هەروەها وتراوە **(من شیعری ئەسخیلۆس بەخوێنمەوە و یۆرپێدیس دەبینم)** . کەواتە یۆرپێدیس نزیك بووە لە گەلەوەو زانیویەتی چۆن بابەتەکانی لە نزیك گەلەوە هەڵدەبژێرێ . لێرەدا جۆری دەرهێنانیش دەگۆرێ . چونکە کاراکتەرەکان خەڵکی ئاساین ، لەبەر ئەوە پێویست بە دەماملو دەنگی قەبەو پێلاوی بەرزناکا . پێویست بە زمانی ئەدەبی تایبەتی‌ی ناکات لە خەڵکی ئاسایی جیا بکاتەوە . هەروەها لە نهێنی‌یە ئایینی‌یەکانەوە دوورکەوتووەتەوە بۆیە دەوری کۆرس بەشێوەی ئەسخیلۆس و تەنانەت سۆفۆکلیسیش نامێنێ و کەمتر دەبێتەوە چونکە پێویست بە روونکرنەوەی رەمز و نهێنی ناکات و بابەت بابەتی کۆمەڵگا ئایینی‌یەکانی نی‌یە بەڵکو گێروگرفت و بابەتی ئاسایی‌یە لەناو کۆمەڵدا .

لێرەدا دەمەوێ ئەوراستی‌یە بڵێم کە تراژیدیای گریکی کۆن تا نەخوێنرێتەوە نازانرێ کە بەرهەمهێنان خستنە سەرشانۆی چەند کارێکی قورس و ئاڵۆزە بۆ شانۆی هاوچەرخ وکارکردنەسەر بینەری ئەمرۆ چونکە هەموو دەزانین (ئەفجینا لە ئۆلیس)دووهەزار و چوارسەد ساڵ لەمەوبەر نوسراوە و رێبازی کلاسی‌ی کۆنیش جۆرە سنوورو بناغەی بۆ دەسنیشان کراوە لەگەڵ کات و شوێنی بەرهەمەکەدا بگونجێ .لەگەڵ نەریت و بەپی‌ی جوری ژیانی کۆمەڵگای ئەوکاتە . بۆیە دەبینین لە سی‌کەس زیاتر نابێ لە دەمەتەقێدا لەیەك کاتدا هاوبەش‌ی بکەن ، ئەمەش وای کردوە کە دەمەتەقێکان زور دوور و درێژبن ، تەنانەت لەکاتی خوێندنەوەشدا خوێنەر لی‌ی بێزار دەبێ چجای بینینی‌ی لەسەر شانۆ . لەگەڵ ئەوەشدا (ئەحمەد سالار) شێوە ئیقاعێکی دۆزیبووەوە بۆ ئیلقا و هەڵس وکەوتی ئەکتەرەکان بەو پەری ئاسایی و ساکاری دەمەتەقێکان دەبیستران ، نەك هەر بینەری بێزار نەدەکرد ، بەڵکو کارێکی وای کردبرو بینەر نەیدەویست تەنیا یەك وشەی لە دەمەتەقێکان لەکیس بچی و ئەم کارە قەشەنگەش هۆڵی شانۆکەی وا بێ دەنگ کردبوو هەر بینەرە وابزانێ خۆی بەتەنیا دانیشتوە و تەماشای بەسەرهاتێکی خۆی دەکات و بیرەوەری‌یەکی کۆنی خۆی بەبیر دەهێنێتەوە . لێرەدا نابێ ئەوەش لەیادبکەین کە ئەکتەرەکانی هەموویان قوتابین لە پەیمانگا و تاقیکرنەوەی هونەری‌یان نی‌یە لەگەڵ ئەوەشدا ئەحمەد سالاری هونەرمەند هەموو بەرهرەو توانای شارراوەیانی تەقاندبووەوە و بەشێویەکی زور سادەوساکار و نەرم دەورەکانیان دەدی .

بە ئاشکرا دیارە کە ئەحمەد سالار بەرهەمێکی کلاسی‌ی کۆنی (وەك دەقێك) هێناوە و لەروانگەیەکی هاوچەرخەوە تی‌ی روانیوەو نەیویستووە کت‌ومت وەك گریکی کۆن پێشکەشی بکا ، ئەمەشیان دەگەرێتەوە بۆ هەندێ هۆی کۆمەڵایەتی (جۆری ژیان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی) ر سایکۆلۆژی‌ی بینەری ئەمرۆ و گۆررانی هەیکەلی شانۆ و پەیدابوونی هۆڵ و بینین لە دیواری چوارەمەوە . ئەگەر بگەرێتەوە بۆ جۆری شانۆی گریك دەبنیین بەشێوەیەکی خڕ دروست کراوە و بینەریش لە سی‌لاوە بەدەوروپشتیا لەسەر پلیکانە دانیشتوون و ئۆرکیستراو سەکۆی قوربانیش لە ناوەاستدا بوە ، رووناکی لەتیشکی رۆژەوە وەرگیراوە و مەیدانی شانۆ سەری نەگیراوە . ئەمە وای کردوە کە پێشکەشکردنی ئەو تراژیدیایانە بەشێوەیەك بێت مۆرکی ئاین و میهرەجانە میللی‌یە ئایینی‌یەکانی پێوە بێت . ئەم کارەش لەهۆڵی شانوی ئێستادا ئەنجام نادرێ . بۆیە ئەحمەد سالار پەنای بردوەتە بەر خەیاڵی هونەرمەندانەو بەهرەی شاعیرانەی خۆی بۆ تەفسیری شانۆگەری‌یەکەو بەهۆی ئیقاعێکی هارمۆتی‌ی زانایانەو لە روانگەیەکی هاوچەرخەوە بەتەواوی توانیبووی بەرهەمەکە لە

بینەری ئەم سەردەمە نزیك بکات وە . بەتایبەتی بەهۆی هەڵس‌وکەوت و جووڵاندنی کۆرس و ئەکتەرەکانەوە ، هەرگیز هەست بەوە نەدەکرا شانۆ چۆڵ بێ تەنانەت لەو کاتانەشدا کە تەنیا کەسێك لەسەر شانۆ بوو چونکە لەبەرهەمەکەدا بایەخی دابوو بە تەرازووی شانۆ و هەوڵی تەواوی دابوو شانۆ لەبەر چاوی بینەر لاسەنگ نەبێ و بینەر لەگەڵ رووداو و هەڵوێستەکاندا بژی . دەبینین کاتێ ئەکتەرێك دەیوا ، بەرامبەرەکەی هەڵس‌وکەوتێکی ئەوتۆی نەدەکرد سەرنجی بینەر رابکێشێ‌و لە رووداوەکەی دوور بخاتەوە ، هەروەها سەری خوی قاڵ نەکردوە بەشتی لاوەکی و زیادەوە لەسەر شانۆ . بەڵکو بەشێوەیەکی هونەری و بەوپەری سادەیی گەیشتوەتە مەبەست مەسەلەی **کاثارسیس** (خاوێن کردنەوە) لە رێی **بەزەیی** و **ترسەوە** زۆر مەسەلەیەکی بنەرەتی‌یە لە تراژیدیای کلاسیدا . ئەم مەبەستەش لای ئەحمەد سەلار راچاو کرابور ، بەئاشکرا کارەحاتی ئاگاممنون و ئەفجینا گەورەکرابوو بەشێوەیك کار بکاتە سەر هەست و سۆزی بینەر و بەزەیی پیایاندا بێت وە و لەو جۆرە کارەساتانە بترسێ و بەم شێوەیە گیروگرفت‌و کارەساتی رۆژانەی خۆی لا بچووك بیێتەوە . ئەمەش کارێکی ئاسان نی‌یە لە شانۆی هاوچەرخدا بۆ بینەری ئەمرۆ بە هۆی بابەتێکی کۆنەوە .

کۆرس خۆی لە خۆیدا لای یۆرپیدیس بایەخی کەم بووەتەوە ئەگەر لەگەڵ ئەسخیلۆس و سۆعۆکلیس بەراوردی بکەین) و ئەو دەورە سەرەکی‌یە نابینێ کە بۆی دەسنیشان کراوە بۆیە دەبینین ئەحمەد سالار بەوپەری تواناوە تەشکیلاتی لێ دروست کردوە و لە زور هەڵوێست و بیزاودا کراون بە تەواوکەری دیکۆر تا هێڵی رووداوەکە لای بینەر تێك نەچێ‌و لەسەر یەك وەتیرە بروا . هەر وەکو وتمان لە هۆڵی شانوی ئێستادا ناتوانرێ تراژیدیای کلاسی‌ی کۆن وەکو خۆی پێشکەش بکرێ ، چونکە ئۆرکیسترا و سەکۆی قوربالی‌ی (مذبح) لە شانۆی ئەمرۆدا ساز ناکرێ بەو ئاسانی‌یە .

بەلام بەگشتی‌ی بەهۆی دەقەکەوە بەهۆی هەڵس وکەوتی کلاسی‌ی ئەکتەرەکانەوە (هەڵس وکەوت لە شانوی کلاسیدا موبالەغەی تەواوی پێوەیە) توانیبووی بەتەواوی شانۆی کلاسی‌ی پێشکەش بکا و مەرجە سەرەکی و بناغەیی‌یەکانی بە بینەر بنهسێنێ .

ئەگەر بە ووردی بروانینە ئەکتەرەکان دەبینین شوین پەنجەی ئەحمەد سالاریان پێوە دیارە . ئەمەش لەم بەرهەمەدا بەکەك وکووری دانانرێ چونکە ئەکتەرەکان هەموویان قوتابی پەیمانگاو تاقیکردنەوەیەکی ئەوتۆیان نی‌یە کە بتوانن بێ یارم تی جێ پێ‌ی خۆیان بکەنەوە لەگەڵ ئەوەشدا داهێنانێکی ئاشکرا لەدەورەکانیاندا دیاربوو بەشێوەیەك کەکەم لەرە چاکتر چاوەروان دەکرا . لەنگی لەدەوری هیچیانیا بەدی ن دەکرا .

بۆنموونە کلیمنتسترا (نەرمین قادر) لەدەورەکەیدا سەلمایندی کە بەرلەخۆی هیچ ئافرەتێکی کورد نەیتوانیوە لەسەر شانو بەو توانای دەنگ‌و لەشەو بەو شێوە قەشەنگە دەور ببینێ بەتایبەتی ئەو دەورە ئاڵۆزە قورسە کەجارێ پەنا دەباتە بەر هەرەشەو جارێك پارانەوەو جارێ پاکانە و جارێ زەردەنەنەو جارێ فرمێسك لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەك دەورەکەی دەدی کە بەراستی ئومێدی پاشە رۆژێکی زۆر رۆشن‌و پرشنگداری لێ‌دەکری . پێشرەو عەباس (مینالاوس) ئەمیش لە چەند هەڵوێستێکی ووردا توانایی خۆی سەلماند ئەوەی لەسەرشانی بەوپ ری تواناو رێك‌وپێکی‌یەوە بەجێ‌ی هێنا . هەروەها ئاراس طیب (ئاگاممنون) وەکو ئەوانی تر دەورەکەی خۆی بەتەواوی دی تەنیا دەنگی نەبێ ، ئەویش نەك خراپ بوو بەلام بەتەواوی ووشەکانی لەیەك جیا نەدەکرانەوە و دانی تەواوی پیا نەدەنان بەتایبەتی سەرەتایی شانۆگەرەیەکەش بەگفت‌وگۆی . ئەو دەست پێ‌دەکاو بینەر هیچ لە شەنۆگەری‌یەکە نازانێ بۆیە پێویست بور ئیلتای لەوە بەهێز ترو روونتر بوایە چونکە حەرەتایی شانۆگەری پێویستی‌ی بە هەول‌و تەقەلای زۆر زۆرە ، ئەمەش مانای ئەوە نی‌یە –ئاراس)سەر نەکەوتێ لەدەورەکەیدا بەڵکو بە پێچەوالەوە دەورەکەی خۆی زۆر بەرێك وپێکی دی و جێ‌پێ‌ی خۆی لە شانۆی کوردیدا کردوە تەنیا ئەوەندە هەیە ئەگ ر ئەو تۆزە لاوازیەش چارەسەر بکردایە ئەوە ئیتر دەورەکەی تەواو ناياب دەبوو . هەروەها شەفیق حەمەو لەدەوری ئەکلیذ (ئەخیل)دا بە توانایەکی هونەرمەندانە خۆی چەسپاندو دەوری ئەکلیزی بەپێ‌ی پێوست دی .

بەیان رەشید (ئەفجینا) بەوپەری سادەو ساکاری وەك فریشتەیەك لەکۆتایی ژیانیدا یان کۆترێکی باڵ شکاو کە چاورێ‌ی . راوکەر بکا بگاتە سەری‌و سەری ببرێ .

چووبوونە قالبی ئەفتینای ناسك‌و نازدارو تەواو سەرنجی بینەری راکێشابوو هونەرمەندانی تر بەتەواوی چووبوونە قالبی دورەکانیان بەهرەو توانای هونەری‌ی خۆیان سەلماندن . بێگومان بەشدارانی کۆرسیش هەریەکەیان لەجێ‌ی خۆیەوە هەڵسابە

ێویستی سەرشانی خۆی لێرەیا هیوادارم ئەم پیاهەڵدانو ستایشە ەنێ بە هۆی کوژاندنەوەی بەهرەی هونەریان بەڵکو زیاتر هەوڵ ەن لەو رێیەوە بەردەوام بنو هەمیشە بەرەو پێشەوە برۆن چونکە لە خۆبایی بوون هۆیەکی سەرەکی یە بۆ بیرچوونەوەی هونەرمەندانو هونەری نواندیش پێویستی ی زۆری بە رۆشنبیری گشت لایەنی هەیەو رۆشنبیریش سنووری بۆنی یە بۆیە نواندیش ترۆیکی نی یەو چەند هەوڵ بدەیت هێشتا کەمەو ە ر رێی دوورت لەبەردایە .

هونەری شانۆ کارێکی مەزنە تەلیا ب یەك هونەرمەند ئەنجام نادرێ بەڵکو پێویستە هەموو بەشداران لەبابەتەکە تێبگەن و لەناو خۆشیاندا لەیەکتر تێبگەنو بەکۆششی هەموو لایەك بگەنە ئامانج . لەم بەرهەمەدا دەبینین ئازاد جەلالی هونەرمەند دیکۆری کێشاوە . لەراستیدا ئەم کارە زیاتر لە هونەرمەندی تەشکیلیو میعکاری یەوە نزیکە بەلام بەداخەوە دەلێم لە شانۆی کوردیدا هونەرمەندانی تەشکیل ومیعماری ئەوەندە شارەزاییان لەشانۆدا نی یە کە بتوانن ئەو کارە بەتەواوی ئەنجام بدەن بۆیە هونەرمەنی ناچار دەبێ پەنا بەرێتە بەر هونەرمەندی شانۆ چونکە ء میان زیاتر شارەزایی لە رێبازەکانی شانۆدا ە یەو دەزانێ بەك شێوەیەك دیکۆر دەلەخشێنێ کە لەگەڵ کاتو شوێنو تەنانەت بابەتی شانۆگەرەیەکەشدا بگونجێ لەگەڵ دیکۆری پانی ر بەرزی و تەنانەت رەنگەکانیش پێویستە لە خزمەتی بەرهەمەکەدابێ . لەك بەرە مەشدا **ئازاد جەلالی** هونەرمەند توانیویەتی دیکۆرێك بکێشێ کە لەگەڵ روو داوی شانۆگەری یەکەو هەڵس و کەوتی ئەکتەرەکانو تەشکیلاتی کۆرس دا ئاوازێکی هارمۆنی قەشەنگ بنەخشێنێ ئەنجامی کارەکە لە بینەر نزیکتر بخاتەوە وپاڵ پشتێك بێت بۆ لایەنەکانی تری بەرهەمەکە .

دەبنین مۆسیقاو ئاواز لەبەرهەمەکەدا توانیبووی هەستو سۆزی بینەران بخرۆشێنێو یاریدەی بەشەکانی تری شانۆگەریەکە بدات ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا (ئەنو ر قەرەداغی) هونەرمەند هەندێ لایەنی گرنگی لە شانۆی کلاسی ی کۆن راچاو نەکرد بوو بەتایبەتی ئەو ئاوازانەی بۆ کۆرس دانرابوون .

لە شانۆی گریکی کۆن دا سێ جۆر سروود هەبووە کە کۆرس د چێتە ئۆرکحتراوە دەیلێنەوە پێی دەوتریت 'بارۆ دۆس) دوەمیان کاتێ هەریەکەیان جێی خۆیان دەگرن ئەمیشیان پێی دەوترێت (ستاتسیمۆن) ئەوی سێیەمیان کاتێك دەبێ کە کارەساتەکە دەست پێیەکاو ئیقاعەکەش وەك سنگ کوتان وایە پێی دەوترێ (کۆمۆس) . لێرەدا من نامەوێ بڵێم ئەنوەر کەمتەرخەمی کردوە لە مۆسیقاو ئاوازی شانوگەری یەکەدا بەلام ئەوەندە هەیە کە دەبوو لە کاتێکدا کێشەکە بەهێز دەبێو دەگاتە ترۆپك ئیقاعی ئاوازەکەش بگۆرزرایەو لەگەڵ رووداوەکە شان بەشان برۆیشتایە هەروەها مۆسیقاش لە شانوی کلاسیدا پێویستە موبالەغە لەهێزو زەبری ئیقاعدا هەبێ وەك چۆن لەگەڵ هەڵسوکەوتدا هەیە ؛ ئەمە تەنیا لەبەر ئەوەیە کە بەرە مەکە زیاتر لەرێبازی کلاسی یەوە نزیك بکاتەوە و سیماو خێوەی ریبازەکە ئاشکرا ترێ چونکە وەکو لەسەرەتاوە وتمان ئەك شانۆگەری یە بەرهەمیێکی ئەکادیمی یەو زیاتر بۆ قوتابیان پێشکەش دەکرێ بەو نیازەی لەو رێبازەی تێبگات . بۆیە مامەڵەی بەرهەمی تێیکی هونەری ی لەگەڵدا ناکرێ .

ئەمەش وا ناگەیەنێ کە (ئەنوەر قەرداغی) سەرکەوتوو نەبووبێ ، بەڵکو خۆی هیلاك کردوەو توهنیویە رووداوەکە لەبینەرەوە نزیك بخاتەوە تەنیا ئەوەندە هەیە حیای شانۆی کلاسی ی کۆنی ون کردوە .

بەدیعە دارتاشی هونەرمەندیش جلوبەرگی کاراکتەرەکانی هەڵبژاردوەو توانیویە شان بەشانی لایەنەکانی تری بەرهەکەکە برواو ئاشکرای پەنای بردۆتە بەر زۆر وێنەی نەخشێنراوی ئەو سەردەمەو لاپەرەو دێری زۆر کتێبی تەی کردو تاگەیشتووەتە ئەنجام .

ئارایشتی ئەکتەرەکان لەلای ن هونەرمەند حیکمەت هندی یەوە ئەنجام درابوو . وەك هەمووماں دەزانین حیکمەت شارەزایی یەکی تەواوی لەم لایەنە هەیەو لەزۆر بەرهەمی تریشدا سەلماندوویەتی کە توانای تەواوی بەسەر ئارایشی شانۆدا دەشکێو بەتایبەتی کەڵکی لە تاقیکردنەوەکانی پێشووشی وەرگرتوە وخۆی وەك هونەرمەندێکی تەشکیلی نزیکە لەمەسەلەی دروست کردنی سێبەر و رووناکی و بەرزی نزمیو لەلەیەکی تریخەوە وەك ئەکتەرێك شارەزایی لە شانۆدا هەیە بۆیە توانیووی کاراکتەرەکان بەپێی پێویست ئارایشت بکات .

لە کۆتاییدا دەمەوێ تێبینی یەکی بچووك بدەم دەربارەی دوا بینراو کاتێ باسی پەرستگا دەکرێ . لای ئەحمەد سالار بە تەداعی دەگەرایەوە پەرستگا و لەسەر زاری کاراکتەرەکان رووداوەکەی دوویات دەکردەوە ، ئەمەش لەگەڵ ریبازی کلاسیدا ناگونجێ چونکە وەك لەسەرەتاوە باسمان کرد یەکسانی جێگا (وحدة المکان) یەکێکە لە مەرجەکانی ئەو رێبازە .

ئیتر هەر ئەوەندە دەتوانم پیرۆزبایی یەکی گەرم لەبەشدارانی بەرهەمەکە بکەمو هیوای پاشە رۆژێکی پرشنگداریان بۆ بخوازم .

# بانگەوازێك «بۆ هونەرمەندان و هونەردۆستانی کورد»

وریا أحمد

**هیچ کەسێك نیە لە ئێمە کەم تا زۆر نرخ و گرنگیی فۆلکلۆر نەزانێ .**

**ئەوەی جێگای شادمانیانە . . ئەدیبانی میللەتەکەمان ماوەیەکی باشە دەستیان کردووە بە کۆکردنەوەی بابەتە هەمەچەشنەکانی ئەدەبی فۆلکلۆریمان ، وەکو – مەتەڵ – پەندی پێشینان – بەیت – هەڵبەستی فۆلکلوری (گۆرانی – سەرگوزەشتە – داستان (مەم و زین – خەج و سیامند . . هتد) .**

**وە ئەوەی زانراوە ئەم بابەتە فۆلکلۆرییە ئەدەبییە هەمەچەشنانە پەردەمان بۆ لەسەر زۆر لایەنی تاریکی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و روشنبیری میللەتەکەمان هەڵدەداتەوە ، بە** نمونە روونکردنەوەکەی دکتۆرە (شکریە رەسول) کە لە ۲۰/۳/۱۹۸۰ پێشکەشی کرد لە هولی ئیبنی میستوفی) بەبۆنەی مهرەجانی یەکەمی رەوەشنبیری کوردی لە هەولێر . خوشکی ناوبراو توانی روونا کی بخاتە سەر واقعی ژیانی میللەتی کوردمان لە تورکیا بەهۆی هەندێ بەیت و هەڵبەستی فۆلکلۆری .

ئەوەی من بیزانم ئەدیبە خوشەویستەکانمان زۆر باشتر لە هونەرمەندان لە نرخی ئەدەبی فۆلکلۆری گەییون ، بۆیە هەروەکو لەسەر لاپەرەی رۆژنامەو گۆڤارەکان دەیخوێنینەوە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان‌دا ئەدیبەکان خەریکی کۆکردنەوەن .

دوای ئەم پێشەکییە منیش وەك هونەرمەندێکی کورد لە ناو قولأیی ناخمەوە هەست بە رۆیشتنی خێرای کات دەکەم ، وئەم کارەش بە رای من زەرەری زۆری تێدایە بۆ هونەری گۆرانی و مۆسیقای فۆلکلۆری کوردیمان ، چۆن ؟

– دوای ئەوەی لەگەڵ هەندێ هونەرمەندی کورد دانیشتم و ، چووم بۆ بەغدا وە چاوم کەوت بە هەندێ برا هونەرمەندی عەرەب کە خولی راهێنانیان لە دەرەوەی وولأت دیوە وەکو مامۆستایان (حسین قدوری – أسعد محمد علي) گەیشتمە ئەم قەناعەتە کە . . پێویستە بەڵکو شتێکی زۆر زەرورە ئێمەش «هونەرمەندانی کورد» دەست‌کەینە کۆکردنەوەی گۆرانی و مۆسیقای فۆلکلۆریمان . ئەم مەسەلەیەش تەنیا بە یەك تاکە کەس یاخود بە چەند کەسانێك ئەنجام نادرێت ، وە من رام وایە ئەم ئەرکە دەزگا میرییەکان بیگرنە ئەستۆی خۆیان ، وەکو «ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان – ئێزگەی رادیۆی کوردی – نەقابەی هونەرمەندان» .

ئەم کارە پێویستی بە زۆر شت هەیە وەك ناردنی هونەرمەندان بۆ دەرەوە ، تەئمین‌کردنی ئیجازە بۆیان «چونکە هەر یەکە لە شوێنێك کاردەکەن» ئوتۆمۆبیل و کەرەستەی تۆمارکردن . . هتد ، بۆ هاندانیان .

کۆکردنەوەی هەڵبەستی فۆلکلۆری بێ ئاواز کارێکی ناتەواوە

وە من گەیشتمە ئەنجامێك کە هەر هونەرمەندێك دەتوانێ بە ماوەی چەند ساڵێك گۆرانی‌ی یەك ناوچە (بۆ نموونە گوندێك) و گوندەکانی دەوروبەری کۆبکاتەوە ، ژنە پرۆفیسۆرێکی ئینگلیزی ماوەی ساڵ‌و نیوێك لە گوندێکی میصری ژیاو هەموو کارێکی رۆژانەی لەگەڵ ئاوایی گوندەکە ئەنجامدەدا ، ئەوجا توانی تەنیا گۆرانیەکانی فۆلکلۆری زەماوەند لەم ناوچەیە بکا بە پەرتوکێك . کچە کوردەکەی سۆڤیەت (جمیلە جلیل) هەڵگری بروانامەی (ماجستێر) بە ماوەی حەوت ساڵ توانی تەنیا دوو پەرتووك دەربکات لە نۆتەو هەڵبەستی گۆرانی‌ی فۆلکلۆری کوردی سۆڤیەتی !

ئەم نموونانەم بۆ ئەوە هێنایەوە کە تێبگەین کارەکە ئاسان نی‌یە بەڵکو زۆریش زەحمەتە . بەڵام لەم واقعەی ئێستای میللەتی ئێمە کە دەبێ پی‌ی لێبنێین زۆر دواکەوتووین لەچاو میللەتانی پێشکەوتوو . جا لەبەر ئەو هۆیە وە بۆئەوەی فریای هونەری گۆرانی‌و مۆسیقای فۆلکلۆریمان بکەوین بەم توانایەی ئێستا هەمانە . بۆیە داوا کارییەکەم هەر بۆ هونەرمەندان نی‌یە بەڵکو بۆ هونەر دۆستانیشە ، با ئێمە بە هەموو لایەك گۆرانیەکان کۆبکەینەوە ، با جارێ بە نۆتە نەبێ بەڵکو بە کاسێت لەگەڵ هەڵبەستەکانیان ، و ، دایان بنێین وەکو ئەرشیف تا لەم ساتەی ئێستامان نەفەوتێن‌و لەبیر نەچنەوە ، چونکە رۆژێك دێ بکرێت بە نۆتە وە لێکۆڵینەوەی لە سەر بکرێت . . هتد .

بەڵام هەندێ مەرج هەیە پێویستە ئەو کەسەی بەکاری کۆکردنەوە هەڵدەستی بیزانێ وا لە خوارەوە باسیان دەکەم بە کورتی :

١ – دروست کردنی جەدوەلێك وەکو خوارەوە . .

(جدول) ێك بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەو کەسەی گۆرانیەکەی لێ وەردەگرین :

| زنجیرە ناو | تەمەن و شوێنی لەدایك بوون | رەگەز | گۆرانیەکە لە کێ فێربووە | هەڵبەستی گۆرانیەکە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |

بەرای من مامۆستایانی لادێ گەر تی‌کەڵاویان هەبێت لەگەڵ خەڵکی دێهاتەکان وە لەگەڵیان بگونجێن‌و شارەزای خووڕەوشتیان (شین ، شایی ، بۆنە ئایینیەکان ، بۆنە نیشتمانیەکان . . . هتد) دەتوانن بە کاسێت ئەم شتانە کۆبکەنەوە دوایی بەناوی خۆیان بیدەن بە تیپە هونەرییەکان جا وەکو ئەرشیف لەو تیپانە دەمینێتەوە وە لەدوا رۆژێکی دوور بێ یا نزیك هونەرمەندانی ئەو تیپانە دەیانخەنە سەر کاغەزو دەکرێن بە نۆتەو شێ‌دەکرێنەوە ئەنجامیش هونەری میللەتەکەمان پێ پتەوو دەوڵەمەند دەبێت وە ئەم شتە رەسەنانە بۆ نەوەکانی دوا رۆژ جێ دێلێن . ئەو مامۆستایەی دەیەوێ ئەم خزمەتە بکات مەرجە لە گوندەکان هەموو کارێکیان لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی شەرمیان لێ‌ی بشکێ ، چونکە گەر لە یەکەم دەقیقەوە مامۆستا بە پانتۆل‌و جاکەتەوە تۆمارکەری کاسێتی دەرهێنا رەنگە لادێی‌یەکە لێ‌ی بترسێ یا شەرم‌بکات گۆرانی بۆ بڵێت . وە ئەو کارانەی مەرجە لەگەڵیان بکات کاری هەرەوەزین وە گۆرانی تایبەتی خۆیان هەیە وەك :

١ – درووێنە – گۆرانی یەك جار زۆری هەیە لە هەر ناوچەیەك بە چەندین ئاوازو هەڵبەست دەگوترێن .

٢ – زەماوەند – هەڵپەرکێ‌و شایی جۆربەجۆر وەك (سێ پێ‌یی ، سوسکەیی ، ئایشۆکێ ، . . هتد) .

٣ – شوان – شمشاڵ دەژەنێ ، ئەم ئاوازەش رەنگە فۆلکلۆرەو دەبێ تۆماربکرێت چونکە شوانی ئەمرۆ لە هی دوێنێ فێربووە .

٤ – شین – لاواندنەوەو شتی تایبەتی خۆی هەیە .

٥ – گۆرانیەکانی کارکردن (دەستار – ساوار کوتانەوە – بێری – سەمەنی دروستکردن – دیوان . . هتد) .

٦ – گۆرانی یارییەکانی منداڵان .

٧ – بەیت – لاوك – حەیران – قەتار – خورشیدی – . . . هتد .)

باشترین شوێن بۆ ئەم کارە دێهاتە تازەکانن (القری العصریة) ، چونکە ئەوانە زۆربەیان لە شوێنی سەخت‌و دوور ئاوەدانیەوە هاتوون وە گۆرانی ئەوان بەراستی فۆلکلۆری‌یە وە رەسەنە بە مەرجێك تا زوو وە بیانگەینێ پێش‌ئەوەی تەلەفزیون‌و کاسێت‌و رادیۆ کاری خۆی بکات .

مەبەستیشمان تەنیا پاراستنی کەلتووری نەتەوایەتیمانە وە پێش‌خستنی رۆژ لەدوا رۆژی هونەری کوردیمانە .

تیپی نەتەوایەتی هەولێر :

# تەقەللای بەردەوام بۆپاشەڕۆژی شانۆی کوردیمان

شێرزاد عبد الرحمن

جموجوڵی هونەری لەم چەند ساڵانەی دواییدا بەتەواوی گەشایەوەو کەوتە قۆناغێکی نوێوە کە پڕبو لە بەرهەمی شانۆیی و لەمەشدا تیپە هونەرییەکان لە کوردستاندا بەشدار بوونو ئەم تیپانە ڕۆژبەڕۆژ هەنگاوی نوێتر دەنێن بۆ پاشەڕۆژی ڕووناکتری هونەری کوردی لە هەولێردا ، جموجووڵی هونەری بەردەوامە ، لەمەشدا چەند تیپێکی تایبەتی چالاکیی خۆیان دەنوێنن ، لەم ساڵانەی دواییشدا تیپێکی نوێ لەلایەن دامەزراوی گشتی سینەماو شانۆ هاتە کایەوەو لەماوەیەکی کەمدا گەلێ بەرهەمی شانۆیی پێشکەش کرد . .

بۆ ئەم مەبەستە چووینە بارەگای تیپەکەو چالاکیی ئەم تیپەمان بەسەر کردەوە . .

● **نۆبەرەی یەکەم .**

سەرۆکی تیپەکە سعدون یونسی هونەرمەند دەربارەی بایەخی دامەزراندنی تیپەکەو نۆبەرەی یەکەمی ووتی :

لە ئەنجامی ئەو بایەخدانەی کە دامەزراوی گشتی سینەماو شانۆ بە پەرەپێدانی بزووتنەوەی شانۆی دەداتو بۆ زیاتر بەرەو پێشەوەبردنی باری هونەری کوردی ، بیر لە دامەزراندنی تیپی نەتەوایەتی هەولێر کرایەوە . . کۆمەڵێ هونەرمەندی لاو کۆبوونەوەو ڕاستەوخۆ شانۆنامەی «هەبوو نەبوو» پێشکەش کرا کە مامۆستا قاسم محمد نووسیبووی‌و صباح عبد الرحمن دەری هێنابوو . . ئیتر دوای ئەوە تیپەکە لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە پێشوازی لێکراو بەردەوام بوو ، بەماوەیەکی کەم لە پێشکەش کردنی «هەبوونەبوو» بڕیاردرا لە میهرەجانی ساڵانەی تیپە نەتەوایەتییەکانی وڵات پێشکەش بکرێو لەم میهرەجانەشدا کە سەراپای تیپەکانی سەربەم دامەزراوە ئامادەی بوون بە تەواوی جێی خۆی کردەوەو پاشان لە تەلەفزیۆن تۆمار کراو سەرنجی خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشا ، بەرهەمێکی وەکو «هەبوونەبوو» لەچاو تیپەکەوە کارێکی قورس‌بوو . بەڵام سەرکەوتنێکی گەورەی تیپەکەبوو .

● **ئەوەبو – صباح عبد الرحمن – دەربارەی تیپەکە و «هەبوونەبوو» ووتی .**

دەست پێشکەرییەکەی دەزگای گشتی سینەماو شانۆ بۆ پێکهێنانی تیپی نواندنی هەولێر ، شانۆی کوردیمان بەرەو ئاسۆیەکی نوێو گەشی فراوان دەباتو دەبێتە هۆیەکی کاریگەر بۆ بووژاندنەوەی فۆلکلۆرو



کەلەپووری نەتەوایەتیان لە چوارچێوەی هەوڵێکی یەکگرتوو بۆ پێشخستنی شانۆی عیراق . .

لە ژێر رووناکی ئەم هەلە پیرۆزەدا . . هەموو نووسەرو رۆشنبیرەکانمان بانگ کراون بۆ بەشداری کردنێکی دڵسۆزانە لە چەسپاندنی ئەم هەنگاوە کە دەبێتە دەنگێکی گەورە بەرەو بەدیهێنانی پێشکەوتن و خۆشەویستی و بنیادنان . بنیادنانی دراماپی ئەم شانۆ نامەیە لەسەر کۆمەڵێ چیرۆکی فۆلکلۆری میللی وەستاوە کە هەر یەکەو پڕە لە پەندی پێشنیان و قسەی نەستەق . . ئەوانەش بوونەتە بیروباوەری شانۆنامەکەو بیرە بنچینەکەی هەموو رووداوەکان لە دەورووبەریاندا دەسوڕێنەوەو ووردە ماناکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە .

● **محمدو سێوێ . .**

تیپی نواندنی هەولێر بەردەوام بوو ، دوای پێشکەش کردنی «هەبوونەبوو» شانۆ نامەی «محمدو سێوێ»ی پێشکێش کرد کە سعدون یونس و زایەر عبد الله نووسیویانەو بە هەنگاوێکی نوێ دائەنرێ بۆ زیاتر گەشەپێکردنی بەهرەی لاوەکانمان کە لەم شانۆگەرییەدا بەتەواوی دەرکەوتن . .

● زایەر عبد الله کە بە جووتە لەگەڵ هونەرمەند سعدون یونس‌دا شانۆنامەکەی نووسیوە دەڵێ : وانەبێ «محمدو سێوێ» تەنیا وەکو رووداوێکی سادەو وەکو عەشقە سادەکە نووسرابێتەوە ، بەڵکو تەقەللای ئەوەمان داوە ئەو دڵدارییە پاکە بکەین بە شتێکی گەورەو پیرۆزترو بەقەدەر تواناش ئەوەمان کرد . . بێگومان کاتێ ئەمەمان کرد لایەنە بنچینەییەکانی کەلەپوورمان لە کیس نەداو لەسەر ئەم بنچینەیە بناغەی شانۆگەرییەکەمان دانا .

● **وەلی دێوانە . . .**

بەڵام کاك هاشم زەینەل کە شانۆگەرییی – وەلی دێوانە –ی دەرهێناوە دەڵێ :

بۆ بایەخدانی فراوانتر بە لایەنی کەلەپووری کوردی شانۆنامەی – وەلی دێوانە – مان هەڵبژاردو کۆمەڵێ رووی نوێی شانۆیی تێدا دەرکەوتن و گەلێ بەهرەی تازەش دۆزرانەوە کە ئومێدی پاشەرۆژێکی رووناکیان لێدەکرێ و ئێستا بەردەوامین لە تۆمار کردنی بۆ تەلەفزیۆن و بە تاقی کردنەوەیەکی نوێی ژیانی هونەری خۆمی ئەزانم .

**ئافرەت لە تیپەکەدا**

لە سەرەتای دامەزراندنی تیپەکەدا تەنیا دوو خوشك هاتنە پێشەوەو قوربانی ئەوەیاندا بێنە سەر شانۆو بۆشایی نەبوونی ئافرەت لەم تیپەدا پڕ بکەنەوە . . بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کورت بەسەردامەزراندنی تیپەکەدا چەندان بەهرەی ئافرەتان هاتنە ریزی تیپەکەوەو ئێستا ژمارەی ئافرەتە هونەرمەندەکان گەیشتۆتە «٧» کچ کە بەردەوامو بێپچڕانەوە لە تیپەکە دامەزراون . .

– **جیهان ئەحمەد** – کە لە هەموو بەرهەمەکانی تیپەکەدا بەشداری کردووە لە وەڵامی پرسیارێك دا دەڵێ :

بۆ خزمەتی باری ئەمڕۆی شانۆی کوردیو ، لە ئەنجامی ئەوەی کە تیپەکە بۆ ئافرەتی هونەرمەند دەیناڵاند هاتە ریزی تیپەکەوەو لە «هەبوونەبوو» دا دەوری کچە میرم وەرگرت پاشان «سێوە»م هەڵبژارد لە شانۆنامەی «محمدو سێوێ» داو ئامادەم تاکو سەر بۆ ئەم تیپەو شانۆی کوردی بتوانم بەردەوام بم .

**بایەخدانێکی گەورە . .**

ئەوەی جێگەی بایەخ پێدانە ، لەوەتەی ئەم تیپە دامەزراوە ، دامەزراوی گشتی سینەماو شانۆ بەردەوام بایەخی بە پەرەپێدانی تیپەکە داوە ، بەجۆرێ ، کە تاکو ئێستا لە شانۆی کوردی‌دا نموونەی ئەو بایەخ پێدانە نەبووە ، تەنیا لە شانۆنامەی «هەبوونەبوو» دا زیاتر لە (١٠) هەزار دینار بۆ سەرکەوتنی لایەنە هونەرییەکانی بەرهەمەکە تەرخان کرابوو هەروەها «محمدو سێوێ» لەگەڵ تۆمار کردنی‌دا بۆ تەلەفزیۆن هەمان پارەی بۆ تەرخان کراو شانۆنامەی «وەلی دێوانە» زیاتر لە (٨) هەزار دینار . . ئەمەو سەرەرای ئەوەی کە چەند هونەرمەندێك بەتەواوی تیایدا دامەزراون و کاری خۆیان بووە بە مەسەلەی شانۆ .

● **بینەران باوەش بۆ تیپەکە دەکەنەوە !**

لە ئەنجامی بەرهەمی زیندووی ئەم تیپەو بایەخدانی بە مەسەلەی کەلەپووری نەتەوایەتیان وەکو رێبازێکی دیاری تیپەکە . . سەرۆکی لێژنەی پروپاگاندە دەڵێ : لە «هەبوونەبوو» زیاتر لە «٦» هەزار بینەرو لە «محمدو سێوێ» «٨» هەزار کەس و لە «وەلی دێوانە» «٦» هەزار بینەر هاتبوونە هۆڵی شانۆ . . ئەم ژمارەیەش کە کرێکارو رۆشنبیرو هەموو لایەنێك دەگرێتەوە ، مانای ئەوە دەگەیەنێ ، کە تیپی نەتەوایەتی توانیویەتی جەماوەری شانۆیی لەم شارەدا زیاتر بکات و رۆژبەرۆژ زیاتر هەستی خۆشەویستی شانۆ لە لایەن کۆمەلانی خەڵك فراوانتر بکات . .

**هەنگاوێکی نوێتر . .**

سەرباری ئەو بایەخدانەی بە تیپەکە دراوە ، دامەزراوی گشتیی سینەماو شانۆ بارەگایەکی تایبەتی بۆ تیپەکە گرتووە . . هەروەها لێژنەیەکی تایبەتی پێك هێنراوە بۆ چاك کردنەوەی هۆڵی شانۆی «ئیبن مستەوفی» بۆ ئەوەی بە راستی ببێتە هۆڵێکی راستەقینەی شانۆ . . سەرۆکی لێژنەکە

کاك سعدون یونس ئەوەی دەربری کە بەماوەیەکی کەم ئەم هۆڵە دەبێتە هۆڵێکی گونجاو بۆ پێشکەش کردنی جووڵانەوەی شانۆیو چارەسەری تەواوی کێشەی نەبوونی هۆڵێکی تایبەتی بۆ بەرهەمەکانمان زامن دەکات .

**هونەرمەندانی تیپەکە**

بۆ ئەوەی تەقەللای برا هونەرمەندەکان لەم تیپەدا فەرامۆش نەکرێو بۆ ئەرشیفی شانۆی کوردی وا هەریەکە بەگوێرەی بەرهەمە هونەرییەکانیان تۆمار دەکەین .

**سعدون یونس** .

١ – هەبوو نەبوو «رەجەب»

٢ – محمدو سێویٚ «نووسەرو دەرهێنەر» «محمد لە تەلەفزیۆن» .

٣ – وەلی دێوانە «وەلی» .

**صباح عبد الرحمن**

١ – هەبوو نەبوو «دەرهێنەر» .

**علی ئەحمەد** .

١ – هەبوو نەبوو «خوێنەر»

٢ – میر وەسمان لە «محمدو سێویٚ»

**فەرهاد شریف** :

١ – محمدو سێویٚ «سەلام بەگ»

٢ – وەلی دێوانە «باوکی شەم»

**خلیل بابە کرم** :

١ – هەبوو نەبوو «میری گەورە»

٢ – محمدو سێویٚ «حسین بەگ» .

٣ – وەلی دێوانە «کەی خەسرەو»

**ئەنوەر شێخانی** :

١ – هەبوو نەبوو «باخچەوان»

٢ – محمدو سێویٚ «مام حەمکۆ» .

٣ – وەلی دێوانە «حیکایەت خوان» .

**زایەر عبد الله** :

١ – محمدو سێویٚ «نووسین – بایز»

٢ – هەبوو نەبوو «ئۆمەر»

٣ – وەلی دێوانە «بەرێوەبەری هونەری»

**سەمیرە سعدون** :

١ – هەبوو نەبوو «دایکی رەجەب»

٢ – محمدو سێویٚ «دایکی سێویٚ»

٣ – وەلی دێوانە «دایکی وەلی»

**جیهان ئەحمەد** :

١ – هەبوو نەبوو «کچی میر»

٢ – محمدو سێویٚ «سێویٚ»

٣ – وەلی دێوانە «شەم»

**محمد احمد** :

١ – هەبوو نەبوو «تەگبەندکەر»

٢ – محمدو سێویٚ «–»

٣ – وەلی دێوانە «بەگ»

**ئەنوەر عزیز** :

١ – هەبوو نەبوو «ماسیگر»

٢ – محمدو سێویٚ «سەرکردە»

٣ – وەلی دێوانە «عزیز»

**جلال ئەحمەد** :

١ – هەبوو نەبوو «عەولا چاوەش»

٢ – محمدو سێویٚ «پاقلە فرۆش – دیکۆر»

٣ – وەلی دێوانە «رووناکی»

**محمد سعید ابراهیم** :

١ – هەبوو نەبوو «کوێلە»

٢ – محمد وسێویٚ «میرزا»

٣ – وەلی دێوانە «عباس»

**سیروان عوسمان** .

١ – هەبوو نەبوو «دەرگەوان»

٢ – محمدو سێویٚ «سوارە» .

ئەمە جگە لە چەندان هونەرمەندی تر کە لە جیٚبەجیٚ کردنی هەندیٚ لایەنی هونەری بەشداربون و هەند کێشیان بە بەرهەمێك یان بەدوو بەرهەم بەشداربوون :

«وەلید معروف جارۆ – حمید یوسف – عبد الخالق مولود – فیصل محمد – ابراهیم حکیم – نەرۆ سلیم – رزگار احمد – رەنجبەر احمد – ولید خالد – فاتح شریف – ئازاد حەمە – برهان احمد جۆلاٚ – شلێر حمد امین – خالدة شەیدا – نعمان مجید – مسعود فاتح – موفق محمد – تحسین علی – ئاواز محمود – ئەحمەد جمیل – سلام کۆیی – یاسین مصطفی – قاسم عزیز – کوردۆ سعید – طه ئاغا جان – دڵدار احمد – مقداد قادر – رەنجبەر خۆشناو – دلشاد احمد – هەڤاڵ خۆشناو –

ئەمەو سەرەرای مۆسیقای هونەری لە لایەن . «وریا ئەحمەد – رزگار خۆشناو – شێرزاد عوزێری» کە بە پەنجە ناسکەکانیان بەشدار بون لە سەرکەوتنی بەرهەمی هونەری ئەم تیپە کە ئومێدمان وایە زیاتر بەردەوام بیٚ لە خزمەتی شانۆی کوردیدا .

# شانۆ . .
# شانۆگەری پشکێنەری گشتی و ساڵی ١٤٦ تەمەن

دەڵێن «فەیسەر» پیاوە ماقوولەکانی دەوڵەت و نوێنەرانی ئوورۆستۆکراتیەکان بە درێژایی ماوەی پێشکەش کردنی شانۆگەریی پشکێنەری گشتی – المفتش العام – هەر پێکەنیوونو بێ دەنگ نەبوون .
– لە هۆڵی شانۆکەش دا ئەو جەماوەرەی ئامادەی بینینی شانۆگەرییەکە بوون ، هەر جارەی کە شەخسیەتی پاڵەوانە ساختەچی و تەڵەکەبازەکەیان باشتر بۆ ئاشکرا بووە گەرمتر لە دڵەوە دایاننە قاقای پێکەنین . .

ئامادەکردنی
عەزیز رەشید حەریری

– بۆ رۆژی دووەم بە گەرمی رەخنەیەکی توند ئاراستەی نووسەری شانۆگەرییەکە دەکرێ‌و بەوە تاوانبار دەکرێ ، گوایە گاڵتەی بە دەزگاکانی دەوڵەت کردووە بە شێوەیەك – وەکو رەخنەگرەکان بۆی دەچن – گوایە ئەو سنوورەی شکاندووە کە دەبێ لە نووسیندا پەیرەو بکرێ ، هەر بۆیەش داوای راگرتنی پێشاندانی شانۆگەرییەکە دەکرێ لە لایەن ئەو کەسانەی دژ بە ناوەرۆکی شانۆگەرییەکە بووبن و مەبەستیان بووە تەنگ‌و چەڵەمەی بخەنە رێگەوە .

ماوەیەکی درێژ پێش ئەو رووداوە ، وا رێك دەکەوێ شەوێك لە شەوانی «پترۆگراد» شۆستەکەی رووباری «نیفا» دوو هاوریێ‌ی خۆشەویست بە یەکەوە کۆ دەکاتەوەو دەیانخاتە گفتوگۆیەکی گەرم بە جۆری کە جوانیی شەوەکەیان لە بیردەچێتەوەو ئەوەندەش گرینگی بە هاتووچوونی خەلکەکە نادەن .

یەکێکیان تەمەنی لە سی ساڵان بە یتر دەبێت و ئەوی تریشیان بە دە حاڵ لەو بچووکتر دەبێ . .

– گەورەکەیان هەڵی دەداتێ‌و دەڵێ :

«وەکو بیستوومە گوایە خەلکی دەڵێن ، جوانترین‌و بە پێزترین رۆمان ئەوەیە کە ژیان بۆ خۆی بینووسێت ، لە کاتێکدا کە جوانترین شانۆگەری‌و پێکەنینیش دەنووسێت ، ئەو سەرکەوتنەی «بلاتۆن





فولكوف»یش وەدەستی هێناوە قەت بەخەیاڵدا نایەت» .

– بچووكترینیان دەپرسێت :

«تۆ بڵێی ئەو قسانە حەقیقەتێك بێت‌و رووی دابێ» .

– گەورەكەیان : وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ :

«بەڵێ ئەم رووداوە حەقیقەتەو رووی داوە ، من خۆم لە ژنەكەی – فولكوف – م گوێ لێ بووە ، كە ئێستاش ماوەو لە لای پیرێژنێك دەژێت» .

(بلاتۆن فولكوف كە دەگاتە شاری – ئوستوشینا – ئەوكاتەش رۆژەكە تا بڵێی خۆش‌دەبێت‌و فولكوفیش ماقوڵی‌و جوانی پێوە دیار دەبێت‌و لە تەك ئەمانیشا نیشانەیەكیش بە یاخەی چاكەتەكەیدا هەڵواسیوە ، لە دواییدا بە ئەسپایی بە گوێی یەكێ لەو پیاوانەی دەورو بەری دا دەچرپێنێ‌و پێی دەڵێ ، گوایە خۆی جەنابی «موفەتیشی عامە» وبە نهێنی هاتۆتە شار) .

– ئیتر هەواڵەكە بە خیرایی بڵاودەبێتەوەو هەندێ پرۆپاگندەشی بۆ دەخاتە سەر تا وای لێ دێ جۆرە شڵەژانێكی سەیر لە شاردا بڵاودەبێتەوە . .

● لە راستیشدا ئەو هێمنی‌یەی كە فەرمانبەرەكانی شار لێی راهاتبوون لە پڕ دەگۆڕێ‌و نامینێ ، چونكە هەر كەسێ جۆرە گوناهێكی دەبێت ، هەر یەكێكیشیان بە چاكی لە زمانی ئەوی تریان دەگات و حاڵی دەبێت‌و بەلكو زمانەكەیشیان دوو لایەنی دەبێت یاخو بڵێین دووباری دەبێت ، یەكێكیان ملكەچ كردنە بۆ دەسەڵات‌دارە گەورەكان ، ئەمەیان لە لایەك ، لە لایەكی تریشەوە هەڵس‌و كەوتی بیرۆكراتیانەو خۆ بە زل‌زانین هەتا خۆ فەرزكردنیش بەسەر كەسانی ترەوە كە حوكمیان بە سەردا دەشكێ واتە رەش‌و رووتەكانی میللەت .

جا بەم شێوازە فەرمانبەرەكانی لە دەورو بەری میوانە نهێنی‌یەكە كۆ دەبنەوە كە گوایە «موفەتیشی عام»ەو چاوەدێرییەكی چاكی دەكەن‌و زۆریش گرنیگی پێ‌دەدەن بۆ ئەوەی بە ئیسراحەت ئەو رۆژانە بەسەر بەرێت كە لەوێ دەمێنێتەوەو هەموو داواكاریەكانیشی بۆ جێ‌بەجێ دەكەن .

● هەروەها برادەرە بە تەمەن گەورەكە زیاتر قسە دەكاو دەڵێت :

«زۆری پێ ناچێ كە سەرۆكی پۆلیس راپۆرتێكی وردی لە بارەی جموجۆڵ‌و رابردووی «فولكوف» ی ساختەچی دەست دەكەوێ ئیتر میری گورج بریاری ئەوە دەدات كە بچن «فولكوع» بگرن‌و لە دوایشدا مەسەلەكە دابخەن چونكە ئەو كارەساتەی «فولكوف» كردوویەتی دەبێتە هۆی ئابرو چوون بۆ دەزگاكانی قەیسەر» .

● ئیتر برادەرە بچوكەكە لە قاقای پێكەنین دەداو چەند جارێك ئەوە دووبارە دەكاتەوو دەڵێ :-

بەڵێ بەراستی ئەمەیان بابەتێكی یەجگار جوانە ، بابەتێكی یەجگار جوانە» .

جا هەر لەو شەوەو لە شاری پترۆگراد نیکۆلای فاسیلیفش گۆگۆل – کە برادەرە بە تەمەن بچووکەکە دەبێت – بیری نووسینەوەی شانۆگەری «موفەتیشی گشتی – لە مێشکدا دەخەملێ .

وەبرادەرە بە تەمەن گەورەکەیش کە رووداوەکە بۆ گۆگۆل باس دەکات – الکسندر – سیرکیفیچ پوشکین – دەبێت .

– ئیتر هەر دوای ئەوەی کە گۆگۆل شانۆگەرییەکە ئامادە دەکات و دەی نووسێتەوە پاش چەندساڵێك واریك دەکەوێ لە ساڵی ١٨٣٦ دا کە ئەوسا تەمەنی «٢٥» ساڵان دەبێت ئامادەی کردنەوەی شانۆگەری «المفتش العام» دەبێت .

جا ئەم ساڵیش ، کە دوای چەند مانگێکی تر «١٤٦» ساڵ رەت دەبێت بەسەر یەکەم پیشاندانی ئەو شانۆگەرییە کە لە شاری «پترۆگراد» بۆ یەکەم جار پیشاندراوەو لە زوربەی شانۆکانی جیهانیش خۆی نواندووەو جەماوەری هاوچەرخی شانۆش بە گەرمیەوە چەپڵەیان بۆ لێداوەو لەگەلیا دایانەتە قاقای پێکەنین .

● وە وەکو ئاشکرابشە شانۆگەرییەکە لە بەرتیل و ریشوەت کاری و تێك شلەژانی باری کۆمەڵ و هەموو ئەو جۆرە رەوشتانەی کە لە نرخی مرۆڤایەتی کەم دەکەنەوە دەکۆڵێتەوە ، ئەم بۆچوونەش ئەوسازۆر لەگەل باری پایتەختی وولاتی قەیسەر کە ئەوسا پترۆگراد – بوو دەگونجا هەروەها بۆ ئەو شارانەیش کە کۆمەڵی چینایەتیان تیادا هەبووە جا لە هەر کوێ هەبن .

بەم شێوەیە گۆگۆل لە نێو ئەو دەنگدانەوە مەزنەدا دەژێت کە شانۆگەرییەکە بەرپای دەکات و بەختەوەریش باڵێ خۆی بە سەردا دەکێشێ ئەمەیان لە لایەك .

وە لە لایەکی تریشەوە مەترسی ئەوەی دەبێت کە دەوڵەت تۆڵەی لێ بکاتەوە ، بۆیە بریاری ئەوە دەدات کە لە ئاهەنگە گشتیەکاندا دەرنەکەوێ ، وەدوای ئەوەی شالاوی رەخنە لە دژیا توندتر دەبێت ، ئیتر ماڵ ئاوایی لە ماڵەکەی خۆی دەکات و بریاری ئەوە دەدات روسیای قەیسەری بە جێ بهێڵێت و روو لە ئەوروپا دەکات . .

– لە سویسراو ئەلەمانیاو ئیتالیاو فەرەنساش بەردەوام دەگەرێ بۆ ئەوەی بەلکو هێمنی یەکی نەفسی بۆ خۆی بڕەخسێنێ تاوەکو دەست بداتەوە نووسین .

ساڵی «١٨٣٧» یش کە لە پاریس دەبێت هەر کە هەواڵی مردنی «پوشکین» دەبیستێ بە کوڵ دەکەوێتە گریان چونکە «پۆشکین» ی بەیەکی لە باشترین و دڵسۆزترین برادەری خۆی دادەنا ، تاوەکو بە یەکی لە ناسیاوەکانی دەڵێت :

«الکسندر سرکیفیچ پۆشکین» باشترین خوێنەرو رەخنەگری نووسینەکانی من بوو ، بە بیرما نایەت جارێکیان شتێکم نووسیبێت وەیان بلاوم کردبێتەوە گەر رەزامەندی ئەویانی لەسەر نەبوو بێت . هەر لە رێگەی ئەویشەوە بوو بیرم لە نووسینەوەی شانۆگەری «موفەتیشی عام» کردەوە ، ئەمە جگە لەوەی کە رێگەی نووسینی رۆمانی «گیانە مردووەکان» ی بۆ دیاری کردم .

کە ئەم رۆمانەیشی رەخنەیەکی توندو بە زەبر ئاراستەی رژێم و کۆمەلگای قەیسەری دەکات ، ئەو رژێم و کۆمەلگایەی کە دووربوون لە دادپەروەری و سەربەستی . .

● جا بەهەر حالێك بێت گۆگۆل شانۆگەریتریش دەنووسێت ، هەروەها رۆمانی «تاراس بولبا» وچەند کورتە چیرۆکێکیش . . بەلام ئەوەی راستی بێت بەشی یەکەمی رۆمانی «گیانە مردووەکان» بە پەلە دەنووسێت و تەواوی دەکات لەو کاتەدا لە بارێکی بەجگەر نالەباردا دەژێت و گەلێ کێشەی نەفسی و هەست بە تەنهایی کردن کاری تێ دەکەل و ئازاری دەدەنە ، وەکە بەشی دووەمیشی تەواو دەکات ئیتر بە یەکجاری باری تەندروستیشی بەرەو خراپتر دەروات و زیاتر نەخۆشی تەنگی پێ هەلدەچنی و زیاتر ئازارەکانی بە ناخدا پەل دەهاوێژن هەر لە ئەنجامی ئەو بارە نالەبارەی ژیانیش هەلدەستێ ئەم بەشەیانی دەسووتێنێ . .

● جاکە لە ساڵی ١٨٤٨ دا دەگەرێتەوە بۆ رووحیهی قەیسەری لە لای یەکێ لە باشترین و دلسۆزترین هاورێکانی خۆی بەنهێنی دەژێت و ئەوەش رەفز دەکات کە ئیتر یووبارە رووبکاتەوە دەرەوەی وولات و بە یەکجاریش هاموو خۆی شوێڵە گشتی یەکهن ناکات ، ئیتر تێکرای ماڵ و سامانی خۆی بەسەر هەژارو لێ غەوماواندا دابەش دەکات و ، بەم جۆرە ژیان بەسەر دەبات تاوەکو لە رۆژی ٤ ی مانگی ئاداری ساڵی ١٨٥٢ گۆگۆل بۆ دواجار ماڵ ئاوایی لە دۆستە دڵسۆزو شەیداکانی بەرهەم و شاکارە رەنگینەکانی دەکات و پێلووی چاوەکانی بیلێك دەنێت و دەمرێت . کە ئەو ساڵە تەمەنی «٤٣» ساڵی دا بوو .

● بێ گومان «گۆگۆل» ی نووسەر تا بڵێی مرۆڤێکی لێهاتوو و بەتوانا بوو هەر ئەو بەتواناییەیشی وای لێکرد لە زوربەی رولاتانی جیهاندا ناوبانگی بلاوبێتەوەو بناسرێ ئەگەر چی لە تەمەنێکی بچووکیشدە سەری خۆی هەلدەگرێ و ماڵ ئاوایی لە جیهانی ئەدەب و نووسین دەکهت . . وەلە بارەی مردنەکەیەوە نووسەری سۆڤیەتی «تورگینێف» دەڵێ :

«گۆگۆل لە رۆژگارێکدا مرد کە تازە بە تەواوی خەریك بوو پێ دەگەیی و ژیانی لە بەردەم دەکرایەوە ، ئەویش هەر وەکو پۆشکین وا بوو ، بۆی نەکرا شاکارەکانی خۆی تەواو بکات . .

# تیپی مۆسیقا
# خونچەیەکی گە
# کورد



لەم رۆژانەدا سەدای مۆسیقا هەموو لایەکی گرتۆتەوەو خۆشەویستی خۆی پەخش دەکات‌و خۆی ئاشنای دڵی شیرینی هەموو لایەك دەکات . . کۆمەڵێك کیژۆڵەی کورد لە سووچێکا خەریکی فێربوونی مۆسیقان هەر یەکەو خواست‌و ئارەزووی رژاندۆتە سەر ژێ‌ی ئالەتەکانیان وەکو کۆرپەیەکی نازدار لە باوەشیان گرتوون لەگەڵ ئەو ئاوازانە دەژین کە لەدایك دەبن . .

ئەو تیپە ئێسك سووکەی کە باسی لێوە دەکەین ناوی پیرۆزی تیپی «شیرین»ەو یەکێتی ئافرەتانی کوردستان لە پارێزگای هەولێر رێکی‌خستوون‌و چاودێری و توانای دارایی بۆ دابین کردوون‌و لەسەر دەستی هونەرمەندی لێ‌هاتووی کورد مامۆستا «ووریا ئەحمەد» راهاتوون‌و لە ماوەیەکی کەمدا لە میهرەجانێکی فراواندا کە بۆ گۆرانی سیاسی سازکرا لە بەغدا توانیان سەرکەوتنێکی مەزن وەدەست بهێنن . .

**• ئەم تیپە چۆن دامەزرا . .**

بۆ بنج‌وبناوانی مێژووی کۆکردنەوەی ئەم کۆمەڵە کیژۆڵەیەو لەدایك‌بوونی تیپە جوانکیلەکەی «شیرین» گەلێك پرسیارمان کرد . . لە ناکاو خوشکە خولە بکر صالح لێپرسراوی رۆشنبیری‌و راگەیاندن لە یەکێتی ناوبراو بەگوێ‌ی‌دا چرپاندین‌و ووتی : – ئەوەی راستی بێ وەك ئێمە بیرمان لێ کردەوەو دەبینین کچانی ئەمرۆ ئارەزووی ئەوەیان هەیە کە بەشداری یەکی کاریگەرانە بکەن لە بواری بوژانەوەی شارستانیەت‌و بەرەو پێشەوە چوونی وە بە تایبەتی کچانی کورد بەو پێ‌یەی کە لەنێو سروشتێکی خۆرسك‌و گونجاودا دەژین ، ژیانیان بە چریکەی بلبلان بەستراوەو شاخ‌و زەندۆڵی کوردستان خۆی لەخۆیەوە جیهانێکەو هەموو رۆژێك سەدەها پارچە ئاوازی تیا لەدایك دەبێ . . بۆیە مۆسیقاش بۆتە بەشێك لەم ئارەزووەی کە ئێمە دەیڵێین ، وە کە ئێمە بیرمان لە دامەزراندنی تیپی «شیرین» کردەوە بەو نیازە بوو کە یەکەم جارە لە شارێکی وەك هەولێر تیپێکی ئاوا دابمەزرێت‌و مێژوو بۆ خۆی تۆماری بکات ، توانیمان لە ماوەیەکی کورت‌دا ئەم تیپە دابمەزرێنین تا دەوری سەرەکی خۆی ببینێ وەك ئەمرۆ دەیان‌بینن ، وە دامەزراندنی ئەم تیپەش شتێکی زۆر ئاسایی‌یە لە لایەن یەکێتی‌یەکەمانەوە ، چونکە دەمانەوێ کچانی کورد

# ...يرين و
# له موٚسيقاى
# ..

ئاماده كردنى
ناظم دلبه‌ند



بەشداری بکەن لە گۆرانکاری‌ی ژیان . . . بۆ وولاتەکەمان لەکاتی سورانەوەماندا چاومان بە کیژۆلەیەکی ئیسك‌سووك کەوت گیتارێکی بەدەستەوە بوو . . دیار بوو لە جیهانێکی ترا دەژیا کە جیهانی مۆسیقا بوو . .

– تو دەڵی‌ی چی . .

– حەزدەکەم ناوی خۆمت پێ بڵێم بەر لەوەی باسی خۆشەویستی‌ی مۆسیقات بۆ بکەم . .

– فەرموو . . ببوورە . .

– من ناوم (سەراب عصام)ە . .

خۆشەویستی مۆسیقا بە لامەوە شیرینترنییە لە خۆشەویستی دایکم ، بەلام شوێنەوارێکی گەورەی بە خۆیەوە گرتووە لە دلیٚ مندا . . بۆ من نەتوانم سۆزی دەروونم بە پەنجەکانی خۆما دەربېرم . . ئەمرۆ دوای ماوەیەکی کەم دەتوانم لەسەر وەتەرەکانی ئەم گیتارە جوانترین هەستت بۆ دەربېرم . . . کەواتە شتێکی زۆر ئاسایی‌و زۆر پیرۆزە کە کچانی ئێمەش شان‌بەشانی براکانمان لە بواری هونەری کاربکەن‌و مێژووی نەتەوایەتیان بەرەوپێشەوە بەرن . .

– چیمەن عبد الرحمن ئەو کچە مۆسیقا ژەنە کوردەیە کە ساڵی ۱۹۷۷ وە هاتۆتە کۆڕی مۆسیقاوە . . وە تا ئێستا گەلێك مێدالیاو سەرکەوتنی لە میهـــرەجـــانـــەکـــانی وولات وەدەست‌هێناوە ، بەو پێ‌یەی کە کەمانچە ژەنێکی ئێجگار بەتوانایە . . چیمەن ووتی : –

– من کە کەمانچەکە دەگرمە دەست بیر لەوە دەکەمەوە مێژووی نەتەوەکەم بە مۆسیقا بنووسمەوە ، گرنگ ئەوەیە کە من ئەمرۆ دەبینن‌و سبەی دەمبینن هەمووی بکەن بە چەپکە گوڵێك بۆ مامۆستام . . بۆ کاکم . . هونەرمەند «ووریا ئەحمەد» چونکە منالٚ بووم هێنامی‌و بۆ یەکەم جار فێرە مۆسیقای کردم لەگەڵ کۆمەڵێك منالی وەك خۆم ، ئەمرۆش دەلێم توخوا باکچان بۆ خۆیان ئاوازی «کیژان دەچنە مێرگولان» و زۆرانی بە پەنجە ناسکەکانیان لیٚ بدەن . . تیپی «شیرین»یش ئاوردانەوەیەکی ترە بۆ کچانی کورد لەرووی فێربوونی مۆسیقا . . دواجار توخوا هونەرمەند با لەبیر نەکرێت چونکە مرۆڤێکی پیرۆزە . .

ئینجا ناسکە عز الدین کە ئالەتی «فلوت»ی دەژەنی ووتی : – کە فلوت دەژەنم سەدای شمشاڵی ئەو شوانە شەیدایەم دێتەوە بیر کە لە بنار شاخیٚ کارو بەرخۆڵەکانی پیٚ کۆدەکاتەوە ، مۆسیقا لەلای منی کچ بۆتە شتێکی مەزن کەس‌و کارم یارمەتیم دەدەن لەم رووەوە . . وە بەلای منیشەوە مۆسیقا دەربڕینێکی پیرۆزە . . وە پێویستە لەسەرمان هەوڵی ئەوە بدەین کە کەلوپوری نەتەوایەتیان پەرە پیٚ بدەین و بەرەو پێشەوەی بەرین . .

– سوپاسی هەموو لایەکتان دەکەین ، سەرکەوتنتان ئاواتمانە .

# شانويا رومانتيكى

## * وصفى ردێنى *

بێ گومان خاندگەها رومنانتيكى ئێكە ژ خاندگەها ئەدەبى و هونەرى و ڤێ خاندگەهێ داخازا ئازادێ كر بو ئەدب و هونەراو ئەگەر ئازادى هەبيت دێ پتر ئاشويا مروڤى بەرفرەهـ بيت و دێ پتر ئيلهام بو تورەڤانى و هونەرمەندى هێت و ئەدەب و هونەرى رومانتيكى پەيوەنديەكا بەردەوام يا دگەل كومەلێ هەى . . . ئاخفتنا مە د ڤێ نڤيسينێ دا ل سەر شانويا رومانتيكى يە . . .

شانو قافكا ئێكێ بو هەڤركى ل سەر دهاتە كرنێ دناڤبەرا قوتابخانا كلاسيكى و رومانتيكى ل دويماهيا چەرخێ هەژدێ و ئەڤێ هەڤركێ زور كێشا نەمازە ل فەرەنساو ئيطاليا چنكو ئەڤەبون وەلاتێت كلاسيكى ئەڤچا بەرە بەرە شانويا رومانتيكى جهێ خو دناڤ ئەدەبێ ئيتالى كرو ل ئەلمانياو ل ئەلمانياو ئيسپانيا شانويا كلاسيكى زو مرو نەما .

جاخێ شورشا شانويا رومانتيكى ل سەر شانويا كلاسيكى دەست پێ كرى ئەوى وەختى داخازيت وى دوو تشت بوون .

ئێك كارئينانا دراما برجوازيا پەخشانى ئەوا كو بابەتيت خو ژ ناڤ كومەلێ خو وەردگريت و ئەڤ دراما ل سەر دەستێ ديدرو بێ فەرەنسى هاتە دانان .

دوو ميلودراما ئەوى پێك هاتيە ژ شانويەكا ميللى شين و شادى هەر دوو بێ د ناڤدا هەى و ئوسلوبێ ئاخفتنا ميللى يا هەى .

بابەتێت دراما رومانتيكى جياوازيا هەى دگەل بابەتێت نەخوشيێ دناڤ شانويا كلاسيكى چنكو جەماوەرو حەزكەريت شانويا رومانتيكى بێزار بوون ژ بابەتێت مێژوى يێت كەڤن و ژ بابەتێت ئەدەبى يێت كەڤن و داخازا دكر كو بابەتێت ژيانا روژانە بينە شانو ئەڤچا ل دويڤ بانك و داخازيا ڤانا گەلەك فەرەنسيا گوهدارى كرو هندەك شانو هاتنە پێشكێشكرن وەك (لوى‌بلاس) و «هرنانى» ژ ئسپانياو شانويا كرمول ژ ئنگلتەراو شانو براجراف ژ ئەلمانياو ئەڤ شانويە هەمى ژ نڤيسنا فكتور هوگرى بوون .

پشتى ڤێ قوناغێ ژ ژيانا شانويا رومانتيكى ئەڤچا هندەك رومانتيكێ دى داخاز كر كو بابەتێت شانويا رومانتيكى بينە وەرگرن ژ مێژويا وەلاتى و ل دويڤ ڤێ داخازى (جاخ و شوين) ئەو ژى دوو مەرجێت شانويا كلاسيكى بون دڤێت نەمين چنكو رزگاربون ژ جاخ و شوينا دى شانو بيتە وێنەكێ دروست بى ژيانا روژانە چنكو شانويا كلاسيكى هەر مەنەلوج بوو كەسێت شانويا كلاسيكى ل سەر دەپێ شانوى نە دمرين و بينەرا مرنا وان نەديت بەس گولێ دبو . . . بەلێ كەسێت شانويا رومانتيكى ل سەر دەپێ شانوى دهاتنە مرن و بينەرا مرنا وان د ديت هەلبەت رومانتيكيا گەلەك بايەخ ددا رەوشت و سروشتى بازێرى كو بابەتێ شانويا رومانتيكى لێ هاتيە وەرگرتن هەر وەسا رومانتيكيا چ توخيب نە هيلانە ناڤبەرا شانوا شين و شادى و ئەڤ هەردوو بابەتە د ئێك شانو دا تێكەل دبن ، بێ گومان ئەڤە ژى كار تێ كرنا (شكسپيرى) يە ل سەر وان و مەبەستا وان بڤێ رەنگێ شانو ئەوژ بو دڤێت شانويا وان پەيوەنديەكا موكوم دگەل ژيانێ هەبيت چنكو ژيان يا پرە ژ گرێت و جواناو خوشيێ و نەخوشيێ و گەنيێ و گرينێ و ئەگەر ئەڤ بابەتە (نەخوش و خوش) هاتە ژێك جوداكرن د شانويێ دا دێ راستى بەرزەبيت و هەر وەسا مروڤ بخو هەر هەمى گاڤا بيينيت نەخوشە يان هەمى گاڤا گرى بنيت نەخوشەو دى ژێ وەستێت بەلى مروڤ هەردووكا بنيت خوشترەو بتامترە .

د شانويا رومانتيكى دا كەسێت شانويێ يێت سەرەكى ژگورێت ميللەتى بون و كەسێت دى يێت نە سەرەكى مير بو يان ئاغا بو يان مەلك وهەمى دەما دەورەكێ چقيل و نەشرين د ديت د شانوى داو مەبەستا وان ئەو بو شانو ببيتە نامەكا بيرو هزرێت كومەلايەتى بو كوريت وەلاتى و ژبەر ڤێ چەندى گەلەك هيرش د كرنە ل سەر هندەك رەوشتێت كريت د كومەلێ دا .

ژمارەكا زور ژ رومانتيكيا حەزدكەن كو دراما ب شيوەكى پەخشانى بيت نە شيوەكێ هوزانى چنكو پەخشان نێزيكترە بو سروشتى و پتر دەراڤ (مجال) يا هەى ژبو دانانا كەساو ئەكتەرا ل دويڤ جارچويێ شانوى و دڤێت بزانين كو شانويا كلاسيكى هەمى يا هوزانى بو ئەڤە ژلايەكى و ژلايەكێ دێ ڤە شانويا رومانتيكى ناهيتە نڤيسين بو پێشكێشكرنێ بتنێ هەلبەت د هيتە نڤيسينى بو خويندنى ژى چنكو گەلەك دەوروكەس بێ تێدا هەى دەراڤ نينە هەمى بێنە دياركرن ل سەر دەپێ شانوى بەلكو ب خاندنێ دێ مروڤ پتر تێ گەهێت .

# – خومەینی و «پێشەسازی ی مردن»

—

[redacted]

**ووتارەکەی ئەم دووایەی خومەینی سەرنج رادەکێشیّو پرسیارێکی گرینگیش دەخاتە بەردەم .**

**ئایا خومەینی لەگەڵ هێزی بەرهەڵستکارە یان بەرپرسیاری یەکەمی رژێمە لە ئێران ؟ ؟ !**

ئەگەر خومەینی لە هێزی بەرهەڵستکارانەو بەو زوڵمو زۆرداری یەو ئاژاوەنانەوەو گرتنو کوشتنو وێرانکردنو لێدانی سەربەستیو دان نەنان بە ساکارترین مافی رەوای نەتەوەو کەمایەتیەکانی ئێران ، رازی یە ، ئەوە باشتر وایە عەبایەکەی خۆی دامالێو بە شێوەیێکی رەسمی دەست لە حوکمگێران بەر بداتو ، لە تاوانی پاسەوانانو کاروکردەوەی قازی یەکانیو خراپەکاریی حکومەتەکەی بەریی بێتو ووشەی هەق بڵێتو بەرپرسیاری یەکەمی رژێم دیاربکاتو . . بۆ خۆیشی شوێنێکی تر دوور لە کورسی حوکم هەڵبژێرێت .

وە ئەگەر بەرپرسیاری یەکەمی رژێمو رابەری دەسەلات بێ ، ئەوە ئەبێ خۆی لێپرسینەوەی لەسێدارەدانی هەرەمەکیو گرتنی خەڵکی بێ تاوان و وێرانکردنی شارو دێهاتو دەربەدەرکردنی هاولاتیانو شپرزەییو ئاژاوەنانەوەو ستەمکاریو . . تاد ، بگرێتە ئەستۆوە .

بۆ وەلامی ئەم پرسیارەشمان دەڵێین :

خومەینی بەرپرسیاری یەکەمی رژێمە . . بەرپرسیارێکی بێ مەرجو بێ سنوور .

لە ئێرانا ، شەریعەتی ئاسمانی ، بە قسەو بە کردەوە ، داخراوە .

شەریعەتی : زەوی – ئەو دەستوورو یاسایانەی کە خومەینی دایناون تەنیا هەر ئەو بەکارەو لەسەری دەرۆن . . بێ گومان بە گوێرەی ویستو بە پێی بارودۆخ ، جێبەجێ دەکرێتو دەسەپێنرێت دەزگاکانی دەوڵەت داخراون . . داخراون چونکی بە بوونی کۆمەڵێك بەرهەڵستکاران تیایانداو ، مانەوەی چەند کەسانێکی سەردەمی شاو ، بە بەکرێگیراویی دانراونو تاوانبارکراون .

کە واتە لە ئێرانا : نە شەریعەتێکی ئاسمانیو نە شەریعەتێکی زەویو ، نە حکومەتو نەیش دەزگا هەیە . . ئەوەی هەبێ تەنیا هەر خومەینییەکە خۆیەتی کە خۆیشی بە «نوێنەری یەزدان» داناوە ! ! .

بەڵێ . . ئەمەیە دکتاتۆریەت لە روو و بارو شێوە هەرە قووڵو گەورەکانیدا .

ئەگەر خومەینی خۆی بە «تەواوکەری پەیام» – هەروەك خۆی دەڵێ – دەزانێو ، خۆی دەستوورو یاسا دانەرو حوکم گێر دادەنێو . نە ئەبێ قسەی بشکێو نەیش فەرمانی بشکێنرێ ، چۆن بۆی هەیە خۆی گێل بکات لەوەی کە روویداوەو روودەدات لە ئێرانا ؟ ؟ !

ئەمە یاری یە . . . یارێکی نوێیاوە .

خومەینی . ئەیەوێ خۆی لەوەی کە لیّی بەرپرسیارە بباتە .ەرەوە . . لەبەر ئەمەوە ، هەندێ جار لۆمە دەخاتە ئەستۆی ئەمو ەوو ، هەندێ جاریش دەخاتە ئەستۆی سوپاو . . دووا جاریش .ەستەی پیاوانی ئایین ! !

تەنیا پرسیارێکی ساکار دەخەینە روو ، دەڵێین :

ئەگەر خومەینی خۆی بە راستگۆ دادەنێت لەوەی کە دەیڵێت . ەی بۆچی چارەی خراپەو ستەمکاری ناکات ؟ بۆچی ئاگرەکەی خۆشترو راپێشتر دەکات ؟ بۆچی سزای ئەو قازی یانە نادات کە پێیان دەڵێت : بێ تاوانان سزا دەدەنو لە تاوانکارانیش دەبوورن .

خومەینی ، بەشێکی زۆری ووتارەکەی ئەم دووایەی بۆ «پاككردنەوەو رێپیشاندانی» قازی یەکان تەرخان کردبوو . . لە کاتێکا ، چونکی ژمارەیان کەمە ، داوا لە خەڵکی دەکات – قوتابی بێ یان فەرمانبەر یان کرێکار یان . . تاد - کە «تطوع» بکەنو بێنە (ریزی قازی) بۆ ئەوەی ژمارەی قازی یەکان لە ئێرانا زۆر بێت . . وەلە هەمان کاتیشدا ، لۆمە لەو قازی یانە دەکات کە خۆیان لەم پیشەیە دەشارنەوەو بە کارو کردەوەی چاك «ئەو ویستەنی» هەڵناسن !

بەڵێ . . . خومەینی ، نایەوێ بایەخ بە بازرگانیو باری شلەژاوی پیشەسازیو بەروبوومی کشتوکاڵو بارودۆخی تێکچوویی خوێندن بدات ، دەیەوێ پەرە بە بەندیخانە بدات . . بایەخ بە گیراوانو دادگاو قازی یەکان بدات . . چونکی ئەم پیشەیە قاڵی کردووە . . پیشەی «پیشەسازی مردن» .

**شەریف**

Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly
Magazine
Issued by: Kurdish Culture
and Publication House
Ministry of Culture and
Information
Baghdad - Iraq

رۆشنبیري نوێ
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية ساحة الخلاني بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

نرخي ١٥٠ فلسه

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

مسجلة بدائرة البريد برقم ١١٩

مطبعة الاديب البغدادية هاتف 8881232